**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

● **دۆزی کورد لە عێراقدا و میکانیزمەکانی چارەسەرکردنی – دوای ٢٠٠٣**

● **نووسینی:** نەوزاد عەبدوڵا هێتوتی
● **بابەت:** سیاسەت
● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕەواندزی
● **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
● **چاپ:** یەکەم ٢٠٠٩
● **ژمارەی سپاردن:** ٩١٣
● **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
● **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
● **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب (٤٠٥)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



## ناوەرۆک

## پێشەکی:

دۆزی کورد وەك دۆزی نەتەوەیەکی پارچە پارچە کراو، خاوەن سروشتێکی ئالۆز و پڕ گرییەتی. بەو پێیەی هۆکار و فاکتەرگەلێکی ناوخۆیی، هەرێمی و نێودەوڵەتی، بەشداربوونە و دەوریان بینیوە لە دروستکردنی کێشەکە، لە بەردەوامی قەیرانەکە و چارەسەر نەبوونیشی دا ڕۆڵێکی مەزنیان گێڕاوە.

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم سالی ١٩١٨، دەوڵەتە زلهێزەکان بەتایبەت بەریتانیا و فەرەنسا بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، نەخشەیەکی نوێی یان بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دارشت. و کۆمەڵێك دەوڵەتی تازە یان دروست کرد. بەلام سەبارەت بە کورد و نیشتیمانەکەی، گوێرەی بەرژەوەندییەکانیان لە دوو پارچەوە کردوویانەتە چوار پارچە و لکێنرا بە دەوڵەتانی دەوربەرەوە. لەم چوارچێوەیەدا بەشێکی کوردستان ( کوردستانی عێراق) و خەڵکەکەی دوور لە حەز و ویست و خواستەکانی، خرایە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی تازە دروست کراوی عێراق و بە زۆر پێناسەی عێراقی بوونی بە سەریدا سەپێنرا.

هەر بۆیە کێشەی کورد لە عێراقدا، کێشەی نەتەوەیەکی پارچە پارچە کراوە؛ کە لە ناوەڕۆکدا کێشەی خاك و زمان و کلتوور و مێژوو و شوناسی نەتەوەییە؛ بەو مانایەی لەو کاتەی کوردستان بە شێوەیەکی زۆرەملێ لکێنرا بە عێراقەوە، لە هەموو مافێکی نەتەوەیی بێبەش کرا؛ حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقیش( بە هەر دوو سیستەمی پادشایەتی و کۆماریییەوە) ئامادە نەبوونە بە پێی بنەما و پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆ نووسین، چارەسەرێکی دیموکراسی و ئاشتییانە بۆ ئەم پرسی بدوزنەوە، بەلکو بە ئاراستەیەکی تەواو پێچەوانەوە هەوڵیان داوە لە ڕێی بەکارهێنانی هێزی سەربازی و زەبر و زەنگ و قڕکردن و لە ناوبردن و بە عەرەب کردنی خاکی کوردستان؛ دۆزی کورد لە هەموو مۆرکێکی نەتەوەییەوە بسڕنەوە. و کورد بیکەنە کەمینەیەکی بێ خاك و ماف و مێژوو و نیشتیمان لە عێراقدا. ئەم سیاسەتەش لە سەردەمی ڕژێمی بەعس گەیشتە لووتکەی خۆی و تاوانەکانی کە بەرامبەر بە گەلی کورد ئەنجام دران هەموو سنوورێکی بەزاند.

هەڵبەتە فاکتەری هەرێمی و نێودەوڵەتی لە بەرێوەبردنی ئەم سیاسەتەی حکومەتەکانی عێراق لە هەمبەر مەسەلەی کورد، یارمەتیدەر و پاڵپشتیکەربوونە پیلان و ڕێکەوتن نامەی هاوبەشیان هەبووە بۆ دژایەتی کردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد.



لە بەرامبەردا بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە خەبات و تێکۆشانی خۆی دا بەردەوام بووە، هەولی داوە سوود لە گۆڕانکاری و پێشهاتە سیاسییەکانی ناوخۆیی و ناوچەکە وەربگرێ. لە پەراوێزی قەیرانی داگیرکردنی کوێت لە سالی ١٩٩٠ لە لایەن عێراقەوە، بە هۆی ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی کە سەریان هەلدا ؛ کورد توانی وەك فاکتەرێکی سیاسی بێتە سەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق. و سوود لە پەرەسەندن و پێشڤەچوونە سیاسییەکان وەربگرێ. بە دامەزراندنی نەوا و ناوچەی ئارام لە (نیسانی ١٩٩١) دا و دواتریش بەڕێوە چوونی پرۆسەی هەڵبژاردن لە ١٩٩٢ لە کوردستان و دایکبوونی پەرلەمان و حکومەتی کوردستان؛ دۆزی کورد پێی نایە قۆناغێکی نوێیەوە و، پێشڤەچوونێکی باشی بە خۆیەوە بینی. سەرەڕای نەخشە و پیلانی جۆراوجۆر لە لایەن دەولەتانی هەرێمییەوە، بە هاوکاری لەگەڵ ڕژێمی بەعس بۆ تێکدان و لە ناوبردنی ئەو قەوارە سیاسییەی کە بە هۆی ڕاپەڕینی سالی ١٩٩١ وە سەری هەڵدا بوو؛ بەڵام نەیان توانی بەو شێوەیەی کە دەیانویست و پیلانیان بۆ داڕشتبوو ئامانجەکانیان بپێکن. و کۆتایی بە ئەزموونی هەرێمی کوردستان بهێنن.

کاتێکیش لە دوای کردەوەی تیرۆرستی ١١ ی ئەیلولی ٢٠٠١، تەنگژەی نێوان ئەمەریکا و عێراق زیادی کرد؛ و هێما و ئاماژەکانی گۆڕانکاری چاوەڕوانکراو لە عێراق بەدەرکەوتن و چوارچێوەیەدا لە (٩)ی نیسانی٢٠٠٣ دا کۆتایی بە دەسەلاتی ڕژێمی دیکتاتۆر و خۆسەپێنەری بەعس هات. دۆزی کورد گۆڕانکاری و پێشڤەچوونێکی سیاسی گرنگی بە خۆیەوە بینی کە لە مێژووی سیاسی عێراق و گەلی کوردستاندا بێ وێنەیە. یەکەمین جارە لە مێژووی سیاسی عێراقدا سەرتاپای کوردستانی عێراق رزگار بکرێت. و کورد دەستی بە سەر دا بڕوات. لە هەمانکاتیشدا کورد بۆتە فاکتەر و توخمێکی گرنگ لە هاوکێشەی سیاسی عێراقدا کە پەراوێز کردنی ئاسان نییە.

بەلام لەگەڵ هەمووی ئەوانەش دا دەکرێت بلێین؛ دوای پێنج سال تێپەربوون لە سەر لادانی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا، هێشتا ئەم ولاتە نەکەوتۆتە سەر ڕێڕەوە راستەکەی. ململانێ و ناکۆکی زۆر لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراقدا (کورد، شیعە، سوننە)هەیە. لە هەمانکاتیشدا بە هۆی کاریگەری فاکتەری هەرێمی و نێودەولەتی لە سەر ڕەوش و پرۆسەی سیاسییەکەی، ئەو ولاتە لە بەردەم گۆڕانکاری خێرا و مەزن دایە. بە هەر دوو لایەنی پۆزەتیڤ و نگەتیڤەوە، هەموو ئەوانەش بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری و باندۆڕیان هەیە و دەبێ لە سەر دۆزی کورد و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان.

بۆیە ئەوەی لەم توێژینەوەیەدا زیاتر جێگای گرنگی پێدان و هەڵوەستە لە سەر کردن بووە، خستنە ڕووی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی دوای دارمانی رژێمی بەعس بووە لە عێراقدا. لەم چوارچێوەیەدا هەوڵم داوە وەڵامی کۆمەڵێك پرسیار بدەمەوە کە بە لامەوە گرنگن ؛ وەك ئەوەی ئەو پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییانە کە لە دوای دارمانی رژێمی بەعس لە عێراق هاتۆنەتە ئاراوە چین؟ ڕەوت و ئاراستەی ئەم گۆڕانکارییانە بەرەو کوێ دەچن؟ کاریگەری پەرەسەندن و پێشڤەچوونە سیاسییانەی دوای دارمانی رژێمی بەعس لە عێراق، بە سەر دۆزی کوردەوە چەندە و چۆنە و چی بووە؟ تا چەند سەرکردایەتی سیاسی کورد توانیویەتی خۆی لەگەڵ ئەم گۆرانکارییانە بگونجێنێ، و سوود لەم هەلومەرج و بارودۆخە نوێیە وەربگرێ بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردستان؟ ئایا دەکرێ قۆناغی دوای دارمانی رژێمی بەعس ناوی لێ بنێین سەرەتای چارەسەرکردنی پرسی کورد لە کوردستانی عێراق؟ ئەو فاکتەر و میکانیزمانەی کە کاریگەرن بۆ چارەسەری ئەم پرۆسە کامانەن؟ ئەرکی سەرکردایەتی سیاسی کورد لەم قۆناغە مێژووی و هەستیارەدا چییە؟ بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەم پرسیارانە و شیکردنەوەو و تیشك خستنە سەری، هاندەر بوونە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی تایبەت و پەیوەندیدار بەم پرسیارانەی سەرەوە لە چوارچێوەیەکی زانستی و ئەکادیمیدا ئەنجام بدەم. لەم روانگەیەشەوە بە باشم زانی کە (دۆزی کورد لە عێراق و میکانیزمەکانی چارەسەرکردنی - دوای ٢٠٠٣) بکەمە ناونیشانی توێژینەوە، بەو هیوایەی تێیدا سەرکەوتوو بم.

### ئامانجی توێژینەوەکە:

مەبەست و ئامانجی سەرەکی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە خستنەڕووی دۆزی کورد لە کوردستانی عێراق، و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەویش لە ڕێگەی:

١- ڕوونکردنەوەی ئەو هۆکار و ڕەهەندانەی کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق تاکۆ ڕووخانی رژێمی بەعس (١٩٢١-٢٠٠٣)، ئاستەنگ بۆنە لە بەردەم چارەسەری پرسی کورد لە کوردستان عێراق.

٢- شیکردنەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە دوای ٢٠٠٣ لە عێراق هاتوونەتە ئاراوە.

٣- خستنە بەرباس و لێکۆڵینەوەی پەرەسەندن و پێشڤەچوونە سیاسییەکانی پەیوەست بە دۆزی کوردەوە، بە تایبەت ئەو پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییانەی کە لە دوای دارمانی رژێمی بەعس لە عێراق هاتوونەتە ئاراوە.

٤- خستنەڕووی ئەو فاکتەر و میکانیزمانەی کە کاریگەرییان هەیە بۆ چارەسەری پرسی کورد لە کوردستانی عێراقدا.



### گریمانەی توێژینەوەکە:

گریمانەی *توێژینەوەکە* لەو بیروکەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە چارەسەری ڕاستەقینە و بنبڕانەی دۆزی کورد لە کوردستانی عێراق، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە مافی چارەی خۆنووسی گەلی کوردستانەوە هەیە. بۆ سەلماندنی ڕاستی گریمانەکە، *توێژینەوەکە* چەند پرسیارێکی سەرەکی لە خۆدەگرێت لەو پرسیارانە:

١- هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دۆزی کورد لە عێراقدا چی بووە؟ بۆچی بە درێژایی سەدەیەك (١٩٢١-٢٠٠٣) نەتوانراوە ئەم پرسە چارەسەر بکرێت؟

٢- ئایا حکوومەتە یەك لە دوا یەکەکانی عێراق ئامادەبۆنە بەگوێرەی پرنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین هەلسوکەوت لەگەڵ کورد بکەن؟

٣- فاکتەر و میکانیزمەکانی کاریگەر بۆ چارەسەری ئەم پرسە چین؟

٤- ئایا فیدراڵییەت کۆتایی چارەسەرە بۆ کێشەی کورد، یاخود میکانیزمە بۆگەیشتن بە مافی چارەی خۆنووسین؟

٥- مافی چارەی خۆنووسین چۆن پێناسە دەکرێت؟ ڕەگەز و پێوەرەکانی کامانەن؟

٦- ئایا کورد توانییەتی لە دوای دارمانی رژێمی بەعس لە عێراقدا مافی چارەی خۆنووسین لە دەستووری هەمیشەییدا بچەسپێنێ؟ ئایا بەبێ گەیشتن مافی چارەی خۆنۆ سین، کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت؟

### میتۆدی توێژینەوەکە:

لێکۆڵینەوەکە وا پێویستی دەکرد توێژەر زیاتر لە مێتودێك بەکاربهینیت، لەو میتۆدانە:

١- میتۆدی مێژوویی (المنهج التاریخی): خستنەڕووی باکگراوەندی مێژوویی سەرهەڵدانی دۆزی کورد لە عێراقدا، وا پێویست دەکرد کە میتۆدی مێژوویی بەکاربهێنم.

٢- میتۆدی شیکاری (المنهج التحلیلی): *توێژینەوەکە* وا دەخوازێت دیاردە و پێشهاتە سیاسییەکان و دەرئەنجامەکانی شیبکەمەوە ناوەڕۆکەنیان ئاشکرا بکەم.

## گرنگی توێژینەوەکە:

گرنگی و بایەخی توێژینەوەکە خۆی لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

١- یەکێك لە گرنگییەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوەیە کە لە شیکردنەوەی بابەت و کێشەکان و دەستنیشانکردنی چارەسەرییەکان، هەوڵم داوە بیروبۆچوونی سیاسەت زانان و پسپۆڕان و شارەزایانی بواری سیاسی و یاسایی سوود وەربگرم. بە تایبەتی ئەوانەی کە گرنگی بە بارودۆخی عێراق و مەسەلەی کورد دەدەن.

٢- زۆربەی بابەتەکانی ئەم توێژینەوە پەیوەندی راستەوخۆیان بە پەرەسەندن و گۆڕانکارییە سیاسییانەی دوای دارمانی رژێمی بەعس لە عێراقدا هەیە. بۆیە نووسینی توێژینەوەیەك لە چوارچێوەیەکی زانستی و ئەکادیمیدا کە پەیوەندیدارە بەو قۆناغە گرنگ و هەستیارەی گەلەکەمان پێیدا تێدەپەڕێ، سوودمەند دەبێ بۆ کۆمەڵگەکەمان و گەلەکەمان. پێم وایە قۆناغی ئەمڕۆی کوردستانی عێراق وای دەخوازێ وەك ئەرکێکی نەتەوایەتی و نیشتیمانی، زیاتر و بەر فراوانتر لێکۆڵینەوە لە سەر ئەم مژارانە (تەوەرانە) بکرێت.

## گیروگرفت و ئاستەنگەکان:

لە میانەی نووسینەوەی ئەو توێژینەوەیەدا بەرەو رووی کۆمەڵێك کێشە و گرفت بوومەوە. ئەوەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

١- بابەتەکە بە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکانی سەر گورەپانی سیاسی ناوخۆیی عێراق و کوردستان و هەرێمی و نێو دەوڵەتی هەیە؛ زور جار ناچاری کردم بە بابەتەکەدا بچمەوە زیادی بکەم. تەنانەت هەندێك جاریش ناچار بوومە بابەتی نوێ بۆ توێژینەوەکە زیادی بکەم. ئەمەش بە هۆی ئەو رووداو و گۆڕانکارییە سیاسییانەی کە لە میانەی نووسینی ئەم تووژینەوەیەدا هاتوونەتە ئاراوە، کاریگەری راستەوخۆی هەبووە لەسەر بابەتەکانی لێكولێنەوەکە.

٢- کەمی سەرچاوە و ژێدەر و توێژینەوەی زانستی لە سەر دۆزی کورد بە تایبەتی لە دوای گۆڕانکاریەکانی (٩)ی نیسانی ٢٠٠٣ لە عێراق، وای کرد بۆ وەرگرتنی زانیاری و کۆکردنەوەیان و هەروەها وەرگرتنی راوبۆچوونی شارەزایان و پسپۆران پەنا ببەمە بەر گۆڤار و رۆژنامە و تۆڕی ئینتەرنێت. بێگومان ئەمش کاتێکی زۆری لێ گرتم.



٣- نووسینی توێژینەوەکە بە زمانی کوردییە، ئەمەش ئەرکی منی سەختر کرد. بە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری سەرچاوەکانی پەیوەند بە دۆزی کوردەوە بە زمانی عەرەبی نووسراون. بۆیە لە کاتی وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی هەندێ جار بە هۆی نەبوونی دەستەواژەی گونجاو و بە پێت تووشی کێشە هاتووم و وەرگێڕانەکەش ئەرکی سەرشانی من قۆرستر کرد.

## پێکهاتەی توێژینەوەکە:

لە دارشتنەوەی شێوەی لێکۆڵینەوەکەدا پەیڕەوی پلانێکی تایبەتم کردووە، ئەویش لە رێگای دابەشکردنی لێکۆڵینەوەکە بە سەر سێ بەشدا، بەم شێوەی خوارەوە:

***بەشی یەکەم: سەرهەڵدانی دۆزی کورد لە عێراق و بەردەوامی قەیرانەکە... هۆکارو رەهەندەکان:*** ئەم بەشەم کردۆتە سێ باسی سەرەکی، باسی یەکەم لە دوو لقی سەربەخۆ پێکدیت، لە لقی یەکەمدا جەختم کردووە سەر فاکتەرە ناوخۆییەکان کە کاریگەریان هەبووە لە لکاندنی ئەم بەشەی کوردستان بە عێراقەوە پاشان ئاماژەم بە سیاسەت و هەڵوێستی حکوومەتەکانی عێراق کردووە لە هەمبەری دۆزی کورد، لە باسی دووەمیشدا باسم لە فاکتەری نێودەوڵەتی کردووە، بەو پێیەی رۆڵی نگەتیڤی هەبووە لە سەر دۆزی کورد، ئەم باسەشم کردۆتە دوو لقی سەرەکی، لقی یەکەم تەرخانکراوە بۆ پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکان کە بە هۆی شەڕی یەکەمی جیهانی هاتۆتە ئاراوە و بوونە هۆی دابەشبوونی کوردستان لقی دووەمیش باس لە کاریگەری جەنگی سارد دەکات بە سەر پرسی کورد لە کوردستانی عێراقدا.

***بەشی دووەم : گۆڕانکارییەکانی (٩)ی ٢٠٠٣ لە عێراق و کاریگەرییەکانی لە سەر دۆزی کورد:*** ئەم بەشم بەسەر سێ باسی سەرەکیدا دابەش کردووە. لە باسی یەکەم ئاماژە بە ئەو هۆکار و پاساوانە دەکات کە کاریگەرییان هەبووە بە سەر ئیدارەی ئەمەریکا بۆ ڕوخاندنی رژێمی بەعس. لە باسی دووەمیشدا تیشکم خستۆتە سەر کۆتایی هێنان بە دیاردەی دوو ئیدارەیی و دوو حکوومەتی لە کوردستان و هەروەها هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی هەرێم. باسی سێیەمیش تەرخانکراوە بۆ دەستووری هەمیشەی عێراق و مافەکانی گەلی کوردستان. هەروەها ئەو تەگەرە و کۆسپانەی کە کەوتبوونە بەردەم پڕۆسەی نووسنەوەی دەستووری هەمیشەیی.

*بەشی سێیەم : فاکتەر و میکانیزمەکانی کاریگەر بۆ چارەسەری دۆزی کورد*، ئەم بەشم دابەش کردووە بەسەر سەر چوار باسی سەرەکیدا، لە باسی یەکەمدا جەختم کردۆتە سەر مافی چارەی خۆنووسینی گەلی کورد، بەو پێیەی بنەمای سەرەکییە لە چارەسەرکردنی پرسی گەل و نەتەوەکان. لە باسی دووەمیشدا ئاماژەمان بە پیادەکردنی سیستەمی فیدراڵی لە عێراق کردووە. ئەم باسەشم بە سەر چوار لقی سەربەخۆدا دابەش کردووە، لقی یەکەم: ئاوڕدانەوەیەکی کورتە دەربارەی چەمك و تایبەتمەندییەکانی سیستەمی فیدراڵی. لقی دووەمیش باس لە کاریگەری سیستەمی فیدراڵی دەکات بۆ چارەسەرکردنی ململانێی ئیتنی و تایفی لە عێراقدا. لقی سێیەمیش تەرخانکراوە بۆ فاکتەرەکانی کاریگەر بۆ سەرکەوتنی سیستەمی فیدراڵی لە عێراقدا. لقی چوارەمیش ئاماژە بە تەگەرە و کۆسپەکانی بەردەم پراکتیزەکردنی سیستەمی فیدراڵیێ دەکات. باسی سێیەمیش تەرخانکراوە بۆ یەکلاکردنەوەی پرسی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان، بەو پێیەی بە بێ چارەسەرکردنی ئەم پرسە چاوەڕێ ناکرێ دۆزی کورد بە ئاراستەی چارەسەری بڕوات. باسی چوارەمیش گرنگی دەدات بە فاکتەری هەرێمی و نێودەوڵەتی و چۆنییەتی سوود لێ وەرگرتنیان بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردستان.

# بەشی یەکەم

## سەرهەڵدانی دۆزی کورد لە عێراق و بەردەوامی قەیرانەکەی.. هۆکار و رەهەندەکان

باسی یەکەم/ فاکتەرە ناوخۆییەکان

لقی یەکەم: کێشەزای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق

لقی دووەم: تێڕوانین و سیاسەتی سیستەمە سیاسییەکانی عێراق لە هەمبەر دۆزی کورد

باسی دووەم: کاریگەری فاکتەرە نێودەوڵەتییەکان لەسەر دۆزی کورد

لقی یەکەم: هەڵوێستی زلهێزەکان لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان سەبارەت بە دابەشکردنی کوردستانی

لقی دووەم: ململانێی دوو جەمسەری سەردەمی جەنگی سارد و کاریگەری لەسەر باشووری کوردستانی عێراق

باسی سێیەم: هەڵوێستی دەوڵەتانی هەرێمی لە هەمبەر کوردستانی عێراق

# باسی یەکەم

## فاکتەرە ناوخۆییەکان

### لقی یەکەم: کێشەزای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق:

بە دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١،[1] و دواتریش لکاندنی ویلایەتی موسڵ (باشووری کوردستان) لە ساڵی ١٩٢٥بە جەستەی ئەم دەوڵەتەوە،[2] گەورەترین ئاستەنگ خرایە بەردەم کورد؛ بۆ گەیشتن بە مافە نەتەوەییەکانی. لەبەر ئەوەی دوور لە خواست و ویست و ئیرادەی خۆی و بێ رەچاوکردنی مافی چارەی خۆنووسین، خرایە چوارچێوەی دەوڵەتێ عێراق. وەك نەتەوەیەکی خودان خاك، ناسنامەی نەتەوەیی لێ زەوت کراو بە زۆر ناسنامەیەکی تری بەسەردا سەپێنرا. بێ رەچاوکردنی تایبەتمەندییەکانی نەتەوەیی، کلتووری، مێژوویی، بۆیە پێڤاژۆی دروستکردنی ئەم دەوڵەتە، پرۆسەیەکی ئاڵۆز و پڕ ململانێ و مەترسیدار بووە. سەرەتای سەرهەڵدانی ململانێ و شەڕێکی خوێناوی بووە، لە نێوان حکوومەتە یەك لە دوا یەکەکانی عێراق لە لایەك و تەڤگرا رزگاری خوازا کورد لە لایەکی ترەوە، چونکە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە تا ڕوخانی رژێمی بەعس نەیانویستووە بەگوێرەی بنەما و پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین، رێگاچارەیەکی گونجاو ریالسیتانە بۆ پرسی کورد بدۆزنەوە.

عێراق بەو سنوورەی کە ئێستا هەیەتی، پێش شەڕی یەکەمی جیهانی، هیچ بوونێکی نەبووە؛ ئەم دەوڵەتە دروست کرا وەك بەشێك لە پرۆسەی دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی. لە رێگەی پێکەوە گرێدانی هەر سێ ویلایەتی (بەسرا، بەغدا، موسڵ)[3] ئەم پرۆسەی دروستکردنەش بە دوو قۆناغی سەرەکیدا، تێپەڕیوە. قۆناغی یەکەم دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی بووە، کە هەر ویلایەتی بەسرا و بەغدای دەگرتەخۆ. زۆرینەی دانیشتووانی ئەم دوو ویلایەتە عەرەبن. {بڕوانە خشتەی ژمارە (١)}، قۆناغی دووەم لکاندنی ویلایەتی موسڵ بووە بەجەستەی ئەم دەوڵەتەوە، کە زۆرینەی دانیشتووانی کورد بوون.{بڕوانە خشتەی ژمارە (٢) }، ئەو دەوڵەتەی کە بەریتانیا لە عێراق دروستی کرد، هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی کێشە و گیروگرفتێکی زۆر بووە. لە هەموویان گرنگتر، پێکهاتەی دانیشتووانی ئەم سێ ویلایەتە بووە کە خراونەتە ناو چوارچێوەی ئەم دەوڵەتە دەستکردە، چونکە لە رووی پێکهاتەی دانیشتووانەوە زۆر لێك جیاواز بوون. و هەریەك لەم ویلایەتانە خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی و تایفی تایبەت بەخۆیان بوون؛ عەرەبەکان دابەش دەبوون بەسەر دوو تایفەی شیعە و سوننەدا و زۆر کەم تێکەلاوی یەکتردەبوون.[4] لە لایەکی ترەوە کورد زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ پێکدەهێنن. لە رووی نەتەوەییەوە بە تەواوەتی جیاواز بوون لە دانیشتووانی ویلایەتی بەسرا و بەغدا.[5] داوای مافی چارەی خۆنووسینیان دەکرد.[6]

(١) هنری فوستر، نشأة العراق الحديث، ترجمة سليم طه التكريتي، الطبعة العربية الاولى، الاهلية للنشر والتوزيع، الاردن-عمان، ٢٠٠٦، ص ٤٤٥؛ حنا بطاطو، العراق، الطبقات الاجتماعية و الحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، الكتاب الاول، ترجمة عفيف الرزاز، الطبعة العربية الثانية، بيروت، ١٩٩٥، ص٤٢.

(٢) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثاني، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد،١٩٨٨، ص ٢٧.

(٣) درية عوني، العلاقات العربية –الكردية منذ فجر التاريخ الى اليوم في: وقائع وثائق مؤتمر الحوار العربي-الكردي بالقاهرة والمؤتمرات واللقاءات اللاحقه، إعداد عمر بوتاني، ١٩٩٨، ص٤٩.



(٤) حنا بطاطو، مصدر سابق، ص ٣٦.

(٥) عزيز حسن البارزاني، الحركة القومية الكردية التحررية في كردستان العراق (١٩٣٩-١٩٤٥)، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٢، ص١٥.

(٦) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الاول، الطبعة الرابعة، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص٥٤.

| تایفە | شارنشینەکان % | | گۆندنشینەکان % | کۆ % | |
|---|---|---|---|---|---|
| موسڵمانەکان | | | | | |
| عەرەب شیعە | ٦٧٣ | ٤١ ,٩ | ٥٦, ٥١٦٧١ | ٢٣٤٤ | ٥١ ,٤ |
| عەرەب سوننە | ٤٢٨ | ٢٦ , ٧ | ١٦ ,٠ ٤٧٢ | ٩٠٠ | ١٩ ,٧ |
| کوردی سوننە | ١٧٦ | ١٠ ,٩ | ٢٢, ٤ ٦٦٢ | ٨٤٠ | ١٨ , ٤ |
| فارسی شیعە | ٤٩ | ٣ ,١ | ٠ , ١ ٣ | ٥٢ | ١ , ٢ |
| ترکمانی سوننە | ٣٩ | ٢ , ٥ | ٠ , ٣ ١١ | ٥٠ | ١ , ١ |
| ترکمانی شیعە | ١١ | ٠ ,٧ | ١ , ١ ٣١ | ٤٢ | ٠ , ٩ |
| کوردی فەیلی (شیعە) | ١٤ | ٠, ٩ | ٠ , ٥ ١٦ | ٣٠ | ٠ , ٦ |
| نا موسڵمانەکان | | | | | |
| مسحییەکان | ٩٤ | ٥ , ٩ | ١ , ٨ ٥٥ | ١٤٩ | ٣ , ١ |
| یەهودی | ١١٣ | ٧ ,٠ | ٠ , ٢ ٤ | ١١٧ | ٢ ,٦ |
| کوردی ئێزدی و شەبەك | ٢ | ٠ , ١ | ١ , ٠ ٣١ | ٣٣ | ٠ , ٨ |
| صابئة | ٥ | ٠ , ٣ | ٠ ,١ ٢ | ٧ | ٠ ,٢ |
| کۆ | ١٦٠٤ | ١٠٠ ,٠ | ١٠٠ , ٠ ٢٩٦٠ | ٤٥٦٤ | ١٠٠ , ٠ |

**خشتەی ژمارە (١): پێکهاتەی ئایینی و نەتەوەی دانیشتووانی عێراق لە ساڵی (١٩٤٧).[٧]**

(٧) حنا بطاطو، مصدرسابق، ص ٦٠.



| | ئاماری ترکیا(کە لە لۆزان1923 پێشکەش کرا) | راپۆرتی بەریتانیا لە ( 1921 ) | ئاماری فەرمی عێراقی لە (1922-1924) |
|---|---|---|---|
| *کورد* | *263830* | *424720* | *494007* |
| *عەرەب* | *43210* | *185763* | *166941* |
| *ترك* | *146960* | *65895* | *38652* |
| *نصاری* | - | *62225* | *61336* |
| *یەهود* | *31000* | *16865* | *11897* |
| *ئێزیدی* | *18000* | *30000* | *26257* |
| *کۆی دانیشتووانی(المستقرین)* | *503000* | - | - |
| *کۆی دانیشتووانی(الرحل)* | *170000* | | |
| *کۆی گشتی* | *673000* | *785468* | *801090* |

**خشتەی ژمارە (٢): ژمارەی دنیشتووانی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی عێراق) لە رووی نەتەوەیی و ئاینییەوە (١٩٢١-١٩٢٤).[٨]**

سەبارەت هەنگاوی یەکەمی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق، لە دوای شۆڕشی ١٩٢٠ لە باشووری عێراق، بەریتانیا هەندێك هەنگاوی بە پەلەی هاویشت بۆ جێبەجێکردنی ستراتیژییەتی خۆی لە عێراقدا. کە ئەویش بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی لایەنگری خۆی. لەم چوارچێوەیەدا و بۆ ئەم مەبەستە لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠)دا برسی کوکس نێردراوی پایەبەرزی حکومەتی بەریتانیا، لە رێگەی

(٨) جرجیس فتح الله، یقظة الكرد: تاريخ سياسي(١٩٠٠-١٩٢٥)، الطبعة الاولى، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل،٢٠٠٢، ص ٥٣٥.

ڕاگەیاندراوەیەکەوە، دامەزراندنی حکوومەتێکی کاتی بە سەرۆکایەتی (عەبدولڕەحمان نـەقیب گەیلانی) ڕاگەیاند. و لە (٢٥)ی تـشرینی یەکـەمی ١٩٢٠دا، ئـەم حکوومەتـە بـە فـەرمی ڕاگەیەنرا. لە دوای ئەوەی مـەلیك فەیـسەڵی کـوڕی حوسـێن لـە ٢٣ی ئـابی١٩٢١ کـرا بـە مەلیکی عێراق کۆتایی بە ئەرکی ئەم حکوومەتە هات.[(٩)]

لە قۆناغی یەکەمی دروستکردنی دەوڵەتی عێراقدا، بەریتانیا بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی ڕۆڵی زیاتری بە عەرەبە سوونەکان بەخشی؛ و کەمینەی عەرەبی سونی زاڵکرا بە سەر زۆرینەی عەرەبی شیعە لە عێراقدا. ئەمەش لە کۆنگرەی قاهیرەدا، بە ڕوونی دەرکەوتبوو کە لە نێوان پاڵێوراوان بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتی عێراق، زۆربەیان عەرەبی سوونی بوون.[(١٠)]

پەراوێزکردنی عەرەبی شیعە لە دەسەڵات، لە پرۆسەی یەکەمی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق، بریتی بووە لەو ستراتیژییەتەی کە بەریتانیا پشتی پێ بەستبوو لە پێناوی جێبەجێ

(٩) بڕوانه: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقيـة، الجزء الاول، مـصدرسابق، ص ص ١٨و(٦٥-٦٨)؛ هنرى فوستر، مصدر سابق، ص ص ١٨٦-١٩٠و(٤٣٤-٤٤٨)؛ د.عبدالوهاب حميد رشيد، العـراق المعاصـر، الطبعة الاولى، دار المدى للثقافة والنـشر، سـوريا-دمـشق، ٢٠٠٢،ص ص٧٧-٨٠؛ غـسان العطيـة، العـراق، نشاة الدولة ( ١٩٢١ — ١٩٨٠ )، ترجمة: عطـاء عبـدالوهاب، لنـدن، ١٩٨٨، ص ص ٤٦٤ و٤٧٦؛ شـورش حسن عمر، حقوق الشعب الكوردى في الدساتير العراقية، دراسة تحليلية مقارنـة، مركـز كوردسـتان للدراسـات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ص٢٤-٢٥ -؛منذر الموصلي، القضيةالكردية في العـراق، رويـة عربيـة للقضية الكردية، الطبعة الاولى، دار بيان، بيروت،٢٠٠٠، ص٧٠.

(١٠) ئەوانەی پاڵێوراوبوون، بۆ ئەوەی بکرێنە مەلیکی عێراق زۆربەیان عەرەبی سوونی بوون، ئەم پاڵێوراوانە بریتی بوون لە ١- فیصل بن حسين ٢- عـبدالرحمن النقيب ٣- طاالب نقيـب ٤- الـشيخ خزعـل ٥- الامـير عبدالعزيز بن السعود ٦- السيد اغاجان ٧- الامير ٨- برهان الدين، بڕوانه أحمـد رفيـق البرقـاوي، العلاقـات السياسية بين العـراق و بريطانيـا (١٩٢٢-١٩٣٢)، دار الرشـيد للنـشر، ١٩٨٠، ص ص٢٢-٢٤؛ امـين فـرج شريف، المواطنة و دورها في تكامل المجتمعات التعددية(المجتمع العراقي نموذجا)، رسالة ماجستير غـير منـشورة في كلية العلوم السياسية، جامعة صلاح الـدين، اربيـل،٢٠٠٦، ص ٩٦ ؛خليـل مـصطفى عثمـان الاتروشـى، كوردستان الجنوبية (العراق) في سنوات الاحتلال والانتداب البريطانيين (١٩١٨-١٩٣٢)، رسالة ماجستير غـير منشورة في كلية القانون والسياسة، جامعة دهوك، ٢٠٠٥، ص ص٧٢-٧٣.



کردنی سیاسەتی خۆی لە عێراقدا، لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ئاماژە بۆ کۆمەڵێك هۆکار، یاخود فاکتەر بکەین کەوای لە بەریتانیا کرد عەرەبی سوونە بکاتە دەسەڵاتدار و پشتی پێ ببەستێ لە پرۆسەی یەکەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا:

١- فەرمانڕەوایی کردن بە پشتبەستن بە کەمینەیەکی ژمارەیی لە ڕووی دانیشتووانەوە خۆی لە خۆیدا ئەو کەمینەیە لاواز و هەڕەشەلێکراو دەبێ لەسەر ئاستی ناوخۆ؛ چونکە دەسەڵاتەکەی هەڵقوڵاوی ئیرادەی زۆرینەی نییە و ڕەوایی خۆی لەگەلەوە وەرنەگرتووە، ئەمەش وا لەم کەمینەیە دەکات یاخود پاڵی پێوە دەنێت کە پەنا بۆ هێزێکی دەرەکی ببات بۆ ئەوەی پاڵپشتی بکات و دەستەڵاتەکەی بپارێزێ. ئەم کەمینەیە زیاتر ئامادەیە هاوکاری لەگەڵ هێزی دەرەکی بکات وەك لەوەی هێزی زۆرینە کە ڕەوایی خۆی لە ناوەوە وەردەگرێ. بۆیە بە دەسەڵاتدارکردنی کەمینە کەش و هەوایەکی لەبار دەڕەخسێ بۆ دروستبوون و پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوان هێزی دەرەکی و کەمینەی دەسەڵاتداردا.[(١١)]

٢- هەڵوێستی توند و ڕەتکردنەوەی ڕێبەرە شیعەکان لە سەرووی هەموویانەوە پیاوانی ئایینی، لە هەمبەر داگیرکاری بەریتانیا. ئەم هەڵوێستە بە ڕوونی لە شۆڕش ١٩٢٠ لە باشووری عێراق بەدیارکەوت.[(١٢)]

٣- ئامادەیی عەرەبە سوونەکان و باوەڕپێهێنانی دەست بژێری عەرەبی سوونی و هەندێك لە نەتەوە پەرستەکانی عەرەب وەك (خانەوادەی شەریفی مەکە، سەرکردە سەربازییەکانی عەرەب کە پلەداربوون لە سوپای عوسمانیدا، کارمەندانی کە پێشتر لە بەڕێوەبەرەتییەکانی عوسمانیدا کاریان دەکرد هەروەها چینی بازرگان..) لە پەسند کردنی ئەم چارەسەرییە و خۆ گونجاندنیان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا.[(١٣)]

(١١) ليام اندرسن و غاريث ستانسفيلد، عراق المستقبل، ديكتاتورية، ديمقراطية أم تقسيم، ترجمة: رمزى بدر، الطبعة الاولى، لندن، ٢٠٠٥، ص ص ٥٥؛ عبـد الكـريم الأرزي، مـشكلة الحكـم فـى العـراق، لنـدن، ١٩٩١ ص٣٤٩.

(١٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانـه: عبـد الكـريم الأرزي، مـصدر سـابق، ص ص(٣١٧- ٣١٨) و(٣٤٨-٣٤٩ )؛ غسان العطية، مصدر سابق، ص ص ٣٩٧-٤٥٦.

(١٣) د.علي كريم سعيد،حول مستقبل العـراق الـسياسي، الطبعـة الاولى، بغـداد، ٢٠٠٤، ص ص٣١-٣٤؛ ليام اندرسن و غاريث ستانسفيلد, مصدر سابق، ص ٥٥؛جوتيار عـادل محمـود، شـرعية الـنظم الـسياسية فـى

| سوونە | کۆیی ژمارەی پۆستەکان | ژمارەی(عدد) پۆستەکانی شیعە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| ١٩٢١ - ١٩٣٢(قۆناغی ماندیت) | ١١٣ | ٢٠ | ١٧, ٧ |
| ١٩٣٢ -١٩٣٦ | ٥٧ | ٩ | ١٥ , ٨ |
| ١٩٣٦-١٩٤١ (قۆناغی کۆدەتاکانی سەربازی) | ٦٥ | ١٨ | ٢٧ ,٧ |
| ١٩٤١- ١٩٤٦ (قۆناغی دووەمی داگیرکاری بەریتانی) | ٨٩ | ٢٥ | ٢٨ ,١ |
| ١٩٤٧-١٩٥٨ | ٢٥١ | ٨٧ | ٣٤ ,٧ |
| کۆی گشتی | ٥٧٥ | ١٥٩ | ٢٧ ,٧ |

**خشتەی ژمارە ٣)): پۆستەکانی عەرەبی شیعە لە سەردەمی پادشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨) بێ جگە (باستثنا) لە پوستی سەرۆك وەزیران[١٤]**

هەنگاوی دووەمی ستراتیژییەتی بەریتانیا لە دوای دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی لە هەردوو ویلایەتی بەسرەو بەغدا، بریتی بووە لە دەست بەسەرداگرتنی ویلایەتی موسڵ و لکاندنی بە دەوڵەتی نوێی عێراقەوە. لە ڕاستیدا بەریتانییەکان گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە لە بەرژەوەندی ستراتیژی ئەواندایە دەست بەسەر بیرە نەوتەکانی موسڵ دابگرن. بە هەر نرخێکی کە هەبێ و دەوڵەتێك دروست بکرێت کە هەر سێ ویلایەتی بەسرا و بەغدا و موسڵ بگرێتەخۆ. [١٥]

سەبارەت بە ئەو هەموو گرنگی و بایەخەی کە بەریتانیا بە ویلایەتی موسڵی دەدا، واتە کوردستانی عێراق، زۆربەی بۆچوونەکان وای دەردەخەن کە بەریتانیا هەستی بەوە کردبوو کە ئەم ناوچەیە لە ڕووی نەوتەوە دەوڵەمەندە. بەریتانییەکانیش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە

الشرق الاوسط(العراق نموذجا)، رسالة ماجستير غير منشورة في كلية العلوم السياسية، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٧٧.

(١٤) حنا بطاطو، مصدرسابق، ص٦٩.

(١٥) بڕوانە: درية عوني، العرب و الاكراد، دار الهلال، ١٩٩٣، ص ٦٢.



پێناوی پترۆڵدا شەڕیان دەکرد و دەیانویست دەست بە سەر سەرچاوەکانی نەوتدا بگرن، وەك (ونستۆن چەرچل) وەزیری کۆلۆنییەکانی بەریتانیا بە بۆنەی دروستکردنی لیژنەی خاوەندارێتی بۆ سەرچاوەی وزە، گووتبۆی: "پێویستە ئێمە ببیننە خاوەن نەوت و کۆنترۆڵی ئەوەندە سەرچاوەکانی نەوت بکەین کە پێویستیمان پێیەتی." [١٦]

بۆیە شوێنی ستراتیژی کوردستانی عێراق و دەوڵەمەندی لە ڕووی نەوتەوە ببووە جێگەی ململانێی نێوان وڵاتە زلهێزەکان. لە ڕێککەوتننامەی (سایکس بیکۆ)دا ویلایەتی موسڵ بەر فەڕەنسا کەوتبوو. هەندێك لە سەرچاوکان ئاماژە بەوە دەکەن، بۆیە ئەوکات بەریتانیا بەمە ڕازی ببوو؛ چونکە خوازیاری ئەوە نەبوو وڵاتە کۆلۆنییەکانی هاوسنوور بن لەگەڵ ڕووسیا [١٧].

بەڵام هاوکات لەگەڵ هەڵگیرسانی (شۆڕشی بەلشەوی ١٩١٧) و خۆکشانەوەی ڕووسیا لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بەریتانیا هەڵمەتە سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییەکانی خۆی چڕکردەوە. بۆ دەست بەسەرداگرتنی باشووری کوردستان، لە کاتێکدا لە دوای ئاگربڕی (مودرووس٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ )دا وازی لە پێشڕەوییەکانی خۆی هێنابوو، تەنیا هەردوو ویلایەتی بەسرە و بەغدای لەژێر دەستی دابوو، ئەوا لە ساڵی ١٩١٨ هەستا بە داگیرکردنی ویلایەتی موسڵ. بۆ ڕەوایی دان بەم سیاسەتەش، هانای بردە بەر بەندی (٧)ی ڕێککەوتننامەی (مودرووس)، کە هاوپەیمانان بۆیان هەبوو دەست بەسەر هەر هەرێمێکی ستراتیژیدا بگرن، بە تایبەت کاتێك هەرێمەکە هەڕەشە بێ لەسەریان.[١٨] لە ڕووی سیاسییەوەش بەریتانیا، لە دوای گفتوگۆ و دانووستاندنێکی زور و پێدانی ٢٥٪ گشت بەرهەمی نەوتی عێراق، توانی فەڕەنسا ڕازی بکات کە واز بهێنێ لە باشووری کوردستان. [١٩]

لە دوای ئەم مانۆڕە سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییە، بەریتانیا دۆسێی ویلایەتی موسڵی (کوردستانی باشووری) گرتە دەست و بە شێوەیەکی تەواو سەربەخۆ و جیاواز لە

(١٦) مصدر نفسه، ص ٦٢.

(١٧) د..فاضل حسين، مشكلة الموصل، دراسة فى الدبلوماسية العراقية – الانگليزية و تركية و فى الراى العام، منشورات دارالبيان، الطبعة الاولى، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٧، ص ص ٨ - ٩.

(١٨) بڕوانە، هنرى فوستر، مصدر سابق، ص ٢٥٠.

(١٩) د. فاضل حسين، مصدر سابق، ص ص ٨ – ٩.

عێراق هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد تاکو لکاندنی بە عێراقەوە[٢٠]، سیاسەتی بەریتانیا بنەما و ناوەڕۆکەکەی، لە هەمبەر کوردستان بە گشتی و باشووری کوردستان بە تایبەتی، لەگەڵ بنەماو پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین هاودژو ناکۆك بووە، لە روانگەی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی خۆیەوە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە، بێ ڕەچاوکردنی داخوازی و خواستەکانی نەتەوەی کورد، چونکە لەو کاتەی بەریتانیا هەوڵی لکاندنی باشووری کوردستانی بە عێراقەوە دەدا، ئەوا زۆربەی کوردەکان لەگەڵ ئەوەدابوون دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێ یان هەر هیچ نەبێ کیانێکی فیدراڵیان بۆ دابمەزرێنن.

کاتێك لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ دا (ارلوند ویلسون) نوێنەری پایە بەرزی بەریتانیا لە عێراق گەیشتە سلێمانی، بۆ دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرکردە کوردەکان، بۆ ئاگاداربوون و زانینی داخوازییەکانیان، ئەوا شێخ مەحموود بەڵگەنامەیەك کە ئیمزای نزیکەی ٤٠ سەرۆك هۆزی پێوە بوو پێشکەشی نێردراوی بەریتانیای کرد، داوایان لێکرد ڕێگەبدرێت کورد خۆی بەڕێوە ببات و هاوکارییان بکات بۆ گەیشتن بە سەربەخۆی لە ژێر ماندابی بەریتانیادا.[٢١]

هەروەها ئەو راپرسییەی کە لە ساڵی ١٩٢١دا ئەنجامدرا، بۆ رەوایی دان بە دەسەڵاتی مەلیك فەیسەڵ، زۆربەی ناوچە کوردییەکان ئامادە نەبوون بەشداری ئەم راپرسییە بکەن و ئەوانەی بەشدارییشیان کرد؛ داوای گرنتی کردنی مافەکانی کوردییان کرد. ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەستی شێخ مەحموودا بوون لەگەڵ ئەوە نەبوون بە هیچ شێوەیەك دوارۆژیان ببەسترێتەوە بە عێراقەوە. زۆربەی خەڵکی سلێمانی دژی راپرسییەکە وەستان و لە کەرکوك ٤٪ بەشداری راپرسییەکە بوون، تەنیا هەولێر و لیوای موسڵ لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ بوون بە مەرجێك گەرەنتی مافەکانی کورد بکرێت.[٢٢]

(٢٠) شورش حسن عمر، مصدر سابق، ص ١٣.

(٢١) جليلي جليل و اخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د. عبدي حاجي، الطبعة الاولى، دار الرازي، بيروت، ١٩٩٢، ص١٢٠.

(٢٢) بڕوانە، رەمەزان داودی، هەڵوێستی کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، سەنتەری برایەتی ( گۆڤار) ژمارە ٩ کانونی یەکەم ١٩٩٨ ) ل ٣٨؛ سرهنك حميد بةرزنجی، انتخابات اقليم كوردستان العراق، بين النظرية و التطبيق، دراسة مقارنة، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الاولى، اربيل ٢٠٠٢، ص ص ٢٥٥ — ٢٥٦،



بەریتانیا لە پێناوی داڕشتنی سیاسەتی خۆی لە عێراق و تەڤایا رۆژهەڵاتی ناڤین، گشت پرەنسیپ و پێوەر و بنەماکانی مافی چارەی خۆنووسینی پەراوێز کرد و لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، هەموو توانای سیاسی و دیبلۆماسی تەنانەت سەربازیشی خستەگەڕ، بۆ لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە لەبەر چەند فاکتەرێکی گرنگ لەوانە:

١- هۆکاری نەوت: بوونی نەوت لە ویلایەتی موسڵ یەکێك بوو لەو هۆکارە گرنگانەی کە وای لە بەریتانیا کرد ئەم هەرێمە بخزێنێتە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق[٢٣]، ویلایەتی موسڵ لە رووی سامانی سروشتییەوە بەتایبەتی لە رووی نەوتەوە زۆر دەوڵەمەند بووە. بۆیە بەریتانیا وای بۆ دەچوو، ئەگەر بیەوێت پێگەو دەسەڵاتی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەهێز بکات زۆر پێویستی بە کونترۆڵ کردنی سەرچاوەکانی نەوت هەیە. بە تایبەت زۆربەی گەشتی گەلەکانی بەریتانیا هەروەها فرۆکە جەنگییەکان و وسائلی هاتوچۆ پشتیان بەم سەرچاوە بەستبوو. لە لایەکی ترەوە بەریتانیا پیی وابوو بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە ئاسانتر دەتوانرا کونترۆڵی سەرچاوەکانی نەوت لەم هەرێمەدا بکەت.[٢٤]

| کێڵگەی نەوت | تێکرای(معدل) بەرهەم (بەرمیل/ رۆژانە |
|---|---|
| بابە گوڕگوڕ | ٢٤٩١٨ |
| بای حەسەن | ٨٦٥٧ |
| جەمبور | ٤١٣٣ |
| عین زالە | ٣٦٦٧ |
| **بەتمە ( بطمة)** | ١٤٠٠ |

د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەڵوێستی مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە مەسەلەی کورد لە عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٣)ـی ساڵی هەشتەم، ئابی ٢٠٠٠، ل ٦٠ - ٦٢.

23) د. فاضل حسين، مصدر سابق، ص ٣٠٢؛د. شاكر خصباك، الكرد و المسألة الكردية، الطبعة الثانية، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٨٩، ص ٤٢؛ عبدالرحمن منيف، العراق (هوامش من التاريخ والمقاومة ) الطبعة الثانية، الدار البيضاء، المغرب، ٢٠٠٤، ص ص٩٧- ٩٩.

(٢٤) بڕوانە: هنري فوستر، مصدر سابق، ص ص٢٥٢-٢٦٠؛ ليام اندرسن و غاريث ستانسفيلد، مصدر سابق، ص ٤٤.

| | |
|---|---|
| نەوتخانە | ٧٥٠ |
| تێکرای (معدل) کێڵگە نەوتییەکانی کوردستان | ١٧, ٨٧٥ |
| تێکرای (معدل ) کێڵگە نەوتییەکانی بەسرە | ٧٦٠٧ |
| تێکرای (معدل ) کێڵگە نەوتییەکانی عێراق | ١٣٦٩٥ |

خشتەی ژمارە (٤):[٢٥] تێکرای بەرهەمی ڕۆژانەی یەك کێڵگە لە کێڵگە نەوتییەکانی کوردستان، ساڵی ١٩٧٠.

| کێڵگە | ناوچە | یەدەك (الاحتياطي)، مليارد بەرمێل | تێبینییەکان |
|---|---|---|---|
| بابە گوڕگوڕ | *کەرکوك* | *١٥ , ٠٠* | *بەرهەم هێنراو* |
| بای حەسەن | *کەرکوك* | *٠٣, ٠٥* | *بەرهەم هێنراو* |
| جەمبور | *کەرکوك* | *٠٠, ٤٠* | *بەرهەم هێنراو* |
| نجمە حسن | *کەرکوك* | *٠٣, ٧٠* | *بەرهەم نەهێنراو* |
| جەمبوری باکوور | *کەرکوك* | *٠٥ , ٩٠* | *بەرهەم نەهێنراو* |
| عين زالە | *ڕۆژئاوای دیجلە* | *٠ , ٠٨* | *بەرهەم هێنراو* |
| بەتمە( **بطمة**) | *ڕۆژئاوای دیجلە* | *٠ , ٤٠* | *بەرهەم هێنراو* |
| نەوتخانە | *خانەقین* | *٠ , ٢٣* | *بەرهەم هێنراو* |

***خشتەی ژمارە (٥): یەدەکی سەلمێنراوی (* Proved Reserve)کێڵگە نەوتییەکانی کوردستان.[٢٦]**

(٢٥) الحزب الديمقراطي الكوردستاني، مكتب الدراسات و البحوث المركزي، نفط كوردستان العراق ( دراسة تأريخية، جيولوجية، جغرافية، اقتصادية) الجزء الاول، الطبعة الاولى، ١٩٩٧ ص ٣٨.

(٢٦) مصدر نفسه، ص ٦٢.



| هەرێم | ساڵ | کورد | تێبینییەکان |
|---|---|---|---|
| کەرکوك | ١٩٤٧ | ٥٣٪ | ئاماری ١٩٤٧ |
| | ١٩٥٧ | ٤٨, ٣٪ | ئاماری ١٩٥٧ |
| خانەقین | ١٩٤٧ | ٨٠ ,٥٪ | ئاماری ١٩٤٧ |
| | ١٩٥٧ | ٥٨, ٤٪ | ئاماری ١٩٥٧ |
| ناوچەی زۆمار | لە سەردەمی پادشایەتی(الملكی) | ٦٠٪ | مەزەندەکان |

**خشتەی ژمارە (٦): ڕێژەی لە سەدی دانیشتووانی کورد لە ناوچە نەوتییەکانی کوردستان لە سەردەمی پادشایەتیدا .[٢٧]**

٢- هەڵکەوتی جیۆپۆلەتیکی ویلایەتی موسڵ، سەرەڕای ئەوەی ئەم دەڤەرە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە لە ڕووی نەوت و سامانی سروشتییەوە (وەك گەنم، جوو، بەروبوومی کشتوکاڵی)[٢٨]، ئەوا فاکتەری تەناهی و ئاسایش بووە بۆ هەرێمە کۆلۆنییەکانی بەریتانیا، هەروەها هۆکارێك بۆ کە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیای بە هیندوستانەوە دەبەستەوە، بنکەیەکیش بووە بۆ گواستنەوەی پەترۆڵ بۆ کەشتییەکانی بەریتانیا لەکەنداوی فارس و دەریای سپی [٢٩]، بە هێڵی یەکەمی بەرگریش دادەنرا بۆ پاراستنی هەرێمی عەرەبی( میزو پۆتامیا) لە هەمبەر ڕووسیای قەیسەری.[٣٠]

(٢٧) الحزب الديمقراطي الكوردستاني، مكتب الدراسات و البحوث المركزي، نفط كوردستان العراق ( دراسة تأريخية، جيولوجية، جغرافية، اقتصادية)، الجزء الثاني، الطبعة الاولى، ١٩٩٨، ص ٤٤.

(٢٨) دیڤید ماکدۆیل، مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ کوردی، ابوبکر خۆشناو، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٥، ل ٢٠١

(٢٩) کامەران ئەحمەد محمد امین، کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا (١٨٩٠ — ١٩٣٢)، توێژینەوەیەك لە مێژووی سیاسیی و ئابووری، نامەی ماستەر بڵاونەکراوەیە، کۆلیژی ئاداب — بەشی مێژوو، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩، ل ١٢٠.

(٣٠) دیڤید ماکدۆیل، سەرچاوەی پێشوو، ل (٢٠٦-٢٠٧) و ل ٢٤٢.

٣- هێنا نە ئارای شێوەیەك لە هاوسەنگی لە رووی رێژەیی دانیشتووانەوە لە نێوان عەرەبی شیعە و سوونە، هۆکارەکی تری هاندەر بووە بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە. وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد پرۆسەی یەکەمی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لە پێکەوە گرێدانی هەردوو ویلایەتی بەسرا و بەغدا دا خۆی نواند. هەر لە سەرەتای دروست کردنی ئەم دەوڵەتەوە کەمینەی سووننی سەپێنرا بەسەر زۆرینەی عەرەبی شیعەدا. سەرەرای ئەوەی عەرەبی شیعەی زۆرینەی عەرەبی عێراقی پێکدەهێنا. لەبەر ئەمە بەریتانیا وای بۆ دەچوو کە لکاندنی ئەم هەرێمە بە عێراقەوە باشترین چارەسەرە بۆ راگرتنی هاوسەنگی لە نێوان شیعە و سوونەدا. [31]

لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩ تا مۆرکردنی پەیمانی لۆزان ١٩٢٣، بەریتانیا ویستوویەتی واخۆی پیشانبدات کە پشتگیری لە مافەکانی کورد دەکات و رێز لە مافەکانی دەگرێ و لەم رووەوە چەندین راگەیاندنی دەرکردووە و پشتگیری خۆی بۆ مافەکانی کورد پیشانداون.

لە گرنگترینیان راگەیاندنی هاوبەشی بەریتانی -عێراقی بووە لە٢٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ دا کە تێیدا هاتبوو"حکوومەتی بەریتانیا و عێراق دان دەنێن کە کوردەکانی چوارچێوەی عێراق مافی دامەزراندنی حکوومەتیان هەیە لەو ناوچانەی کورد تێیدا زۆرینەیە و لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانن چەند نوێنەرێکی فەرمی رەوانەی بەغدا بکەن. هیوایان خواست کوردەکان بە زووترین کات سەبارەت شێوە و جۆری ئەم حکوومەتە بگەنە رێککەوتنێك". [32]

بەڵام وردبۆنەوە لە سیاسەتی بەریتانیا لە عێراق و ناوچەکەدا، دەریدەخات کە زۆربەی کات کوردی وەك کارتێکی گوشار بەکارهێناوە دژی عێراق و تورکیا.

لە دوای مۆرکردنی پەیمانی لۆزان ساڵی ١٩٢٣، بەریتانیا بە تەواوەتی دەستبەرداری کورد ببوو، بەڵام تاکە هەرێمی کە سەرقاڵی کرد بوو ویلایەتی موسڵ و بیرە نەوتەکانی بوو. سەبارەت بە چارەنووسی ئەم هەرێمە داخۆ بەشێك بێت لە عێراق یان بخرێتە سەر تورکیا ململانێ و ناکۆکییەکی توندی نێوان تورکیا و بەریتانیای هێنایە ئاراوە، لە دوای ئەوەی ئەم

---

(٣١) خلیل مصطفى عثمان الاتروشی، مصدر سابق، ص١١٦؛ عزیز حسن البارزاني، مصدر سابق، ص ١٩.

(٣٢) بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، مصدر سابق، ص ٢٨٢؛ د.محمد هەماوەندی، رەوایی راگەیاندندی فیدراڵیزم لە کوردستاندا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، ژمارە(٢) ساڵی یەکەم، سلێمانی، تەمووزی ١٩٩٤، ل ١١٩.



دوو دەوڵەتە نەگەیشتنە هیچ رێککەوتنێك، ئەوا دۆزی باشووری کوردستان خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان و لە ٣٠ی تشرینی یەکەم ١٩٢٤ی لیژنەیەکی نێودەوڵەتی دروستکرا بۆ بە دواداچوونی راستییەکان و یەکلاکردنەوەی کێشەکە. لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥دا کۆمەڵەی گەلان لەبەر رۆشنایی راسپاردەکانی لیژنەکەدا، بڕیاری لکاندنی باشووری کوردستانی بە عێراقەوە درا. [33]

---

(٣٣) : ئەم کۆمیسیونە لە ٣٠ی ئەیلول ١٩٢٤بڕیاری دروست کردنی درا، و ٣٠/تشرینیَ یەم/١٩٢٤ دروست بوو بۆ یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ. ئەندامەکانی لەمانە پێکهاتبوو( ام دی ڤیرسن سویدی) وەك سەرۆکی کۆمیسیونەکە،( کونت بول تیلیکی) هەنگاری کە جوگرافی ناسێکی بەناوبانگ بوو و (کۆلونێل پاولس بەلژیکی)، کە هەردووکیان ئەندام بوون، بە پێی راپۆرتی ئەم کۆمیسیونە کۆمەڵەی گەلان لە ١٩٢٥/١٢/١٦ بڕیاری لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە درا، بڕوانە جرجیس فتح اللە، مصدر سابق، ص٣٢٥؛د محمد عمر مولود، الفیدرالیة و امکانیة تطبیقها في العراق، مطبعة وزارة التربیة، الطبعة الاولی، اربیل، ٢٠٠٠، ص٣١؛ جلیلي جلیل واخرون، مصدر سابق، ص١٥٣؛ عبدالرحمن سلێمان الزێباری، الوضع القانونی الاقلیم کوردستان العراق فی ظل قواعد القانونی الدولي العام، دراسة تحلیلیة-ناقدة، مطبعة وزارة التربیة، الطبعة الاولی، مؤسسة موکوریانی، اربیل، ٢٠٠٢ ص ص ١١٥و١٦١. شایانی باسە کۆمەڵەی گەلان لەسەر راسپاردەی لیژنەکە ئەم بڕیارانەی خوارەوەی دا:

١- هێلی بروکسل بەهێلی سنووری نێوان عێراق و تورکیا دابنرێ.

٢- داواکردن لە حکوومەتی بەریتانیا بو پێشکەشکردنی پەیمانیکی نوێ بە کۆمەڵەی گەلان سەبارەت بە بەردەوامبوونی ماندێت بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ، هەروەك پەیماننامەی هاوپەیمانی لە نێوان عێراق و بەریتانیا دیاری کردووە.

٣- داواکردن لە حکوومەتی بەریتانیا بۆ ئەوەی ئەو ریوشینە ئیدارییانە بگرێتە ئەستووی خۆی کە دەبنە مایەی دەستەبەرکردنی مافەکانی کورد، کە لە کۆبەندی راپۆرتەکەی کۆمیسیونی لێکولینەوەدا باس کراون.

٤- داواکردن لە حکوومەتی بەریتانیا بۆ جێبەجێکردنی راسپاردەکانی کە لیژنەی بە دواداچوونی راستییەکان دیاری کردووە. بڕوانە: هنري فوستر، مصدر سابق، ص ص ٣٣٣- ٣٤١؛ عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، الجزء الثاني، مصدر سابق، ص ص٢٦-٢٨.

## لقی دووەم: تێڕوانین و سیاسەتی سیستەمە سیاسییەکانی عێراق[٣٤] لە هەمبەر دۆزی کورد:

بێگومان ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور) پێش لکاندنی بە عێراقەوە بەشێك نەبووە لە خاکی عێراق و لە رابردووشدا وا دەرنەکەوتووە کە بەشێك بووبێ لە خاکی عێراق [٣٥] و ناوەکەشی لە لای خەڵکی کوردستان وەك ناوێکی وڵاتەکەیان ئاشنا نەبووە [٣٦]، هەروەها

(٣٤) عێراق لە رووی سیستەمی سیاسییەوە دابەش دەکرێت بە دوو قۆناغ، سەردەمی پادشایەتی، سەردەمی کۆماری؛ سەردەمی پادشایەتی (١٩٢١ — ١٩٥٨)، ئەم ماوەیە کاتێك دەستپێدەکات کە مەلیك فەیسەڵ (دەبێتە پادشای عێراق، ساڵی ١٩٢١ دەسەڵاتەکەی بەردەوام دەبێ تا ١٩٣٣، دوای ئەو کوڕەکەی غازی بن فەیسەڵ (١٩١٢— ١٩٣٩) جێگای دەگرێتەوە لە ٣ ئابی ١٩٣٣ تا ساڵی ١٩٣٩، لە دوای ئەو کوڕەکەی فەیسەڵ بن غازی (فیسەلی دووەم ) لە ٤ نیسانی ١٩٣٩ جێگای دەگرێتەوە، بەڵام چونکە منداڵ بووە لە ژێر سەرپەرشتی خاڵەکەی عەبدولئیلاه بن عەلی بووە تاکو گەیشتە تەمەنی یاسایی و بە روودانی شۆڕشی ١٤ـی تەمووز ١٩٥٨ کۆتایی بە سیستەمی مەلیکی دێت و سەردەمی کۆماری (١٩٥٨ — ٢٠٠٣) دەست پێدەکات لەگەڵ کەوتنی سیستەمی مەلیکی و کۆتایی پێدێت ٢٠٠٣/٤/٩ و زۆربەی لێکۆڵەرەکان ئەم ماوەیە بۆ سەر چوار قۆناغ دابەش دەکەن: ١- سەردەمی عەبدولکەریم قاسم (١٤ـی تەمووز ١٩٥٨ — ٨ـی شوبات ١٩٦٣) ٢- هاتنی بەعسییەکان بە هاوکاری عەبدولسەلام عارف (٨ـی شوبات ١٩٦٣ — ٨ـی تشرینی دووەم ١٩٦٣) ٣- سەردەمی دوو برا عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕەحمان عارف (١٨ـی تشرینی دووەم ١٩٦٣ — ١٧ـی تەمووز ١٩٦٨) ٤- سەردەمی بەعسییەکان بۆ جاری دووەم (١٧ـی تەمووز ١٩٦٨ — ٢٠٠٣/٤/٩) بڕوانە د. محمد عمر مولود، الفیدرالیة و امکانیة تطبیقها في العراق، مطبعة وزارة التربیة، الطبعة الاولی، اربیل، ٢٠٠٠، ص ص ١٥٩ — ١٦٨؛ عبدالرحمن منیف، مصدر سابق، ص٧٩ ومابعدها.

(٣٥) د..فاضل حسین، مصدر سابق، ص ص ٧٦-٧٧؛ د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص٢٤-٢٦. لە رووی جوگرافییەوە، ناوی عێراق لە "بلاد الرافدین — وڵاتی دوو ڕووبار" ەوە هاتووە کە مەبەست لێیان هەر دوو رووباری دیجلە و فوراتن. هەروەها بە وڵاتی "نێوان دوو رووبار — بین النهرین — Mesopotamia" ناو براوە، کە لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانی کۆن (گریك) ـیە، بەڵام سەبارەت بە وشەی "العراق — عێراق"، وشەیەکی عەرەبییە کە لە پاش فتوحاتی ئیسلامی و هاتنی عەرەبەکان بۆ ناوچەکە بەکار براوە، ئەم وشەیەش مەبەست لێی ئەو سەرزەمینە دەگرێتەوە کە لە کۆندا پێی دەوترا "بابل" یان "کلدیا" و دەکەوێت باکووری بابل. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هنری فوستر، م. س، ص١٦ و ما بعدها.

(٣٦) د..فاضل حسین، مصدر سابق، ص ص، ٧٨-٧٩.



بەپێی تایبەتمەنییەکانی نەتەوەیی و پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین کورد وەکو هەموو گەلانی ناوچەکە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی هەبووە. ئەم راستییەش لە لایەن کۆمیسیونی کۆمەڵەی گەلانەوە سەلمێنرا کە دامەزرا بوو بو لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونی مەسەلەی ویلایەتی موسڵ و دیاریکردنی سنووری نێوان عێراق و تورکیا، دوای ئەوەی چەندین سەرچاوەی مێژوویی، جوگرافی، فارسی، تورکی و ئەوروپیی خوێندەوە، گەیشتبووە ئەو راستییەی کە سنووری عێراق (هەرێمی مێزوپۆتامیا) لە باکوورەوە لە هێت — تکریت یاخود چیای حەمرین تێناپەڕێ.[٣٧] هەروەها لە رووی فاکتەرە ئەتنیکییەکانەوە، کۆمیسیونەکە جەختی لەسەر ئەوە کرد، کە کورد نە عەرەبن و نە فارس و نە تورك و بە تەواوەتی لە تورك و عەرەب جیاوازن، و لە دێر زەمانەوە لەم هەرێمەدا دەژین و نزیکەی پێنج هەشتی ($\frac{5}{8}$) سەرجەمی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ پێك دەهێنن، ئەگەر تایبەتمەندییەکانی نەتەوەیی لەبەر چاوبگیرێ ئەوا دەبێ دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد پێکبهێنرێ.[٣٨]

لە لایەکی ترەوە کۆمەڵەی گەلان کۆمەڵێك مەرجی خستبووە سەرشانی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە رەچاوکردنی مافەکانی کورد، چ لە کاتی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە، چ لە کاتی کۆتایی هاتنی ماندێت بەسەر عێراقدا، داوای لە حکوومەتی عێراق کردبوو کە رێوشوێنێکی پێویست لەم رووەوە بگریتە بەر لە وانە:

١- رێگا بدرێت کە کوردەکان بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەت بە خۆیان هەبێ.
٢- زمانی کوردی پێویستە لەو شوێنانەی کورد زۆرینەن بە شێوەیەکی فەرمی بەکاربهێنرێ.

(٣٧) مصدر نفسه.

(٣٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محسن محمد المتولی، کرد العراق في المؤتمرات و المعاهدات و الاتفاقیات الدولیة، مجلة سردم العربي، العدد (١٠) خریف ٢٠٠٥، ص ٩٨؛ د خلیل اسماعیل محمد، أقلیم کوردستان العراق دراسات فی التکوین القومی للسکان، الطبعة الثالثة، ١٩٩٩،ا ربیل، ص١٤٢؛ ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێگۆچکەی بەعسیان، ترحیل، تەعریب، تەبعیس، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی ١٩٩٩، ل ٨٧؛ نشوان شکری عبدوللا، گیروکرفتی سنووری عیراق-تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی؛ ژمارە (٢)، ساڵی چواردەهەم، ئابی ٢٠٠٦، سلێمانی، ل٢٠-٢٤.

٣- دامەزراندنی کارمەندانی کورد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباریان.

٤- عێراق هەوڵبدات بۆ گرەنتی کردن و پاراستنی ماف و ئازادی گشت هاوڵاتیان بە تایبەتی گروپی دینی، ئایینی، نەتەوەیی.[٣٩]

سەرەڕای ئەم هەموو ئەرك و پابەندێتی و مەرجانەی سەبارەت بە ڕێزگرتن لە مافەکانی کورد، خرابوونە سەرشانی ئەم دەوڵەتە، بەڵام سیاسەتی دەسەڵاتدارانی عێراق لە چوارچێوەی هێڵە گشتییەکانیدا، لە هەمبەر دۆزی کورد بریتی بووە لە سیاسەتی نکۆڵی کردن لەگەڵی کوردستان وەك نەتەوەیەکی خودان خاك، زمان و کوردستان وەك نیشتیمانەکەیان، و داننەنان بە مافە نەتەوەییەکانی و سەرکوتکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازا کورد، کە هەوڵی دەدا بۆ بەدیهێنانی یەکسانی نێوان هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە.[٤٠]

بۆیە دەسەڵاتدارەکانی عێراقی هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق جەختیان لەسەر ئەو خالە کردووە کە ویلایەتی موسڵ (کوردستانی عێراق) بەشێکی دانەبراوی عێراقە و، هەرێمەکی عەرەبییە. لە مایسی **١٩٢٣**دا، مەلیك فەیسەڵ لە وتارێکیدا لە شاری موسڵ ئەوەی دووپات کردەوە کە،" ویلایەتی موسڵ بەشێکی دانەبڕاو و هەمیشەیی عێراقە و حکوومەتی بەغدا هەرگیز ناتوانێت و لە توانایدا نییە تەنها یەك ڕۆژ بەبێ ئەم هەرێمە بژیت." [٤١] لە هەمان چوارچێوەیەدا ئەندامانی (المجلس التاسیسی العراقی) لە ساڵی **١٩٢٤**دا سەبارەت بە پرسی ویلایەتی موسڵ جەختیان لە سەر ئەو خالە کردووە کە " ویلایەتی موسڵ هەرێمەکی عێراقی - عەرەبییە و زۆر گرنگە بۆ عێراق." [٤٢]

---

(٣٩) عبدالرحمن سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ص ٢٠٦؛ عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، الجزء الثاني، مصدر سابق، ص ص،٢٦-٢٧؛ حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة فی الشرق الاوسط، مکتبة مدبولي، مصر، ١٩٩٢، ص ص ٧٢ — ٧٣؛ د.حسین بدیوی، خطوة علی الطریق الی البیت الکوردي الکبیر، دراسة في الوثائق البریطانیة، مطبعة وزارة التربیة، اربیل ٢٠٠٦، ص ٩٠.

(٤٠) د.جبار قادر، قضایا کردیة معاصرة، کرکوك- الانفال — الکرد و ترکیا، دار ئاراس للطباعة و النشر، الطبعة الأولی،٢٠٠٦، اربیل، ص ٣٥.

(٤١) د..فاضل حسین، مصدر سابق، ص ص ٢٢١و ٢٢٥.

(٤٢) مصدر نفسه، ص ٢٢٣.



ئیتر بەم شێوەیە زۆربەی دەسەڵاتدارەکانی عێراق زۆر بە راشکاوی جەختیان لەسەر ئەو خالە کردۆتەوە، کە عێراق بریتییە لە کوردستان و کوردستانیش بریتییە لە عێراق و هەردووکیان بەشێکی دانەبڕاون لە نیشتیمان و خاکی عەرەب، هەر کەسێك یاخود لایەنێك بیر لە جوداکردنەوەی ئەم هەرێمە بکاتەوە ئەوا بە دەستکردی ئیسرائیل و دوژمنانی عەرەب حسابیان بۆ کراوە، کە مەبەستیان پارچە پارچە کردنی نیشتیمانی عەرەبە. کاتێکیش باشووری کوردستان بە شێوەیەکی فەرمی دەچێتە نێو نەخشەی سیاسی عێراق و دەبێتە بەشێك لە جەستەی ئەم دەوڵەتە [٤٣]، هەوڵیانداوە کورد لە نەتەوەیەکی ئیتنیکییەوە بە ئاراستەی کەمینەیەکی ئیتنیکی ببەن و وەك کەمینە پیشان بدەن.

یەکەم هەنگاوی ئەم سیاسەتەش لە ساڵی **١٩٣٢**وەوە بەدیار دەکەوێ، کاتێك هەردوو حکوومەتی عێراق و بەریتانیا بۆ چاوپۆشین لە مافە نەتەوەییەکانی کورد، دەستیان بە کۆمەڵێك مانۆڕی سیاسی و دیبلۆماسی کرد و لەو یادداشتنامەیەی کە ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کرا، ناوی کورد وەك نەتەوە نەهێنرا و خرایە خانەی کەمینەوە. توانیان ئەم ئامانجەی خۆیان بپێکن کاتێك کۆمەڵەی گەلان بۆ کۆتایی هاتنی ماندات هەندێك مەرجی بەسەر عێراقدا سەپاند، و لە میانەی ئەم مەرجانەدا کورد وەك کەمینەی ئیتنی حیسابی بۆ کرا.[٤٤]

لەو کاتە بەدواوە لە ناوەندە فەرمییەکانی عێراق و عەرەب، ناوی کورد وەك کەمینەی نەتەوەیی هێنراوە. ئاشکرایە دەسەڵاتدارانی عێراق، لە پاڵ ئەم پیلان و سیاسەتی خۆیاندا، ئامانج و مەبەستێکی ستراتیجیان هەبووە، ئەویش بریتی بووە لەوەی فۆرمە دیموگرافی و جوگرافی هەرێمی کوردستان بە دارشتنێکی عەرەبی رەنگ رێژ بکەن[٤٥]، بەم شێوەیە کوردستان بە خاك و نەتەوە لە بۆوتەی نیشتیمانی عەرەبیدا بتوێنرێنەوە لە پێناوی بەدیهێنانی ئەم مەرامەی خۆیان لەسەر هەردوو ئاستی تیۆری و پراکتیکی، هەنگاویان بۆی هاویشتووە، و پرۆگرام و پیلانیان بۆی دارشتووە.

---

(٤٣) فرمان عبدالرحمن، پاکتاوکردنی رەگەزی کورد لە کوردستانی عێراقدا لێکۆڵینەوەیەکی (جیوگرافی، سیاسی، مێژوویی) لەسەر پرۆسیسەکانی بە عەرەب کردن و راگواستنی دانیشتووان، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢٧.

(٤٤) عزیز حسن البارزاني، مصدر سابق، ص ص ٤٢ — ٤٤.

(٤٥) فرمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

لە دوای هەڵوەشانی سیستەمی پادشایەتی، دەبینین زۆربەی ئەو دەستوورانەی کە دانراون بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا ناسنامەی عێراقی یان دیاری کردووە، کە ناسنامەیەکی عەرەبییە [٤٦] و زۆر بە راشکاوی و بە دەق لە رووی تیۆرییەوە کوردستانیان وەك بەشێك لە خاکی عەرەب حسابی بۆ کراوە، لێرەدا ئاماژە بە چەند بەندێکی ئەم دەستوورانە دەکەن:

لە بەندی دووەمی دەستووری ١٩٥٨دا ئاماژە بەوە کراوە کە "عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب" [٤٧]، دەستووری کاتی ٢٩ی/نیسان/١٩٦٤ بەندی (١) دەڵێت : "کۆماری عێراق دەوڵەتێکی دیموکراسی و ئیشتراکییە و بنەمای دیموکراسی و ئیشتراکی خۆی لە میراتی عەرەبی و رۆحی ئیسلامی وەردەگرێ و گەلی عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و ئامانجەکەی بریتییە لە یەکێتی عەرەبی گشتگیر و حکوومەت پابەندە بەوەی کار بکرێ بۆ بەدیهێنانی بە زووترین کات ئەویش بە یەکگرتن لەگەڵ کۆمکاری عەرەبی یەکگرتوو."[٤٨]

دەستووری کاتی ١٩٧٠ بەربەستەکی گەورەی داناوە لە هەمبەر داخوازی و مافەکانی نەتەوەی کورد لە بەندی (٣) بڕگەی (أ) داهاتووە "سەروەری عێراقیەکانەیە و خاکەکەی لێك جیانابێتەوە" بڕگەی (ب)یش دەڵێت "خاکی عێراق یەك خاکە و لێك جیا نابێتەوە و نابێ دەستبەرداری هیچ بەشێکی بێت" و لە بەندی (٥)یش دا هاتووە "عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب" [٤٩].

بە تێڕامان و شیکردنەوەی ئەو دەقی دەستوورانە، ئەم راستییانەی خوارەوە دەردەکەون:

١- گشت دەقەکان رەنگدانەوە و هەڵقوڵاوی ئایدۆلۆجیای پان عەرەبیزم و شۆڤێنیزمی عەرەبییە و ئامانج و مەبەستی سەرەکی بریتییە لە بەزۆر لکاندن و تواندنەوەی ناعەرەبەکانی عێراقە لە بۆتەی جیهانی عەرەبیدا.

(٤٦) د. شیرزاد احمد نجار، چەند تێبینییەکی بەرایی دەربارەی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق، بەشی چوارەم، هەفتە نامەی گوڵان، ژمارە (٥٥٦)،٢٩/٩/٢٠٠٥، ل ل ١٤-١٥.

(٤٧) دساتير العراق الجمهوری؛ إعداد القاضی نبيل عبد الرحمان حياوی، المكتبة القانونية —بغداد، (د ت)ص٢.

(٤٨) - مصدر نفسه، ص١٣.

(٤٩) - مصدرنفسه، ص٤٣.



٢- ناڤەرۆکی ئەم بەندانە، پێچەوانە و هاودژە لەگەڵ راستییە مێژوویی و جوگرافی و نەتەوەییەکانی عێراق. ناکۆڵی کردنە لە داننان بە کەسایەتی جیاوازی گەلی کورد و نیشتیمانەکەی.[٥٠]

٣- دەقی دەستووری بەم شێوەیە، هاودژ و ناکۆکە لەگەڵ گشت راستییە مێژوویی و جوگرافی و لۆجیکی، لەبەر ئەوەی ئەم دەقانە، بە مانای نکۆڵی کردنی ئاشکرای نەتەوە ناعەرەبەکانی عێراقە و هەوڵدان و رەوایی دانە بۆ سڕینەوەو تواندنەوەی تایبەتمەندییەکانی لە بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا، نکۆڵی کردنە لەوەی نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیاوازە لە عێراقدا.[٥١]

هەر لەم دیدگاو روانگەیەوە، پێویستە، ئاماژە بە بۆچوون و تێڕوانینەکانی حیزبی بەعس بکەین لە هەمبەر کورد و کەمیە نەتەوەییەکان، چونکە عێراق لە شەستەکانی سەدەی بیستەم دوای زنجیرەیەك کودەتای سەربازی کەوتە ژێر رکێفی ئەم حیزبەوە و توانی بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ هەژموون و دەسەڵاتی خۆی بەسەر عێراقدا بسەپێنێ، ئەم حیزبە بۆچوون و تێگەیشتنی تایبەتی خۆی هەبووە لە هەمبەری کورد، سەبارەت باکگراوندی مێژوویی بیرۆکەی دروستبوونی ئەم حزبە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٩ کە میشیل ئەفلەق [٥٢] و

(٥٠) واحد عەمر محی الدين، دانوستاندنەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد و حکوومەتەکانی عێراق (١٩٢١ – ١٩٦١)، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، بە بێ ژمارەی چاپ، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١١٥.

(٥١) شۆڕش حسن عمر، مصدر سابق، ص ٢٢١.

(٥٢) میشیل عفلق نێوان ساڵانی (١٩١٠ – ١٩٨٩) ژیانی کردووە، لە خێزانێکی دیانی لە ئاییننزای (ئورتودۆکسی یۆنانی) لە دمشق هاتۆتە دونیاوە، لە دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی، توانی زمالەیەکی خوێندن لە فرەنسا وەربگرێ و لە زانکۆی( سووربوون) ئەم وەڵاتە زانستی مێژوویی خوێندەوە، یەکەکە لە دامەزرێنەرەکانی حزبی بەعس. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، د.ئەلبیرت عیسی، خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لەسەر بەعسی عێراق، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری، بە بێ ژمارەی چاپ، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ل ٤٢،٢١؛ حنا بطاطو، العراق الشيوعيون والبعثيون و الضباط الأحرار، الكتاب الثالث، ترجمة، عفيف الرزاز، مؤسسة الابحاث العربية، الطبعة العربية الثالث، لبنان-بيروت، ١٩٩٩،ص ص٣١-٣٤.

سلاحەددین بیتار [٥٣]بیریان لە دامەزراندنی کرد و ساڵی ١٩٤٣ بە ساڵێکی وەرچەرخێنەر دادەنرێ لە دیرۆك و ژیانی ئەم حیزبەدا لەبەر ئەوەی لەو ساڵەدا وەك پارتێکی سیاسی سەریهەڵدا، کە خاوەن بیر و ئایدۆلۆجییەکی دیاریکرا بووە، ئامانجەکەی یەکێتی و ئازادی و ئیشتراکی بووە، و دروشمەکەی بریتی بووە لەوەی نەتەوەی عەرەب یەك نەتەوەیە و خاوەن پەیامێکی نەمرە.[٥٤]

لە ٤/نیسان/١٩٤٧دا یەکەم کۆنگرەی بە بۆنەی دامەزراندنی خۆی بەست[٥٥] و لەم کۆنگەرەیەدا، بڕیار لەسەر دەستووری حزب درا [٥٦]، یەکەم لقی حزبی بەعسی لە عێراق لە ساڵی ١٩٥٢ لەسەر ئامۆژگاری میشیل ئەفلەق دامەزرا [٥٧] و حیزبی بەعس لە ڕێگەی دوو کودەتای سەربازی (١٩٦٣ — ١٩٦٨) توانیان جڵەوی دەسەڵات بگرنەدەست.[٥٨] تێڕوانین و بۆچوونی حیزبی بەعس لە هەمبەر کورد و نەتەوە ناعەبەرەکان لە دەستوور و کۆنگرەو پرۆگرامەکانی ئەم حزبەدا، جێگای تێڕامان و هەڵوێستە لەسەر کردنە، چونکە هێڵە گشتی و ستراتیژیان لەم ڕووەوە دیاری کردووە؛ بەندی (٧) کە لە یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنیدا پەسەند کرا، بەم شێوەیەی خوارەوە سنووری عەرەب دیاری دەکات:

"نیشتیمانی عەرەب ئەو پارچە زەمینەیە کە نەتەوەی عەرەب تێیدا دادەنیشێ کە لە نێوان چیاکانی تۆرس (سنووری نێوان تورکیا — عێراق) و چیاکانی پشتکوە (سنووری نێوان

(٥٣) لە ساڵی ١٩١٢ لە دیمەشق لە دایك بووە، لە زانکۆی دیمەشق خوێندنی خۆی تەواو کردووەو پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندن ساڵی ١٩٤٣ چۆتە پاریس و پاشان کاری مامۆستایەتی کردووە لە دیمەشق، سەلاحەددین بەیتار لەگەڵ میشل ئەفلەق لە دیارترین دامەزرێنەری حزبی بەعس بوون، بڕوانە شیرزاد زکریا محمد، الحركة القومية فی كوردستان العراق، ٨ـی شباط ١٩٦٣، تموز ١٩٦٨، دراسة في التطورات السياسية الداخلية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية اداب، جامعة دهوك، ٢٠٠٥، ص ٣٠.

(٥٤)ا د.ئەلبیرت عیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤.

(٥٥) حنا بطاطو، العراق الشيوعيون والبعثيون و الضباط الأحرار....، ص ٣٤

(٥٦) شێرزاد زکریا محمد، مصدر سابق، ص٣٠.

(٥٧) حنا بطاطو، العراق الشيوعيون والبعثيون و الضباط الأحرار...،ص٥٠؛ د. ئەلبرت عیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣.

(٥٨) بڕوانە، د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص ١٦٠ — ١٦٨.



ئێران — عێراق) و کەنداوی بەسرە، دەریای عەرەب و چیاکانی حەبەشە و بیابانی گەورە و ئۆقیانوسی ئەتڵەنتیك و دەریای ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە." [٥٩]

بەم شێوەیە کوردستانی عێراق و باشووری سوودان، هەرێمی دارفور و خاکی ئەمازیقییەکان لە مەغریب بە بەشێك خاك و نیشتیمانی عەرەبستان دادەنێ، لە کاتێکدا ئەم خاکە موڵکی مێژینەی گەلان و نەتەوەکانی ناعەرەبن.

بەندی (١١)ی دەستووری بەعس دەڵێت : "هەر کەس داوای چوونەپاڵ دەستەیەکی ڕەگەزی بکات یاخود بە مەبەستی کۆلۆنیالیستی هاتبێتە ناوخاکی عەرەب، بۆ دژایەتی کردنی عەرەب، ئەوا لە نیشتیمانی عەرەب دەردەکرێت." [٦٠]

بەندی (١٥) ئاماژە بەوە دەکات کە: "پەیوەندی نەتەوەیی تاکە پەیوەندییە کە بوونی هەیە لە دەوڵەتە عەرەبیەکاندا، کە دەبێتە هۆی گرەنتی بۆ پێکەوە گونجاندنی نێوان هاووڵاتیاندا و تواندنەوەیان لە بۆتەی نیشتیمانی عەرەبیدا." [٦١]

هەروەها هەر لە نامیلکەی ئامانجەکان و مەبەستەکان (اهداف و غايات) کە لە ساڵی ١٩٤٥دا حزبی بەعس نووسیوویەتی تێڕوانین و بۆچوونی بەعس لەمەڕ کێشەی نەتەوەکانی ناعەرەب ڕوون و ئاشکرا دەکات و دەڵێت: "کەمە نەتەوە ناعەرەبەکان کە ناتوانرێ لە کۆمەڵی عەرەبیدا بتوێنرێنەوە و بە شێوەیەکی تەواو بە عەرەب بکرێن دەخرێنە ژێر یاسای تایبەتییەوە کە ئەرك و مافەکانیان بە شێوەیەکی وا دیاری دەکات کە نەتوانن زیان بە بەرژەوەندی عەرەب بگەیەنن و هەر بە بێگانەش دادەنرێن و مافی دەوڵەتی عەرەبیشە هەر کاتێ بیەوێ ئەوانەی زیان بە بەرژەوەندییان دەگەیێنن دەریان بکا." [٦٢] لەم ڕوانگەیەوە ئاشکرایە کە ڕوانین و بۆچوونی بەعسی بریتییە لە هەوڵدان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی لە گشت ئەو خاکەی کە عەرەبەکان دەستی بەسەردا گرتووە، بەو پێیەی کە خاکی عەرەبە و نکۆڵی دەکات لە بوونی نەتەوەکان و کەمە نەتەوەکان لە وڵاتانی عەرەبیدا، توانەوەی نەتەوەیی بەسەریاندا دەسەپێنێ، هەروەها نکۆڵی دەکات لە ماف و داخوازییەکانی

(٥٩) بڕوانە: دەستور حزب البعث العرب الاشتراكي العراقي في موقع الالكتروني:
http://www.albasra.net/ar_articles_2007/03/07…

(٦٠) بڕوانە، دستور حزب البعث العربی الاشتراكي فی العراق، مصدر نفسه.

(٦١) مصدر نفسه.

(٦٢) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٨.

گەل و نەتەوەکانی ناعەرەب لە وانە گەلی کورد، ئەمازیق لە مەغریب، باشوورییەکانی سوودان.[٦٣]

ئەوەی کە لە سەرەوە خستمانە روو، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە، کێشەی سەرەکی نێوان تەڤگەرا رزگاری خوازا کورد و حکوومەتەکانی عێراق لەمپەری پادشایەتییەوە تا ئەو پەڕی کۆمارییەوە بریتی بووە لەوەی کە نەتەوە و خاکی کوردستان بە بەشێکی دانەبڕاو لە نەتەوە و نیشتیمانی عەرەب زانیووە،. بۆیە بە هیچ شێوەیەك ئامادەنە بوونە دۆزی کورد لە گۆر پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین و راستییەکانی مێژوویی و جوگرافی چارەسەر بکەن. ئەوەش وایکردووە پەیوەندی نێوان کورد و حکوومەتەکانی عێراق تاکو رووخانی رژێمی بەعس لە عێراق خۆی لە بازنەیەکی ئاڵۆز و قەیراناویدا ببینێت. پێداگرتنی کورد لەسەر مافە نەتەوەییەکانی لە لایەك و رەتکردنەوەیان لە لایەن حکوومەتەکانی عێراقەوە لە لایەکی ترەوە بۆتە هۆی تەقینەوەی چەندین شۆڕش و راپەڕین لە کوردستانی عێراق کە لە شۆڕشی شێخ مەحموود دەستپێدەکات تا دەگاتە شۆڕشەکانی یەکەم و دووەمی بارزانی (١٩٣١ – ١٩٣٢)، (١٩٤١ – ١٩٤٥) و شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١ – ١٩٧٥) و شۆڕشی گوڵان (١٩٧٦-١٩٩٠)، کۆتایی پێ دێت بە راپەڕینی بەهاری (١٩٩١)، کە بەشێکی زۆری خاکی باشووری کوردستان رزگار کرا.[٦٤]

بە پشت بەستن بەو راستییانەی کە لە سەرەوە روونمان کردووە دەتوانین سەرەداوەکانی ئەو گرێیە بدۆزینەوە، کە بۆتە بەربەست لە بەردەم چارەسەری دۆزی کورد، ئەو راستییەی بۆمان ئاشکرا دەبێ کە بۆچی حیزبی بەعس دەستبەرداری بەشێکی زۆر گرنگی خاکی خۆی دەبێ بۆ وڵاتێکی هەرێمی لە پێناوی سەرکوتکردن و لە ناوبردنی کورد. لە راستیدا هەرچەندە حکوومەتەکانی عێراق لە رێگەی بە بەیاننامە و پرۆژەکانیانەوە بۆ وتووێژ لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کوردستان زاراوەکانی وەك هاوبەش کورد و عەرەب یان بە کارهێناوە، و پرۆژە و فۆرمە ناناوەندییان بە دەستپێشخەری و داهێنانی خۆیان لەقەڵەمداوە، بەڵام لە راستیدا هیچ هەنگاوێکی راستەقینە بە ئاراستەی سەلماندن و دابین کردنی مافە نەتەوەییەکانی

(٦٣) د.کاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردى فى كوردستان العراق، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الثانية، اربيل، ٢٠٠٥، ص ٤٩٦.

(٦٤) محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص ١٢٤ – ١٤٠.



گەلی کورد لە رووی پراکتیکی و کردارییەوە نەناوە[٦٥]، چونکە هیچ کاتێك تێڕوانین و بۆچوونەکانیان نەگەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە بە پێی بنەماو پێوەرەکانی مافی چارەی خۆنووسین هەڵسوکەوت لەگەڵ کورد بکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام هەوڵیان داوە لە سەر هەر دوو ئاستی تیۆری و پراکتیکی کوردستان بە گەل خاکەوە بە بەشێکی دانەبراوی نیشتیمانی عەرەب پیشان بدەن. گرنگترین ئەو سیاسەتانەی لە رووی پراکتیکییەوە پیادەکراوە؛ بۆ گۆڕینی سیمای دیموگرافی کوردستان و بە کەمینە کردنی کورد و کەمکردنەوەی رێژەی کورد بۆ نزمترین ئاست لە هەرێمی کوردستان و دانانی سنوورێکی کۆتایی بۆ قەبارەی کورد، دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە روونی بکەینەوە:

### یەکەم: سیاسەتی بەعەربکردن:

بە عەرەبکردنی کوردستان و هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ دارِشتنەوەی سیمای دیموگرافی و ئەثنوگرافیەکەی بەئاراستەی بەرژەوەندی نەتەوەیی عەرەب یەکێك لە ئامانجە هەرەسەرەکییەکانی حکوومەتەکانی عێراق بووە[٦٦]، دەسەڵاتدارەکانی عێراق هەر لە کاتی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە کەوتنە کار بۆ دارِشتنەوەی بونیادە جیاوازەکانی ئەم هەرێمە بە بەرگێکی عەرەبی، ئەویش لە رێی پرۆسەکانی بە عەرەبکردن و راگواستنی دانیشتووانەوە. بێگومان ئەم پرۆسانە لە قۆناغێك بۆ قۆناغێکی دی، لە رژێمێك بۆ رژێمێکی دی بە گوێرەی تواناو بەهێزی حکوومەتەکان لە رووی سیاسی و ئابووری و سەربازی و مرۆیی لە هەڵکشان و داکشاندا بووە، بەڵام لەگەڵ جێگربوون و خۆگرتنی دەسەڵاتی ناوەندی بە تایبەت لەسەردەمی حیزبی بەعس. زیاتر و هەمەلایەنەتر بیری لێ کردۆتەوە و توندوتیژتر و بەرفراوانتر پراکتیزە کراوە، لەبەر ئەوەی حیزبی بەعس لە روانگەیەکی ستراتیژییەوە بۆ مەسەلەکە چووە[٦٧]، بە شێوەیەکی گشتی پرۆسەی بە عەرەبکردن و راگواستنی کورد لە سێ تەوەری گرنگ ئەنجامدراوە:

١- تەوەری بادییە جەزیرە (لیوای موسڵ)، واتە سێکوچکەی تەلەعفەر – سنجار، حضر.

(٦٥) د. واحد عەمر محی الدین، سەرچاوەی پێشوو، ٢٠١.

(٦٦) د. خليل اسماعيل محمد، القضية الكوردية في العراق، وجود او حدود، اربيل، ٢٠٠٦، ص ٢٤.

(٦٧) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٩؛ فەرمان عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠ – ٣١.

٢- تەوەری کەرکوك.

٣- تەوەری رۆژهەڵاتی بەغدا، ئەو شوێنانەی کە کوردە فەیلییەکان تێدا نیشتەجێن بە تایبەت لە قەزاکانی (خانەقین، مەندەلی، بەدرە) [٦٨].

میکانیزم و شێوازەکانی پراکتیکی ئەم سیاسەتە، جۆراوجۆر و فرە رەهەند و فرە لایەن بووە و زیاتر لە میکانیزمێك بە کارهاتووە کە دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

١- نیشتەجێکردنی هۆزەکانی عەرەب لە سەر خاکی کوردستان (١٩٢٥-٢٠٠٣): لە دوای لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە، حکوومەتەکانی عێراق بە هەر دوو سەردەمی پادشایەتی کۆمارییەوە، بەردەوام هەولی نیشتەجێکردنی هۆزەکانی عەرەبیان داوە لە سەر خاکی کوردستان. بە تایبەت لەو شار و دەڤەرانەی کە لە رووی نەتەوەییەوە فرە پێکهاتەن بە تایبەت شاری کەرکوك، ئەمەش لە پێناوی دابەزاندن و کەمکردنەوەی رێژەی کورد لەم دەڤەرانە. لە پێناوی بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش چەندین پرۆژەی کۆمەڵگای نیشتەجێکردن بۆ عەرەبە هاوەردەکان دروست کران، لەوانە پرۆژەی حەویجە لە ساڵی ١٩٣٧ کە نزیکەی (٢٠) هەزار عەرەب لە دەڤەری کەرکوك نیشتەجێکران [٦٩] بێگومان، هەموو حکوومەتەکانی عێراق لە سەردەمی پادشایەتی و کۆماری، بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەم سیاسەتەیان پەیڕەو کردووە، بە تایبەت لە سەردەمی حیزبی بەعس.

٢-گۆڕینی نەخشەی جوگرافی و ئیداری شارەکانی کوردستان، بە تایبەت کەرکوك، لە پێناو کەمکردنەوەی رێژەی کورد و بەرزکردنەوەی رێژەی عەرەب، بۆیە حکوومەتەکانی عێراق لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعەرەبکردندا، هەوڵیانداو نەخشەی ئیداری و جوگرافی شارەکانی کوردستان بگۆڕن بە شێوەیەك لەگەڵ مەرام و پیلانە ستراتیجییەکانیان بگونجێ، لەم پێناوەدا

(٦٨) د. خلیل اسماعیل محمد و اخرون، الابعاد السیاسیة لخطة التعریب في اقلیم کوردستان العراق، گۆڤاری زانکۆ، گۆڤاری زانستە مرۆییەکانە زانکۆی سەلاحەددین دەری دەکات، هەولێر ژمارە (٢١) ئایار/مایس ٢٠٠٤ ص ٢١؛ د.خلیل اسماعیل محمد، مؤشرات سیاسة التعریب و التهجیر فی اقلیم کوردستان العراق، الطبعة الثانیة، اربیل ٢٠٠٢، ص ١٠؛ د. خلیل اسماعیل محمد، گۆڕینی سنووری ئیداری پارێزگای کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ژمارە (١) ساڵی شەشەم، شوباتی ١٩٩٨، ص ٤١ — ٤٦.

(٦٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.خلیل اسماعیل محمد و اخرون، مصدر سابق، ص ١٠.



قەزاکانی چەمچەماڵ، کەلار، کفری، دوزخورماتو، پردێ، لە شاری کەرکوك دابڕین و لکاندنی بە پارێزگاکانی دەوروبەرییەوە [٧٠].

٣ - راگواستن و کۆچ پێ کردنی کورد بە تایبەت لە ناوچە گرنگەکان، لە دوای ساڵی ١٩٧٥ رژێمی بەعس کەوتە هەڵمەتێکی ئۆرگانیزەکراوی راگواستنی دانیشتووانی کورد، نەك تەنیا لەو دەڤەرانەی کە پێکهاتەی ئیتنیکیان فرە جۆرن، بەڵکو لەو ناوچانەشدا کە کورد تێیدا زۆرینەی رەها بوو و لە کۆمەڵگا زۆرەملییەکاندا کۆی کردنەوە، سەرباری ئەم ئاراستەیەی راگواستن، ئاراستەیەکی دیکەی راگواستنی کورد لە لایەن رژێمی بەعسەوە پیادەکرا، کە بریتی بوو لە گواستنەوەیان بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق [٧١]، شێوازەکان راگواستنی کورد بە تایبەت لە دوای رێککەوتنامەی جەزائیر چەند تەوەرێکی ستراتیژی گرتەوە.

أ- راگواستنی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگری کردن لە عێراق.

ب- راگواستنی ناوچە نەوتییەکان.

ج- راگواستنی ناوچە سنوورییەکان.[٧٢]

(٧٠) عارف قوربانی، کرکوك و التطهیر العرقي من وثائق النظام البعثي، ترجمة، رعد بابان، الجزء الثاني، منشورات مکتب الفکرو التوعیة(ی-ن ك)، ٢٠٠٥، السلیمانیة، ص٨٠؛ د.خلیل اسماعیل محمد، مؤشرات سیاسة التعریب...، ص ٢٤؛ د.خلیل اسماعیل محمد و اخرون، مصدر سابق، ص ٢٠؛ ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٠.

(٧١) بروانە: د.محمد هماوەند، تهدید الأرض واللغة في کوردستان من هو المسؤل (دراسة سیاسیة-قانونیة)، الطبعة الاولی، مطبعة رامان، السلێمانیە ٢٠٠٣، ص ص١٦-٤١؛ غەفور مەخموری، بەعەرەبکردنی کوردستان (بە عەرەبکردن و مەترسییەکانی — بەرەنگاربوونەوەی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی دارا، هەولێر ٢٠٠٢ ل ٣٥ — ٤٥؛ شۆڕش حاجی، تعریبی کەرکوك، سیاسەتی تەعریب لە دوتوی هەشتا بەڵگەدا، وەزارەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٤، ل ٢٣.

(٧٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٥٣-٢٠٣ ١٥٣؛ فرمان عبدالرحمن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٥؛ شۆڕش حاجی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦.

٤- گۆڕینی ناوی قەزا و پارێزگا و قوتابخانە و شوێنەگشتییەکان و گەرەك و شەقام و ناوچە و دێهاتەکان بۆ ناوێکی نوێتر کە لە هەموو بارەکاندا دەلالەتێکی عەرەبی دەگەیاند، لە سەرووی هەموویانەوە گۆڕینی ناوی کەرکوك بە پێی ژمارەی (٤١) لە (١٩٧٦/١١/٢٩)، لە کەرکوکەوە بۆ پارێزگای (التأميم). [٧٣] بڕوانە، خشتەی ژمارە (٧).

| ژ | ناوی ڕەسەنی گەرەك | ناوی نوێ |
|---|---|---|
| ١ | گەرەکی ڕەحیماوا | حي الاندلس |
| ٢ | گەرەکی مەسلی | حي الخلفاء |
| ٣ | گەرەکی گاور باغی | حي عدنان |
| ٤ | گەرەکی ئازادی | حي النخوة |
| ٥ | گەرەکی پیر بادی | حي الصفا |
| ٦ | گەرەکی حەمام عەلی بەگ | الفارسي وحي الامراء |

خشتەی ژمارە (٧): گورێنی ناوی هەندێك لە گەرەك و ناوچە کوردنشینەکانی شاری کەرکوك.[٧٤]

٥- ناونووس کردنی کوردی یەزیدی و شەبەك، بە عەرەب، لە داتاو سەرژمێرییە فەرمییەکاندا و گرتنەبەری شێوازی توندوتیژی و سەرکوتکاری لە هەمبەریان و دوور خستنەوەیان لەسەر زەوی باب و باپیرایان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگا زۆرەملێیەکاندا و دەست بەسەرداگرتنی موڵك و سامانیان. [٧٥]

(٧٣) غەفور مەخموری، مصدر سابق، ص ٣٦.

(74) غەفور مەخموری، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

(٧٥) ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩؛ عارف قوربانی، مصدر سابق، ص٧٢- ٧٤.



| پارێزگا | کوردی ئیزدی | ئیزدی عەرەب |
|---|---|---|
| دهوك | ٢, ٤ | ٩٧, ٥ |
| بێنوی | ٠, ٣ | ٩٩, ٦ |
| سليمانی | ١٣, ٥ | ٧٨, ٥ |
| اربيل | ٦,٣٤ | ٤٤, ٩ |
| کرکوك | ١٩, ٨ | ٦٩, ٤ |
| سەلاحەدين | ٣٨, ٨ | ٥٤, ١ |
| ديالی | ٣٨ , ٦ | ٠,٥٠ |
| بەغدا | ٣٢, ٥ | ٦١ ,٣ |
| ئەنبار | ٢٠, ٤ | ٤٤, ١ |
| بابل | ٦٢, ٤ | ٣٦, ٦ |
| کربلا | ٦٦ , ٧ | ٣٣, ٣ |
| قادسية | ٥٨, ٥ | ٢٢, ٦ |
| مثنی | ١٤, ٣ | ٧١ ,٤ |
| ذي قار | ٣٠, ٨ | ٦٦ ,٧ |
| ميسان | ٦٥, ٥ | ٣٥ , ٠ |
| بەسرە | ٥٢, ٢ | ٣٩ , ٧ |

خشتەی ژمارە (٨) ناسنامەی ئیزدییەکان لە ڕووی نەتەوەییەوە، سالی ١٩٧٧[٧٦]:

هەروەك لە خشتەکەدا دەردەکەویت ڕژێمی بەعس بە مەبەستی بە عەرەبکردنی کوردستان کەمکرنەوەی ڕێژەی کورد، زۆربەی کوردی ئیزدی بە عەرەب ناونووس کرا بوون. بە ڕادەیەك ڕێژەی کوردی ئیزدی بە پییێ ئەم ئامارەی سەرەوە تەنها (١٪) پێك دەهێنا، لە کۆی کشتی ئیزدییەکانی عێراق. لە پاریزگاکانی کوردستانی عێراق (دهۆك، سلێمانی، اربیل و کرکوك) بە

(٧٦) د.خليل اسماعيل محمد، أقليم كوردستان العراق دراسات في التكوين القومي للسكان...، مصدر سابق، ص ص ٧٠.

شێوەیەکی پێوانەیی و سەر سووڕهێنەر ڕێژەی کوردی ئیزدی دابەزند بوو و شوناسی نەتەوەییان گوری بوو بۆ ناسنامەی عەرەبی.[77]

٦- دەرکردن و کۆچ پێکردنی کوردە فەیلییەکان (١٩٧٠-١٩٩٠) لە عێراق و ڕەوانەکردنیان بۆ ئێران، بە بیانووی ئەوەی وابەستەگی ئێرانن، بەجۆرە ژمارەیەکی زۆری کوردی فەیلی لە شارەکانی بەغدا، مەندەلی، مقدادیە، بەدرە و کوت و خانەقین، ڕەوانەی ئەودیوی سنوورکران. [78] بەم شێوەیە لە ساڵانی (١٩٧٠ — ١٩٩٠) نزیکەی (٤٠٠) هەزار و ساڵانی (١٩٨٠ — ١٩٩٠) نزیکەی نیو ملیۆن کوردی فەیلی ڕەوانەی ئێران کراون.[79]

٧- دانانی یاسای پێ دەوترێت یاسای ڕاستکردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی (**تصحيح القومية**)، کە بە بڕیاری (١٩٩) لە (٢٠٠١/٩/٦)دا لە لایەن حکوومەتی بەعسەوە دەرچوو، کە ئەمەش یەکێکە لە شێوازەکانی تر بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان، کە ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی لە کوردەوە بۆ عەرەبی، دەزگاکانی ڕژێم زۆر لەو کوردانەی لە دوای ڕاپەڕین لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون گوشاریان خستە سەر کە دەبێ یان ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن یان دەردەکرێن، لە هەمانکاتدا ڕژێمی عێراق بە هیچ شێوەیەك ڕێگای نەدەدا کەس ناسنامەی خۆی لە عەربییەوە بۆ نەتەوەیەکی تر بگۆڕێت[80].

## دووەم: شاڵاوەکانی ئەنفال و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی:

شاڵاوەکانی ئەنفال هەڵقولاوی، یاخود لە دایکبووی ڕۆژەکانی ئەنفال نەبووە، بەڵکو بەشێك بووە لە پیلان و نەخشە داڕێژراوەکانی حکوومەتی بەعسی عێراق وەك تەواوکردنی

(٧٧) بو زانیاری زیاتر بڕوانە: مصدر نفسه، ص ص٦٨-٧١.

(٧٨) د.خليل اسماعيل محمد، الكرد الفيليون بين حملات التسفير وسياسة التعريب، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٥، ص ص ٣٧-٤٢؛ د.کاظم حبيب، مەینەتی کوردە فەیلییەکانی عێراق، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە (٢٥) پاییزی ٢٠٠٢، ل ١١١؛ ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩، مراد حەکیم محمد، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسی ڕاگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٢٢.

(٧٩) وەرگێڕاوە لە: د.خليل اسماعيل محمد و اخرون، مصدر سابق، ص ٢٣.

(٨٠) غەفور مەخموری، ژێدەری پێشوو، ل ٥٩ — ٦٩؛ عارف قوربانی، مصدر سابق، ص ص ٩٢-٩٨.



قۆناغەکانی پێش ئەم پڕۆسەیە لە پێناوی کۆتایی هێنان بە بوون و دۆزی کورد لەبەر ئەمە قۆناغ بە قۆناغ جێبەجێ کراوە.[81]

ڕێکخراوی ( middle east lwhach) کە هەستاوە بە لێکۆڵینەوەی ٤٠٪ی بەڵگەنامەو دیکۆمێنت کە لە دوای ڕاپەڕین دەستیان بەسەرداگیراوە وا دەری خستووە کە پڕۆسەی ئەنفال کردنی کورد لە هەشت قۆناغەوە دەستی پێکردووە، قۆناغی یەکەم لە ٢٣/شوبات/١٩٨٨ دەستی پێکردووە و لە ٦/ئەیلول/١٩٨٨ کۆتایی پێهاتووە.[82]

لە پڕۆسەکانی ئەنفالدا، کە عەلی حەسەن مەجید ناوی لێنابوو، چارەسەری دۆزی کورد و لە ناوبردنی خراپەکاران [83]، بە چەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی، لەوانە چەکی کیمیاوی، کوردی پێ قەتڵ و عام کردوو لە میانەی پڕۆسەی ئەنفالدا نزیکەی (٢٥) جار چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی دژی خەڵکی سیڤیلی کوردستان بەکارهاتووە، دیارترینیان بۆردوومانکردنی شاری هەڵەبجە بووە لە (١٦/ئازار/١٩٨٨)دا.[84]

(٨١) د. خليل اسماعيل، محمد، القضية الكردية في العراق...، ص ١٣٨.

(٨٢)میدڵ ئیست ووچ / جینۆساید لە عێراق، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، وەرگێڕاوە : محمد حمد صالح توفیق، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٥٠-٥١.

(٨٣) عەلی حەسەن مەجید کوڕی مامی سەدام حوسێن بووە، لێپرسراوی حزبی بەعس بووە لە هەرێمی کوردستان لە کاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا، و بە بڕیاری (١٦١) لە (١٩٨٧/٣/٢٩) لە لایەن سەدامەوە دەسەڵاتی نائاسایی و ڕەهای پێدەدرێت، و هەر لەسەر فەرمانی ئەو چەکی کیمیای لە کوردستان بەکار هاتووە، دوای ئەوە بە عەلی کیمیاوی ناسرا. بڕوانە: د.جاسم توفیق خۆشناو، دخالەتی مرۆڤانە لە کوردستان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٨٠؛ د. جەبار قادر، مصدر سابق، ١٢٣ — ١٢٢. شایانی باسە لە دوای گۆڕانکارییەکان (٩)نیسانی ٢٠٠٣ دەستگیر کراوە لەسەر تاوانی ئەنفال دادگایی کرا و لە ٢٤ تەموزی ٢٠٠٧ بڕیاری لە سێدارەدانی بووی دەرچوو.

(٨٤) د.جاسم توفیق، جینۆسایدی کورد، مەسەلەیەکی ناوخۆیی نییە، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ژمارە (٣) تشرینی یەکەم سلیمانی، ١٩٩٢، ل ٢٠.

**سێیەم: جینۆسایدی گەلی کورد:**

جینۆساید بە واتایی کوشتن و فەوتاندن دێت. بەندی دووەمی پەیماننامەی ١٩٤٨ سەبارەت بە تاوانی جینۆساید دیاریکردووە بەوەی مەبەست لێی بریتییە لە قڕکردن یان قڕکردنی بەشێکی هەر گروپێکی نەتەوەیی — ئەتنی — رەگەزی، ئایینی.[٨٥]

پڕۆسەی لەناوبردن یاخود جینۆساید نموونەیەکی ڕەگ داکوتاوە، تەنها ڕێگەیەك هەیە کە بتوانرێت بەو هۆیەوە کۆمەڵێکی پەرت و بڵاو کاریگەرانە لەناو بەرێت ئەویش سێ ڕێگایە:

١- دەستنیشان کردنیان.

٢- کۆکردنەوەیان.

٣-گرتن و لەناوبردنیان.[٨٦]

حکوومەتی بەعسی عێراق لەمیانەی شاڵاوەکانی ئەنفال و زیندەبەچاڵکردنی هاوڵاتیانی سیڤیلی کوردستاندا گەورەترین تاوانی دەرهەق بە گەلی کورد ئەنجامداوە کە دەچنە خانەی قڕکردن و جینۆسایدەوە، لەوانە لە سێدارەدانی بە کۆمەڵ و شوێن بزرکردنی دەیان هەزار کەس و بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراو و گازی ژەهراوی کە ئەنجامەکانیان تەنیا لە میانەی ساڵانی ١٩٧٨ — ١٩٨٩ نزیکەی (١٨٢) هەزار کورد لە ناوچوون و زیاتر لە سێ هەزار گوندی کوردستان کە دەکاتە (٧٠٪)ـی خاکی کوردستان بە تەواوەتی کاول کران.[٨٧]

(٨٥) وەرگێڕاوە لە: مارف عمر گول، جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتیدا، چاپی سێیەم، لە بڵاوگراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) سلێمانی، ل ١٧ — ١٣.

(٨٦) میدڵ ئیێست وۆچ جینۆساید لە عێراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧.

(٨٧) عبدالرحمن سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ل ٢٢٦.



## باسی دووەم

## کاریگەری فاکتەرە نێودەوڵەتییەکان لەسەر دۆزی کورد

### لقی یەکەم: هەڵوێستی زلهێزەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان سەبارەت بە دابەشکردنی کوردستان:

لە میانەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ببوو بە جێگای چاوتێبڕینی وڵاتە زلهێزەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی، بۆیە لە گەرماوگەرمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کاتێك ئاسۆی سەرکەوتنی بەرەی رۆژئاوا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەسەر ئاڵمانیا و ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا دەرکەوت، فەڕەنسا و بەریتانیا و رووسیا کەوتنە گفتوگۆ و دانووستاندن لە نێوان خۆیاندا، بە مەبەستی داڕشتنی نەخشەیەکی نوێ بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دابەشکردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی و بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و ئابووری و سەربازی خۆیان لە دەڤەرەکەدا، بۆ ئەم مەبەستەش زنجیرەیەك رێککەوتننامەی نهێنی و ئاشکرا، مۆرکران کە ئەنجامەکەی بووە هۆی دابەشکردنی کوردستان و بێ بەشکردنی نەتەوەی کورد لە مافە نەتەوەییەکانی.

سەرەتای ئەم رێککەوتن نامانەش لە( سایکس بیکۆ)وە دەستی پێکرد، دوای چەندین گفتوگۆ و دانووستاندنی نهێنی نێوان هەر سێ دەوڵەتی بەریتانیا، فەڕەنسا، رووسیا، لە ژێر رۆشنایی بەرژەوەندی هاوبەش و دووبارە دابەشکردنی جیهان، یەکێك لە ترسناکترین رێککەوتننامەی نهێنی لە ساڵی ١٩١٦ مۆرکرا کە بە رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆ ناسراوە.[٨٨] بە پێی ئەم رێککەوتننامەیە، دەوڵەتی

(٨٨) بڕوانە: د.کمال مظهر أحمد، کوردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، الطبعة الثانیة، بغداد٣٠٣،١٩٨٤-٣١٠؛ م. س. لازاریف و اخرون، تاریخ کوردستان، ترجمه: عبدی حاجی، الطبعة الاول، مطبعة، حاجي هاشم. اربیل، ٢٠٠٦ ص ص ١٨٢-١٨٣؛ د. ئازاد نەقشبەندی، رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆ و کورد، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٧) ئابی (١٩٩٨)، ساڵی دووەم، ل ٥؛ د. کمال دیب، زلزال فی أرض الشقاق (العراق (١٩١٥-٢٠١٥) تقدیم جورج قرم، الطبعة الاولی، دار الفارابی، لبنان، ٢٠٠٣، ص ٥٧؛ د. صالح ملا عمر عیسی، بحران آفرینی ابرقدرتها در کردستان عراق، چاپ اول، کتابخانە ملی ایران، تهران،١٣٧٩، ص ص١٢٥-١٢٦؛ عمرالدیراوی، الحرب العالمیة الاولی، الطبعة السادسة،١٩٧٩، دارالعلم للملایین، ص٥٣٢.

عوسمانی کە بەشی هەرە زۆری کوردستان لە ژێر دەستی دابوو، نەخشە و پیلانی دابەشکردنی بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بۆ کێشرا، و رووسیا دەبوو دەست بەسەر پارێزگاکانی ئەرزەرۆم — ترابزۆن، وان، بتلیس لەگەڵ چەند ناوچەیەکی دیکە لە رۆژهەڵاتی باشووری ئاسیای بچووکدا بگرێت.[٨٩] هەروەها دەبوایە فەرەنسا دەست بەسەر پارێزگاکانی ئینتاب، ئورفا و ماردین و دیاربەکر و ویلایەتی موسڵ و هەروەها لوبنان، کەناری ناوەراستی دەریای سوور، ئەدەن و کلیکا دابگرێت [٩٠]؛ و بەریتانیاش بەشی عەرەبی عێراق واتا هەردوو ویلایەتی بەسراو بەغدای بەرکەوت لە سنووری ویلایەتی موسڵ تا کەنداوی عەرەبی و چەند ناوچەیەکی تر. [٩١] هەر بە پێی ئەم رێککەوتنە ئەو شوێنانەی کە دەکەونە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا دەتوانرێت چەند هەرێمێکی کۆنفیدراڵی عەرەبی یاخود سەربەخۆ دروست بکرێت.[٩٢]

بە خوێندنەوە و شیکردنەوەی بەندەکانی ئەم رێککەوتننامەیە دەردەکەوێ کە هەر لە سەرەتاوە دەوڵەتە زلهێزەکان، سەرقاڵی دابەشکردنی کوردستان بوون، گەلی کورد و نیشتیمانەکەی هەر لە سەرەتاوە بەپیێ بەرژەوەندی وڵاتە کۆلونیالیستەکان کەوتبووە بەر نەشتەرگەری دابەشکردنەوە، هەرچەندە رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆ وەك خۆی جێبەجێ نەکرا بە هۆی کەمبوونەوەی لایەنەکان و ئەو پێشهات و گۆرانکارییە سیاسییانەی کە لەسەر ئاستی ناوچەکە بە گشتی و نێودەوڵەتی بە تایبەتی روویاندا، بەڵام دەتوانین بڵێین تا رادەیەکی زۆر پابەند بوون بە بنەماکانی ئەم رێککەوتننامەیەوە.

ئاراستەو رەوتی رووداوەکان دوای ئەم رێککەوتنە وایکرد چەندین جار هەموار بکرێت و گۆرانکاری تێدا بکرێت بە تایبەت دوای گۆرانکارییەکانی سیاسی لە رووسیا و روودانی

(٨٩) بروانە: د ئازاد نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦؛ محسن محمد متولي، مصدر سابق، ص ٨٥؛ جواد مولا، کوردستان و الکورد وطن مقسم و امة بلا دولة، الطبعة الثانية، تقديم جمال نەبەز، دار الحكمة — لەندەن، نیسانی ٢٠٠٣، ص ٦٥؛عمر الديراوي، مصدر سابق، ص٥٢٣.

(٩٠) بۆ زانیاری زیاتر بروانە: د.ئازاد نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦؛ م.س.لازاريف، المسألة الكوردية (١٨٩١ — ١٩١٧)، ترجمە: اكبر احمد، من منشورات مركز كوردستان للدراسات الاستراتيجية، الطبعة الاولى، السليمانية ٢٠٠١، ص ٤٨٠؛ د.حامد محمود عيسى، القضية الكوردية فى توركيا، الطبعة الاولى، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ١٠٨.

(٩١) د. فاصل حسين، مصدر سابق، ص٧.

(٩٢). د.ئازاد نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦.



شۆرشی ئۆکتۆبەر١٩١٧، کە یەکێتی سۆڤییەت ویستی خۆی وەك ئاراستەیەکی نویێ پیشان بدات کە سیاسەتیان جیاوازە لەگەڵ دەوڵەتە سەرمایەدارەکان، کەوتە ئیدانەکردنی فەرەنساو بەریتانیا و بەندەکانی ئەم رێککەوتننامەیەی ئاشکرا کرد.[٩٣]

بە کشانەوەی رووسەکان لە رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆ، هەلێکی باشی دایە دەست بەریتانیا بۆ دەست بەسەر داگرتنی باشووری کوردستان، و توانی لە رێگەی کۆمەلێك مانۆری سەربازی و سیاسی و دیبلۆماسی، هەرێمەکە لە ژێر چنگی فەرەنسا دەربهێنێ.[٩٤] ئەمە دەسپێکی دابرینی کوردستانی عێراق بووە لەو بەشەی کوردستان کە لەژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو.

دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان بۆ بەدەسیهێنانی پشتگیری نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لە رێگەی چەندین راگەیاند و بڵاوکراوەدا جەختیان لەسەر مافی چارەی خۆنووسینیان دەکرد و بەڵێنی ئەوەیان دابوو کە رێز لە ئیرادەی گەلانی چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی دەگرن بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان.[٩٥]

لە دوای شۆرشی ئوکتۆبەری ١٩١٧، لینین راپۆرتێکی بڵاوکردەوە دەربارەی پرۆسەی ئاشتی و سەقامگیری جیهان، لەم راپۆرتەدا جەختی کردە سەر دابینکردنی ئازادی بۆ سەرجەم گەل و نەتەوەکانی جیهان و داگیرکردنی نیشتیمان ی نەتەوەکان و بە زۆر لکاندنی بە ناڕەوا پێناسە کرد.[٩٦]

(٩٣) د. عزيزالحاج، القضية الكردية فى العشرينات، الطبعة الثانية، الموسسة العربية للدراسات والنشر، بغداد، ١٩٨٥، ص15.

(٩٤) رينية موربيس، كردستان او الموت، ترجمة: جرجيس حسن فتح اللة، الطبعة الثانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل،١٩٩٩، ص٤٥؛ محسن محمد متولى، مصدر سابق، ص ٨٥؛ د.حامد محمود عيسى، القضية الكوردية فى توركيا...، ص ١٠٨.

(95 ) هنرى فوستر، مصدر سابق، ص ص ١٣٦-١٣٧.

(٩٦) وەرگێراوە لە: د.مارف عومەر گوڵ، مەسەلەی کورد لە رێککەوتن نامە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی؛ ژمارە (٢)، ساڵی چواردەهەم، ئابی ٢٠٠٦، سلیمانی، ل ٩٥؛ جليلى جليل واخرون، مصدر سابق، ص ١٠١.

هەروەها سەرۆکی ئەوکاتی ئەمریکا (ویلسن) لە ١٩١٨/١/٨ دا چواردە بەندەکەی خۆی بلاّوکردەوە کە بەندی (١٢)ی دەربارەی ئازادی گەلانی ژێر دەسەلاّتی عوسمانی بوو، تێدا هاتبوو، دەبێ نەتەوەکانی ناتورکی ژێر دەسەلاّتی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی مافی گەیشتن بە سەربەخۆیی بۆ دابین بکرێ [97]،کە ئەمە کوردیشی دەگرتەوە.[98]

لە لایەکی ترەوە لە ١٩١٨/١١/٧، بەریتانیا و فەڕەنسا، بلاّوکراوەیەکی هاوبەشیان ڕاگەیاند و بەڵێنی سەربەستی گەلانی ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانییاندا، بەو پێیەی بە ئازادی و مافی چارەی خۆنووسین بگەن.[99]هەموو ئەم بەڵێن و لێدوانانە وای لە گەلانی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو، لەوانە کورد، کە هەوڵبدەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ و گەیشتن بە مافەکانی[100]، هاوکات لەگەڵ بەستنی کۆنگرەی ئاشتی [101] کە نزیکەی ساڵێك درێژەی کێشا، بۆ دیاریکردنی چارەنووسی هەردوو دەوڵەتی ئەڵمانیا و عوسمانی، بە پشت بەستن بە بەڵێننامەی زلهێزەکان سەبارەت بە ماف و چارەی خۆنووسینی گەلان و ڕێزگرتن لە ئیرادەی نەتەوەکان، شەریف پاشا[102] بە نوێنەرایەتی کورد بەشداری لەم کۆنگرەیەدا کرد و داوانامەیەکی گرنگی بە ناوی گەلی کوردەوە پێشکەش کرد، داوای پێکهێنانی لیژنەیەکی

---

(٩٧) وەرگێڕاوە لە: عبدالرحمن ادریس صالح البابانی، الشیخ محمود الحفید"البرزنجی"والنفوذ البریطانی فی کردستان العراق تقدیم، د. کمال مظهر أحمد،الطبعة، الثانیة، مطبعة شڤان، السلیمانیة، ٢٠٠٧، ص١٥٥.

(٩٨) م. لازاریف المسألة الکوردیة(١٩٢٣-١٩٤٥) النضال و الاخفاق، ترجمة: د. عبدي حاجي، الطبعة الاولی، اربیل، ٢٠٠٧، ص٧٠.

(٩٩) بڕوانە: هنری فوستر، مصدر سابق، ص١٣٦؛ بیار مصطفی سیف الدین، السیاسة البریطانیة تجاه ترکیا واثرها فی کوردستان (١٩٢٣-١٩٢٦)، الطبعة الاولی، مطبعة وزارة التربیة، ٢٠٠٤، ص ص٦٠-٦١.

(١٠٠) عبد الرزاق الحسنی،،مصدر سابق، ص٢٨٠؛ هنری فوستر، مصدر سابق، ص١٣٦.

(١٠١) کۆنگرەی ئاشتی لە کانوونی یەکەمی١٩١٩ تا ئاداری١٩٢٠ درێژەی کێشا ئەم کۆنگرەیە لە پێناوی دیاریکردنی چارەنووسی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئەڵمانیا بووە و گەلانی ژێر دەسەلاّتیان، هەرچەندە کۆنگرەکە نەگەیشتە بڕیاری کۆتایی سەبارەت بە بابەتەکان بە تایبەت ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست، بەلاّم لە بەیاننامەی ئەم کۆنگەرەیەدا دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بڕیاری جیاکردنەوەی (ئەرمینیا، کوردستان، سووریا، میزۆپۆتامیا، فەلەستین، دورگەی جەزیرەی عەرەبی) لە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی درا. لەو کۆنگرەیەدا شەریف پاشا وەك نوێنەری کورد، بەشداری کرد، پاش ئەوەی شەریف پاشا توانی لەگەڵ نوبار پاشا نوێنەری وەفدی ئەرمەنی توانیان بگەنە ڕێککەوتن لە کانوونی یەکەمی ١٩١٩ و ڕێککەوتن لەسەر یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکانیان بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە و بە شێوازی دیبلۆماسی، هەردوو لایەن دوو یادداشت نامەو نەخشەی کوردستان و ئەرمەنستان پێشکەش بە کۆنگرەکە کرد لە ئازاری ١٩٢٠، شەریف پاشا و نوبار پاشا یادداشت نامەیەکی تریان ئاراستەی کۆنگرەکە کرد لە پاریس و هەروەها لە چوارچێوەی ئەو ڕێککەوتنەی کە هەردوو لایەنی پێ گەیشتبوون و لە دواییدا هاوپەیمانان ڕەزامەندیاندا لەسەر داخوازییەکانیان کە لە دواییدا لە ڕێککەوتننامەی سیڤەردا خۆی دیتەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: م. س. لازاریف و اخرون، تاریخ کوردستان، مصدر سابق، ص ص ١٩٤-١٩٥ د.حامد محمود عیسی، القضیة الکوردیة في العراق من الاحتلال البریطاني الی الغزو الامریکي(١٩١٤-٢٠٠٤) الطبعة الاولی، مکتبة مدبولي ص ص ١٠٢ – ١٠٩؛ نادر انتصار، مافیای قدرت و دفن دمکراسی، بررسی ناسیونالیسم قومی- نژادی کردها، ترجمە: عرفان قانعی فرد، چاپ اول، تهران، ١٣٨٥، ص ص١٦٦-١٦٧؛ د.حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة فی الشرق...،ص٥٧؛ روهات ألاکوم، شریف پاشا، سنوات عاصفة لدیبلوماسی کوردی، ترجمة: شکورمصطفی، الطبعة الاولی، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٤، ص ص١١٣-١٢٣ صالح محمد حسن بادي، شریف پاشا، حیاته ودوره السیاسی، رسالة ماجستیر غیر منشورة، جامعة دهوك،٢٠٠٤، ص١٥٦، شایانی باسە هەندێ لە سەرچاوەکان ماوەی گرێدانی ئەم کونگرەیە لە ١٨کانوونی دووەمی ١٩١٩ تا٢١ کانوونی دووەم١٩٢٠ لە قەڵەم دەدەن بڕوانە: د.مارف عومەر گوڵ، مەسەلەی کورد لە ڕێککەوتن نامە....، ل ل٩٦-٩٨؛ عبد الرحمن ادریس صالح البابانی، مصدر سابق، ص ص١١٨، د.کمال مظهر أحمد، مصدر سابق، ص ٣٢٨-٣٣٠.

(١٠٢) شەریف پاشا: لە ماوەی (١٨٦٥ –١٩٥٢) ژیاوە، کوڕی سەعید پاشایە، لە بنەڕەتدا شەریف پاشا خەڵکی کوردستانی عێراقە لە هۆزی بابانییەکانە کە هۆزەکی بەناوبانگ و ناوداری شاری سلێمانییە و مولازم بووە لە سوپای عوسمانداو پاشان بووە ژەنەڕاڵ لە سوپای عوسمانیدا، لە ساڵی ١٨٩٨ بووە سەفیری دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید، لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی شەریف پاشا لەلایەن (جمعیة تعالي کوردستان) کە لە ساڵی ١٩١٨ دامەزرابوو دەستنیشانکرا بۆ سەرۆکایەتی کردنی شاندی کورد لە پاریس و بەشداری لە کۆنفڕانسی ئاشتی کرد، و بە هەوڵ و تەقەلاّی شەریف پاشا توانی لە پەیمانی سیڤەردا، لە ماددکانی (٦٢,٦٣,٦٤) چارەسەرێك بۆ دۆزی کورد دابنێ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.فوئاد حەمە خورشید مستەفا، القضیة الکوردیة في المؤتمرات الدولیة، مطبعة وزارة الثقافة، الطبعة الاولی، ٢٠٠١، اربیل، ص ص ٣٣ – ٤٦؛ روهات ألاکوم، مصدر سابق، ص ١٨ و ٣١ومابعدها؛صالح محمد حسن بادي مصدر سابق، ص ص١٢٣-١٣٢.

نێونەتەوەیی کرد بۆ ئەوەی لە دۆزی کورد بکۆڵنەوە و ئەو سنوورانەی کە زۆربەی دانیشتووانی کوردن لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی کوردیدا یەك بخەن. [١٠٣]

بەڵام ئەوەی هەست پێدەکرا لە کۆنفرانسی ئاشتیدا، پیلانی دابەشکردنی کوردستان دارێژرابوو، چونکە لەم کۆنگرەیەدا بە شێوەیەکی جیا و سەربەخۆ باسی کوردستان نەدەکرا، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی سەیر دەکرا و هەندێ جاریش دۆزی کورد پەیوەست دەکرا بە دۆزی یاخود پرسی دەوڵەتی ئەرمەنییەوە و بەشێکی زۆری کوردستان خرابووە سەر ئەو دەوڵەتە ئەرمەنییەی کە بڕیار بوو دروست بکرێت. [١٠٤] ئەم پیلانەی وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان سەبارەت بە کوردستان و دابەشکردنی، لە کۆنفرانسی (سان ریمۆدا ٢٥ نیسانی ١٩٢٠)دا زیاترو دیارتر هاتە بەرچاو، کاتێك بڕیار درا بۆ دامەزراندنی چەند دەوڵەتێك لەوانە (عێراق، سووریا، لوبنان، ئوردون، عەرەبستان، فەلەستین) وخرانە ژێرماندێتی بەریتانیا و فەرەنسا وە.[١٠٥] بەڵام ئامادە نەبوون کوردستان وەك ئەم دەوڵەتانە بخرێتە ژێرماندێتی خۆیانەوە، چونکە بوونی کوردستانێکی یەکگرتوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان نەدەگونجا.

(١٠٣) د. عبد الفتاح علي یحیی البوتانی، وثائق عن الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة، الطبعة الاولی، موسسة موکریانی للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠١، ص١٤؛ مـارف عومەر گوڵ، مەسەلەی کورد لە رێککەوتننامە...، ل ل ٩٦ — ٩٧؛ عەبدولڕەحمان سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ص ص ٤٦ — ٤٧.

(١٠٤) عەبدولڕەحمان سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ص ٥١.

(١٠٥) کۆنفرانسی سان ریمۆ لە ١٩ — ١٩٢٠/٤/٢٦ لە ئیتاڵیا بەسترا لە نێوان دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، لەم کۆنگرەیەدا بە شێوەیەکی تێروتەسەل باسی کوردستان کراو، لەم کۆنفرانسەدا پڕۆژەیەك بۆ چارەسەری دۆزی کورد دانرا کە هەمان پرۆژە بووە بەردی بناغەی پەیمانی سیڤەر، فەرەنسا و ئیتاڵیا رازی بوون لەسەری و لەم کۆنفرانسەدا بەریتانیا باشووری کوردستان لە فەرەنسا وەرگرت بەرامبەر بە پێدانی ٢٠٪ی بەرهەمەکانی نەوت، بە شێوەیەکی گشتی پڕۆژەی رێککەوتننامەی سان ریمۆ، پڕۆژەیەکی کۆلۆنیالیستی بووە لەبەر ئەوەی کوردستان پارچە پارچە دەکرد، و لە هەمان کۆنگرەدا کە مانداب بەسەر دەوڵەتانی عێراق، فەلەستین، ئوردن، سووریا، سەپاند، بەڵام کوردستان نەخرایە ژێر ماندابەوە، بەڵکو چارەنووسی کوردستان و ئەرمەنستان، بە تەواوەتی یەکلا نەکرا، بەڵام لە دواتردا، واتە لە پەیمانی سیڤەردا چارەسەرییەکی کۆتایی بۆی دانرا کە پشت بە رێککەوتننامەی سان ریمۆ دەبەستێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محسن محمد المتولی، مصدر سابق، ص ص ٨٧ — ٩٠.



لە لایەکی ترەوە لەو کاتەدا بەریتانیا هەوڵەکانی خۆی چڕکردبووە بۆ خزاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە. ئیسماعیل بێشکچی سەبارت بە کاریگەری کۆنگرەی سان ریمۆ بەسەر دۆزی کوردەوە ئاماژە بە وە دەکات کە" کێشەی سەرەکی کورد و کوردستان لە کۆنگرەی (سان ریمۆ نیسانی ١٩٢٠) دەستپێدەکات، ئەگەر ئەو سەردەمە ماندێتێکی کوردستانی سەر بە ئینگلتەرە یان سەر بە فەرەنسا دامەزرابایە، ئەوە مەسەلەی کورد کە تا ئەمڕۆ بێ چارەسەرکردن درێژ بۆتەوە و رۆژ بە رۆژ دژواتر دەبێ کێشەیەکی ئەوەندە گران نەدەبوو." [١٠٦]

لە راستیدا چارەنووسی کوردستان دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کەوتبوو بەردەم بیروڕای جیاجیا و دەوڵەتە زلهێزەکانی وەك بەریتانیا و فەڕنسا لە روانگەی بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە سەیری دۆزەکەیان دەکرد؛ بەڵام هەموویان لەسەر یەك خاڵ هاورا و هاوبیر بوون، کە ئەویش بریتییە لەوەی کە دەبێ کوردستان دابەشبکرێ و رێ بگرێ لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی سەرتاسەری یەکگرتوو بە هەر چوار پارچەوە.[١٠٧] بۆیە هەر لە کۆنفرانسی ئاشتیدا رێگەیان گرت لە وەی کە داخوازییەکانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بگەیێنێتە کۆنفرانسەکە.[١٠٨] لە لایەکی ترەوە لە کۆنفرانسی ( سان ریمۆدا نیسانی ١٩٢٠)، ئامادە نەبوون کوردستان وەك عێراق، ئوردن، فەلەستین و سووریا و لوبنان بخەنە ژێر ماندابەوە. لە دوای کۆنگرەی (سان ریمۆ نیسانی ١٩٢٠)، ئاراستەو رەوتی رووداوەکان بە جۆرێك بوو، کە دابەشکردن و پارچە پارچکردنی کوردستان لە ئەگەرە هەرە بەهێزەکان بووە، لە دواییشدا هەروا دەرچوو لە ١٩٢٠/٨/١٠ دا کە پەیمانی سیڤەر مۆرکرا[١٠٩] ؛ بە شێوەیەکی کۆتایی

(١٠٦) چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ ئیسماعیل بێشکچی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (٢)، سلێمانی، ژمارە (٢)، ٢٠٠٥، ل ١٧٩.

(١٠٧) کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٦.

(١٠٨) ناسر حەفید و ئەوانی تر، یاداشنامەی شێخ محموودی حەفید، چاپی یەکەم، چاپخانی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٥٤؛ مارف عومەر گوڵ، مەسەلەی کورد لە رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی... ل ٩٦.

(١٠٩) عبدالرزاق الحسنی، مصدر سابق، ص٢٨٠؛ باسیلي نیگیتین، الکرد، دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، ترجمة: د.نوری طالبانی، الطبعة الثالثة، مؤسسة حمدی للطباعة و النشر،٢٠٠٧،ص ص١٣٠-١٤١“ د.حامد محمود عیسی، المشکلة الکردیة فی الشرق: ص ٥٩، رینیە مورییس، مصدر سابق، ص٤٣؛ محەمەد ئەمین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ئامادەکردن رفیق سالح بەرگی چوارەم، چاپخانەی

چارەسەرێکی بۆ دانرا و سیستەمێکی سیاسی دیاریکرد، بۆ خۆبەڕێوەبردنی گەلی کورد بەپێی ڕێژەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین لەو چوارچێوەیەی کە لە پەیمانی سیڤەردا، بۆ کورد تەرخانکرابوو خۆی لە بەندەکانی (٦٢,٦٣,٦٤) دا دیتەوە بەم شێوەیە خوارەوە:

بەندی (٦٢): لیژنەیەك کە بریتی دەبێ لە نوێنەرانی هەر سێ دەوڵەتی بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا لە ماوەی شەش مانگ دوای بەڕێوەبردنی ئەم پەیمانە گەلاڵەیەکی خودموختاری بۆ ئەو دەڤەرانەی کە زۆرینەی دانیشتووانی کوردن و دەکەونە ڕۆژهەلاتی فوڕات و باشووری سنووری ئەرمینیا و سەرووی سووریا و میزۆپۆتامیا دادەڕێژن، ئەم پرۆژەیە یاخود گەلاڵەیە، پێشکەش بەو دەوڵەتانە دەکرێ کە خۆیان لە بەڕێوەبردنیدا بە بەرپرس دەزانن، هەروەها دەبێ پاراستنی گیانی کەمایەتییەکانی وەکو (کلدانییەکان و ئاسوورییەکان) بە تەواوەتی لەبەر چاو بگیرێ. هەروەها کۆمیتەیەك لە نوێنەرانی دەوڵەتانی بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ئێران و کوردەکان پێکدێ، پرۆژەکە هەڵدەسەنگێنن و ئەگەر پێویست بوو پێداچوونەوەی تێدا دەکەن، هەر ئاڵوگۆڕییەك کە بە پێی ئەم پەیمانە لە سنووری تورکیا بکرێ، ئەوا ئەو ئاڵوگۆڕانە لەگەڵ سنووری ئێران یەکتر دەخوێننەوە.[110]

وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١٨٩. شایانی باسە ئەم پەیمانە لە شاری سیڤەر کە شارە کە لە نزیك پاریس پایتەختی فەڕەنسا مۆرکرا لە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا، ئیتالیا، یابان، بەلـژیکا، یۆنان، رومانییا، پۆرتوگال، چك وسلوڤاکیا، یوگسلاڤیا، حجاز و ئەرمەنییا، لە لایەك و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەلایەکی ترەوە. ئەم پەیمانە لە (١٣)دەروازە و(٤٣٣) بەند پێکهاتبوو. بروانە : د.کمال مظهر أحمد، کوردستان في سنوات الحرب..، ص٣٤٤؛ م. س. لازاريف و اخرون، تاريخ كوردستان،..ص ص١٩٥ ١٩٦.

(١١٠) د. فاصل حسين، مصدر سابق، ١٣" د. شاكر خصباك، مصدر سابق، ص٤٠" علاء الدين سجّادی، تاريخ جنبشهای كردستان، مترجم، رئوف كريمی، چاپ اول، چاپخانه رستمخانی، تهران، ١٣٨١، ص ص٧٧-٧٨" صلاح سعداللة، المسألة الكردية فی العراق، مكتبة مدبولی، الطبعة الاولی، القاهرة، ٢٠٠٦، ص٧٧؛ حوسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠١، ل ل ٢٢٨ — ٢٢٧، د.گوینتەر دیشنەر، کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدر لێکراو، وەرگێر حەمەکەریم عارف، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٩٩، ل ٧٤.



بەندی (٦٣): دەوڵەتی عوسمانی هەر لە ئێستاوە بەڵێن دەدات بە پەسندکردنی بڕیارێن هەردوو کۆمیسیۆن یاخود لیژنەکانی کە لە بەندی (٦٢) ئاماژەی پێکراون و لە ماوەی (٣) مانگ دوای راگەیاندنی فەرمی دەخرێنە واری پراکتیکییەوە.[111]

بەندی (٦٤): لەم بەندەدا کۆمەڵێك مەرج دانراون بۆ سەربەخۆیی بەشێك لە کوردستان کە لە پەیمانی سیڤەردا ئاماژە پێکراوە:

١. ئەگەر هاتوو زۆرینەی کوردەکانی ئەو ناوچانەی کە لە بەندی (٦٢) ئاماژەیان پێکراوە داوای سەربەخۆییان کرد.
٢. ئەگەر کۆمەڵەی گەلان گەیشتە ئەو باوەڕەی کە کوردەکان شیاوی ئەم مافەن، تورکیا بەڵێن دەدات ئەم راسپاردانە پەسند بکات و دەست بەرداری هەموو مافەکانی خۆی دەبێ لەم دەڤەرە.
٣. ماوەی ساڵێك دانرابوو، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بەندە.

هەروەها لەم بەندەدا ئاماژە بەوەکرابوو، ئەگەر کوردەکانی ویلایەتی موسڵ ویستیان بە دڵخوازی خۆیان بچنە پاڵ ئەم حکوومەتە، هاوپەیمانەکان هیچ چەشنە پێشگیری یاخود ڕێگرییەك ناکەن.[112]

بەم شێوەیە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی یاسای نێودەوڵەتییدا، بەڵگەنامەیەکی یاسایی، سیاسی باسی لە کێشەی کورد کرد و ڕێگەچارەیەکی بۆ دانرا، سەرەڕای گرنگی ئەم پەیمانە لەو کات و ساتەدا و دانان بەوەی کورد مافی خۆیەتی خۆی بەڕێوە ببات، و بڕیار لەسەر

(١١١) د.كمال مظهر أحمد، كوردستان في سنوات الحرب..، ص ٣٤٧؛ م. س. لازاريف و اخرون، تاريخ كوردستان..، ص ١٩٦؛ علاء الدين سجّادی، ڤیشین، ص٧٨.

(١١٢) عبد الرزاق الحسني، مصدر سابق، ص٢٨٠؛ د عزيز الحاج، مصدر سابق، ص٣٦؛ علاء الدين سجّادی، پیشین، ص ٧٨؛حوسێن مەدەنی سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٢٨ — ٢٢٩؛ د.حسين بديوي، مصدر سابق، ص ٦٢؛ د.گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٧٤ — ٧٥؛ أرشاك سافر الستيان، الكرد وكردستان، ترجمە: د.احمدخليل، دار هيرو للنشر الطباعة، الطبعة الاولی، بيروت،٢٠٠٧، ص١٢٣؛ د.عبد الفتاح علی يحيی البوتانی، مصدر سابق، ص١٥؛ د. حامد محمود عيسی، المشكله الكرديه فی الشرق...، ص ٥٩.

چارەنووسی خۆی بدات.[١١٣] بەڵام بە تێڕامان و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی بەندەکانی دەردەکەوێ کە خودی ئەم پەیمانە کوردستان بەرەو دابەشبوون دەبرد و پارچە پارچەی دەکرد.[١١٤] لەم پەیمانەدا جوگرافیای کوردستان زۆر بەرتەسك و تەنگ کرابووەوە، کە بەشێکی کەمی خاکی کوردستانی دەگرتەوە [١١٥] کوردستانی ئێرانیش بە تەواوەتی دوورخرابوو لە هاتنە ناوەوەی ئەم حکوومەتە [١١٦]، وێڕای تەگەرەو کۆسپ و ئەو ئاستەنگانەی خرابوۆنە بەردەم پراکتیزەکردنی بەندەکانی پەیوەند بە دۆزی کوردەوە، کە بۆ هیچ حکوومەتێکی تازە دامەزراو ئەو مەرجانە دانەنرابوون. [١١٧] سەبارەت بە ویلایەتی موسڵیش ( باشووری کوردستان) بە شێوەیەکی پەراوێزی باسی لێ کردبوو.

هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی پەیمانی سیڤەر بەم هەموو کەموکوڕییەوە وەك هەندێك پێی دەڵێن بە مردوویی لە دایك بوو[١١٨]؛ ململانێ و ناکۆکی لە نێوان وڵاتە زلهێزەکان بە تایبەت بەریتانیا، فەرەنسا، رووسیا، ئەمریکا روو لە هەڵکشانێکی توندی کردبوو. لەم هەلومەرجە ناجێگیر و ناسەقامگیرەدا، تورکیای کەمالی کە وەك دەوڵەتێکی بەهێز سەری هەڵدابوو توانی لە ناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان سوودی لێ ببینێ [١١٩]و سەمت و ڕەوتی ڕووداوەکان بە ئاراستەی پووچەڵ کردنەوەی پەیمانی سیڤەر ببات.

ڕووسیا کە لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر، وای خۆ پیشان ئەدا کە سیاسەتێکی نوێ لەسەر ئاستی جیهان بە گشتی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی پەیڕەو دەکات، بە شێوەیەك گونجا و هاوتەریب بێ لەگەڵ مافی چارەی خۆنووسینی گەلان، کاردانەوەیەکی نێگەتیڤی هەبوو لە هەمبەر پەیمانی سیڤەر و بە هەرەشەی دەزانی لەسەر بەرژەوەندییەکانی خۆی، بۆیە چەندین کەناڵی سیاسی و دیبلۆماسی لەگەڵ کەمال ئەتاتورك کردەوە، ڕووسیا کە لە ساڵی ١٩١٨ بە

(١١٣) م.لازاریف المسألة الكوردية (١٩٢٣-١٩٤٥) مصدر سابق، ص٧٧.

(١١٤) مارف عومەر گوڵ، مەسەلەی کورد لە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی....، ٩٩.

(١١٥) شۆڕش حسن عمر، مصدر سابق، ص ٤٠.

(١١٦) د.حامد محمود عيسى، القضية الكوردية في توركيا....، ص ص ١٦٤ — ١٦٦.

(117) د.كمال مظهر أحمد، كوردستان في سنوات الحرب..، ص٣٤٤.

(١١٨) عبد الرحمان ادريس صالح البابانی، مصدر سابق، ص١٧٧.

(١١٩) شۆڕش حسن عمر، مصدر سابق، نفس صفحه.



پێی ڕێککەوتننامەیەك [١٢٠] وازی هێنابوو لەو بەشەی کە بۆی دیاریکرابوو لە ( سایکس بیکۆ)دا کە بەشێکی زۆری کوردستانی باکوور دەگرێتەوە، ئەوا لە دوای پەیمانی سیڤەر لە ڕووی سەربازییەوە یارمەتی مستەفا کەمالیدا و دانی نا بە تورکیای کەمالیدا. [١٢١]

بێگومان ئەم هەڵوێستەی ڕووسیا کاریگەری خراپی کردە سەر چارەنووسی پەیمانی سیڤەرو ڕۆڵێکی کارای هەبوو بە ئاراستەی هەڵوەشاندنەوەی. لە لایەکی ترەوە فەرەنسا کە بەریتانیا فێڵێکی گەورەی لێکردبوو ویلایەتی موسڵی لە ژێر چنگی دەرهێنا بوو بە بەستنی پەیمانی (فرانکین بۆیو، تشرینی یەکەم ١٩٢١) لەگەڵ کەمالییەکان درزێکی گەورەی خستە ناو ڕیزی هاوپەیمانان، چونکە یەکێك لە گرنگترین ئەو دەوڵەتانەی پەیمانی سیڤەری مۆرکردبوو لێی دەرچوو، ئەمەش بووە هۆی بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و سەربازی کەمالییەکان.[١٢٢]

ئەم ناکۆکی و ململانێیە لە نێوان وڵاتە زلهێزەکاندا لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لە لایەك هەروەها دەرکەوتنی بزووتنەوەی نەتەوەیی تورکی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال [١٢٣]و ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستی هێنا. [١٢٤] لەلایەکی ترەوە بوونە هۆی گۆڕینی هاوکێشە سیاسییەکان سەردەمی پەیمانی سیڤەرو کاریگەری گەورە و ڕاستەوخۆی کردە سەر بەهێزبوونی پێگەی سیاسی و سەربازی و دارایی، حکوومەتی تازە

(١٢٠) لە ساڵی ١٩١٨ ڕێککەوتنی ( برست لتوفسك) لە نێوان روسیا و تورکیا بەسترا، بە پێی ئەم ڕێککەوتن نامەیە، روسیا هێزەکانی خۆی لە تورکیا کێشایەوە، بۆ پشت ئەو هێڵە سنوور کە پێش شەڕی یەکەمی جیهانی هەیبوو، بڕوانە، حامد محمود عیسی، القضیة الكردية في تركيا...، ص ١٠٩؛ م. س. لازاريف و اخرون...، تاريخ كوردستان، ص ص١٨٥-١٨٦.

(١٢١) د. عبدالجبار قادر غفور، تركيا المعاصر، في : د. خليل ابراهيم احمد و اخرون، تركيا المعاصر، مركز الدراسات التركية، الموصل،١٩٨٣ ، ص ص ٣٤ — ٣٥.

(١٢٢) بڕوانە: د. محمد طه الجاسر، تركيا ميدان الصراع بين الشرق و الغرب، دار الفكرة، دمشق ٢٠٠٢، ص ص ٢١١-٢١٢.

(١٢٣) د.كمال مظهر أحمد، كوردستان في سنوات الحرب..، ص٣٤٩- ٣٥٠؛ بیار مصطفى سيف الدين،مصدر سابق، ص ٦٩.

(١٢٤) عبد الرزاق الحسني، مصدر سابق، ص٢٨٠؛ د.عبد الفتاح علي يحيى البوتاني، مصدر سابق، ص١٥.

دامەزراویی مستەفا کەمال کە لە ١٩٢١/٤/٢٣دا ڕاگەیەنرا بوو[١٢٥] و هانی مستەفا کەمال دا کە هەوڵەکانی خۆی چڕتر بکات بۆ پێداچوونەوە بەپەیمانی سیڤەر بەستنی پەیماننامەیەکی تر بە شێوەیەك بەرژەوەندییەکانی ڕەچاو بکات. لە بەرانبەر ئەم پێشهات و گۆڕانکارییە نوێیانەدا دەوڵەتە گەورەکان بەتایبەت بەریتانیا کە لە بنەڕەتدا شتێکی ئەوتۆیان بۆ کورد پێ نەبوو و لە بنەڕەتدا بیریان لە سەربەخۆیی کورد نەدەکردەوە،[١٢٦] کەوتنە دانووستاندن لەگەڵ مستەفا کەمال، لە ئەنجامدا ڕێککەوتن نامەی لۆزان لە نێوانیاندا مۆرکراو، و بە بەستنی ڕێککەوتن نامەی لۆزان لە ٢٤/تەمموز١٩٢٣دا [١٢٧]، شتێك بە ناوی سەربەخۆیی کوردستان لەگۆڕێ نەما، زلهێزەکان پشتیان لە دۆزی کورد کرد، بەڵام چارەنووسی باشووری کوردستان یەکلایی نەکرابوو، هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی لە ماوەی (٩) مانگ سنووری نێوان هەردوولا دیاری بکرێت بە ڕەزامەندی هەردوولا، بەڵام دوای ئەوەی لەو ماوەیەدا نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك[١٢٨]، ئەوا کێشەکە خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان و لە ١٩٢٥/١٢/١٦دا بڕیاری لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە درا.[١٢٩]

بەم شێوەیە دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان بە تایبەت بەریتانیا و فەڕەنسا، بەرپرسی سەرەکی دابەشبوونی کوردستان بوون. بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان کوردستانیان بەسەر دەوڵەتانی عێراق و سووریا و تورکیا و ئێران دابەشکردوو و کردیانە تەواوکەری کیانی سیاسی ئەم چوار

(١٢٥) گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥.

(١٢٦) د.کمال مظهر احمد، کوردستان في سنوات الحرب...، ص ٣٤٨.

(١٢٧) سي. جي. ادموندز، کرد و ترك و عرب، سياسة و رحلات و بحوث عن الشمال الشرقی من العراق(١٩١٩-١٩٢٥)، ترجمة: جرجيس فتح الله،٢٠٠٧، ص ٣٤٧؛ م. لازاريف المسألة الکوردية (١٩٢٣-١٩٤٥) النضال و الاخفاق..، ص ٧٠؛ علاء الدين سجّادی پيشين، ص٨٦؛ د. گۆينتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٥.

(١٢٨) عبد الرزاق الحسني، مصدر سابق، ص ص ٢٧٢-٢٧٣.

(١٢٩) د. فاصل حسين، مصدر سابق، ص ٢١٨؛ م. لازاريف المسألة الکوردية(١٩٢٣-١٩٤٥) النضال و الاخفاق..، ص ٧٠؛ عبد الفتاح علي يحيى البوتاني، مصدر سابق، ص٤٢؛ باسيلی نيگيتين، مصدر سابق، ص٣٢٩؛ بيار مصطفى سيف الدين، مصدر سابق، ص ص١٣٣-١٣٤؛ محەممەد ئەمین زەکی بەگ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩١.



دەوڵەتە و تەنانەت حازر نەبوون کوردستان لە پلەی وڵاتی کۆلۆنیدا بهێڵن. [١٣٠]، بەمەش ئەگەر دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان بە تایبەت بەریتانیا هەمبەر گەلان سیاسەتی (پەرتکە و زاڵبە)ی بەکاری هێنابێ، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم سیاسەتە سەبارەت بە کورد مەترسیدارترو ترسناکتر بووە. کە بریتی بووە لە (پەرتکە و زاڵبە و لەناوبەرە). [١٣١]

(١٣٠)حوسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژییەتی دەوڵەتان، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٤٢٣.

(١٣١) چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ ئیسماعیل بێشکچی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ( دۆسیەی تورکیا گوڤار)، ژمارە (١)، سلێمانی، مایسی ٢٠٠٥، ل ١٠٣.

**لقی دووەم: ململانێی دوو جەمسەری سەردەمی جەنگی سارد و کاریگەری لەسەر کوردستانی عێراق:**

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤییەت وەك دوو جەمسەری براوەی زلهێزی نوێ دەرکەوتن. ئەمەش قۆناغێك بوو بۆ لاواز بوونی رۆڵی زلهێزە تەقلیدییەکانی جیهان (بەریتانیا، فەرنسا و ئەڵمانیا). و سەرەتایەك بوو، بۆ دەسپێکردنی قۆناغێکی نۆی لە پەیوەندییەکان، کە قۆناغی جەنگی سارد ( the cold war و سیستەمی دوو جەمسەری بوو، لە نێوان بلۆکی سۆسیالیستی بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤییەت و بلۆکی رۆژئاوا بە سەرۆکایەتی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە تیادا هەر دوو جەمسەرەکەدا هەوڵیانداوە شکست بە لایەنی بەرامبەر بهێنن. لە میانەی جەنگی ساردا رۆژهەلآتی ناوەراست ببۆوە گۆرەپان و مەیدانی سەرەکی ململانێ و زۆرانبازی نێوان هەردوو زلهێزەکە، بە هۆی ئەوەی ئەم دەڤەری گرنگییەکی مەزنی هەیە لە رووی جیوپۆلیتیکی و ئابووری و سیاسییەوە.[١٣٢]

لە دوای هەڵگیرسانی شۆرشی (١٤) تەموز لە عێراق، ئەم ولآتە ببوو یەکێك لەو دەڤەرە گرنگەکانەی کە لە لایەن هەردوو جەمسەرەوە زۆرانبازی لەسەر دەکرا. لە چوارچێوەی عێراقیشدا کوردستان وەك پانتاییەکی جوگرافی و سیاسی و خاوەن بارستەیەکی جیوستراتیژی، لەم هاوکێشەیەدا رۆڵێکی گرنگ و بنەرەتی دەگێرا بەتایبەت لە دوایی هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلولەوە ساڵی١٩٦١.[١٣٣]

لە دوای رووخانی حکوومەتی عبدالکریم قاسم لە شباتی١٩٦٣ [١٣٤]، عێراق زنجیرەیەك کودەتای سەربازی بە خۆوە دیت، هەر کودەتایەکیش حکوومەتێکی نوێ لەگەڵ خۆیدا هێنا، بێ گومان ئەم بارودۆخە ناسەقامگیر و ئاڵۆزە رێگای خۆشکرد بە ئەوەی بەعسییەکان بۆ

(١٣٢) بروانە د. محمد علي حوت، مفهوم شرق اوسط وتاثيرها علي الامن القومي العربي، مكتبة مدبولي، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣، ص ص٩-١١؛ د. خليل حسين، النظام العالمي ماضيا و مستقبلا، منطق القوة بمفاهيم جديدة و، اساليب اكثر قسوة، في الموقع الكترونى:
http:www.mafhoum.com/press3/95p10.htm

(١٣٣) د. جاسم تۆفیق خۆشناو, مەسەلەی کوردویاسای نیودەولەتان، بەلآوکراوەکانی سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٢ ، ل٣٩٩.

(١٣٤) حنا بطاطو، العراق الشيوعيون والبعثيون و الضباط الأحرار...،ص ص(٨٨ و٢٨١).



جاری دووەم لە ساڵی ( ١٩٦٨ ) دەسەلآت بگرنە دەست.[١٣٥] لە دوای هاتنی بەعسییەکان بۆ سەر کورسی دەسەلآت قۆناغێکی تری شەر (١٩٦٩ — ١٩٨٨) نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و حکوومەتی عێراق دەستی پێکرد، بەلآم شکست و تێکشکانەکان هەر زوو بەعسییەکانی هێنایە ئەو بروایە یاخود گەیشتنە ئەو راستییەی کە درێژەدان بە شەر ئەوا چارەنووسیان لە حکوومەتەکانی پێش خۆیان باشتر نابێت، بۆیە بە هۆی ئەو ئەزموونەی کە وەریانگرتبوو ئاراستەی سیاسەتی خۆیان گۆری. ئاماژەکانی گۆرانکاری لە سیاسەتی حکوومەتی بەعس بە دەرکەوتن، و لە کانوونی دووەمی ١٩٦٩دا کە کۆنگرەی هەفتەمی حیزبی بەعس بەسترا بەشێکی بۆ لێکۆلینەوە و گەنگەشەکردنی دۆزی کورد تەرخانکرد.[١٣٦]

د. سعد ناجی جواد، سەبارەت بەم هەلۆیستەی حکوومەتی بەعس دەلێت :"خاڵی وەرچەرخان کە وای لە حکوومەتی بەعس کرد بگەرێتەوە سەر مێزی دانووستاندن و هەوڵ بدات لە رێگای ئاشتی و دیالۆگەوە بگاتە رکەوتنێك، لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردایەتی شۆرش، خۆی لە چەند خاڵێکدا دەبینێتەوە لەوانە: سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، و توانای دەست وەشاندنی لە بۆریە نەوتییەکانی کەرکوك لە کاتی پێویستدا؛ هەروەها زۆر بوونی کێشەی عێراق لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت و هەرەشە و گوشارەکانی ئێران بۆ سەر عێراق." [١٣٧] هەروەها هەلۆەشاندنی رێکەوتن نامەی ١٩٣٧ لەگەڵ عێراق کە بە پێ ئەم رێککەوتن نامەیە عێراق مافی کۆنترۆل کردنی ئاوی رێرەوی کەنداو (مر الشط العرب) هەبوو.[١٣٨]

لە لایەکی ترەوە سەرکردایەتی سیاسی کورد ئەم هەنگاوەی حکوومەتی بەعس بە ئاراستەی چارەسەری دۆزی کورد بە فاکتەرەکی ئەکتیڤ و شیاوی دەزانی بۆ کۆتایی هاتن بە ناکۆکی و ململانێیەکان و گەیشتنی کورد بە مافە نەتەوەییەکان، بۆیە دانووستاندن و گفتوگۆ لە نێوان هەر دوو لا دەستی پێ کرد و لە میانەی دانووستاندنەکاندا یەکێتی سۆڤییەت ئەم

(١٣٥)، مصدر نفسه، ص٣٨٩ ومابعدها.

(١٣٦) د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ١٣٧.

(١٣٧) د. سعد ناجي جواد، العراق و المسالة الكردية ( ١٩٥٨ — ١٩٧٠ ) دارالسلام، ( لندن ١٩٩٠ )، ص ١٥٧.

(١٣٨) حنا بطاطو، العراق، الشيوعيون والبعثيون و الضباط الأحرار...،ص٤٠٥.

هەڵەی قۆستەوە و وەك ناوبژیوان هاتە مەیدان و رۆڵێکی گرنگی گێڕا لە بەیەکگەیاندنی هەردوو لا و ئەنجامەکەی رێککەوتننامەی ( ١١ ) ی ئاداری لێکەوتەوە.[١٣٩]

ئەم رێککەوتنە گرنگییەکی زۆری هەبوو لەو کات و ساتەدا، چونکە بناغەیەکی دانا بۆ گەیشتن بە یەکەم نەخشەکێشانی سنووری نیشتیمانی و نەتەوەیی کورد لە عێراقدا، لە بەندەکانی رێککەوتن نامەکە ئاماژە بەوە کرابوو کە دەبێ دەستووری کاتی عێراق دەست کاری بکرێت، بە شێوەیەك ئاماژە بەوە بکات کە عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی کورد و عەرەب پێك دێت، هەروەها حکوومەتی عێراق پابەند کرا بوو بەوەی کە پێویستە ئیجرائات وەربگرێ بۆ ئەوەی ئەو یەکە ئیداریانە و پارێزگایانەی زۆرینەی کورد تێدا نیشتەجێن یەك بگرن.[١٤٠] هەروەها بۆ دیاریکردنی سنووری هەرێمی ئۆتۆنۆمی پشت بە سەرژمێرییەك سپێردرابوو کە دەبوو لە ماوە (٦) مانگدا ئەنجام بدرێت.[١٤١]

ئەم رێککەوتننامەیە جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ نەبوو، واتە ماوەیەکی دیاریکراو دانرا بۆ پراکتیزەکردنی تەواوی بەندەکانی رێککەوتننامەکە کە بە قۆناغی ڤەگۆهێزەر دەناسرێ و ماوەکەی چوار ساڵ بوو. [١٤٢]

رێککەوتننامەی ( ١١ ) ی ئادار سەرکەوتنێك بووە بۆ سیاسەتی یەکێتی سۆڤییەت لەسەر ئاستی جیهان بە گشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی. لە سەر ئاستی عێراقیش لە دووای شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨دا گەورەترین دەستکەوت بوو بۆ ئەوان.[١٤٣] چونکە

(١٣٩) عومەر نورەدینی، سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد، کوردستانی عێراق وەك نموونە (لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری سیاسییە)، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٩٨.

(١٤٠) بڕوانە: م. س. لازاریف و اخرون، تاریخ کوردستان، ٣٠٦-٣٠٨، ص ٢٠٣؛ د. خلیل اسماعیل محمد، رێککەوتننامەی ١١ ی ئادار و دیاریکردنی نیشتیمانێك بۆ نەتەوەی کورد لە عێراقدا، خەبات ژمارە (٢٤٣٤)، بەرواری ١١-٣-٢٠٠٧.

(١٤١) کرێس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەم دا، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، حەمە کەریم عارف، چاپخانەی: شڤان، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٣٦٠.

(١٤٢) کرێس کۆچێرا، بزووتنەوەی کورد و هیوای سەربخوی، وەرگێڕان لە فارسییەوە، ئەکرەمی میهرداد، سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٣٤.

(١٤٣) عومەر نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.



سەقامگیربوونی عێراق و چارەسەری دۆزی کورد پێگەی یەکێتی سۆڤییەت لە عێراق و دەڤەرەکە قایمتر و بەهێزتر دەکرد، بە تایبەت ئەو کات ئاراستەی سیاسەتی حکوومەتی عێراق روو لە یەکێتی سۆڤییەت بوو. هەر لە بەر ئەمەش رۆژێك لە دوای جاردانی رێککەوتننامەی ١١ ی ئادار ( لیوند بریجنیف ) سکرتێری گشتی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤییەت، نامەیەکی تایبەتی ئاراستەی مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد، تێیدا هاتبوو: " بە ئاسوودەیی و خۆشحاڵییەکی زۆرەوە هەواڵی ئیمزا کردنی رێککەوتننامەی چارەسەری کێشەی کوردمان بە شێوەیەکی ئاشتییانەیی پێگەیشت بە بۆنەی ئەم دەستکەوتە مێژووییەوە جوانترین پرۆزباییتان لێ دەکەم، رێکەوتن لە سەر چارەسەری دۆزی کورد لێدانێکی گۆشەندەیە لە داگیرکەران و کۆنەپەرستان."[١٤٤]

بەم شێوەیە دەبینن رەهەندی نێودەوڵەتی خۆی خزاندبووە ناو ململانێی نێوان کورد و حکوومەتی عێراق و ئەم گرنگی دانەی یەکێتی سۆڤییەت بە دۆزی کورد مەبەست و ئامانجی تایبەتی خۆی هەیبوو، و دەیویست پێگەی سیاسی و ئابووری و سەربازی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست قایم بکات.

بەڵام ئەوەی روون و ئاشکرا بوو، سۆڤییەت پێش هەموو شتێك بەرژەوەندی خۆی لا مەبەست بوو وەك هەموو دەوڵەتەکانی تر سیاسەتەکانی کە پەیڕەوی دەکرد بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بوو، هەمیشە بەرژەوەندییەکانی لە پێش پرەنسیپەکانی بوو.[١٤٥] هەر ئەمەش وایکرد هاودژی و دووسەرییەکی زۆری هەیبوو لە هەڵوێست و سیاسەتەکانی بەرامبەر دۆزی کورد. لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، رووسیا هەڵوێستەکی نێگەتیڤی هەبوو بەرامبەر دۆزی کورد، بە هۆی ئەوەی پەیوەندییەکی باش و بەتینی هەبوو لەگەڵ عبدالکریم قاسم، بەڵام هاوکات لەگەڵ کەوتنی حکوومەتی قاسم، گۆڕینی هاوکێشە سیاسییەکان هەڵوێستی رووسیا بە ئاراستەی پشتگیری کردنی کورد گۆڕانکاری بەسەر داهات. [١٤٦]

(١٤٤) وەرگێڕاوە لە: مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، ثورة ايلول (١٩٦١– ١٩٧٥)، الجزء الثالث، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٢، ص ٢٤٧.

(١٤٥) مصدر نفسه، ص ٣٧٥.

(١٤٦) د. حامد محمود عيسى، المشكله الكرديه في الشرق...، ص ٢١٩.

لە ساڵی **١٩٦٣** یەکێتی سۆڤییەت بە شێوەیەکی پراکتیکی لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی پشتگیری کوردی کرد، بەتایبەت کاتێك گەلی کورد ڕووبەڕووی کۆمەڵکوژی گەورە هات لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە.

لە تەموزی **١٩٦٣**دا بە پاڵپشتی یەکێتی سۆڤییەت نوێنەری مەنغولیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان یادداشتنامەیەکی پێشکەش بە ئەنجوومەنی ئاسایش کرد، و داوای لێکرد کە لێکۆڵینەوەیەك لە سەر دۆزی کورد لە عێراقدا ئەنجام بدات، بەڵام لە دوایدا هەر بە ئیشارەتی یەکێتی سۆڤییەت مەنغولیا ئەم یاداشتنامەی خۆی کێشایەوە بە هۆی ئەو گوشارانەی خرایە سەری لە لایەن دەوڵەتانی عەرەبییەوە.[١٤٧] بە شێوەیەکی گشتی یەکێتی سۆڤییەت لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە سەیری دۆزی کوردی دەکرد، گرنگیپێدانیشی لەبەر ئەوە بووە بە ئەلتەرناتیڤەکی باشی دەزانی لە حاڵەتی گۆڕانی بارودۆخ و هاوکێشە سیاسییانەی عێراق، بە شێوەیەك هاودژ و ناکۆك بێ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی.

ئەوکات یەکێتی سۆڤییەت هەوڵی ئەدا بۆ پچڕاندن و شکاندنی ئەو گەمارو و دورپێچییەی کە ئەمەریکا بە هاوکاری دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی دژی بە کاریان دەهێنا، لە ڕێگەی ئەو ڕێککەوتنانەی کە لە نێوانیان دەبەسترا بۆ بەر بەرەکانی کردن لەگەڵیدا ( وەك پەیمانی بەغدا ١٩٥٥، پەیمانی سنتو١٩٥٩) بۆیە یەکێتی سۆڤییەت دەیویست بێ بەش نەبێ لە گێڕانی ڕۆڵێکی کاریگەر و ئەکتیڤ لە ناوچەکەدا. [١٤٨]و هەروەها هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی عێراق بکاتە هاوپەیمانی خۆی و لە جەمسەری ڕۆژئاوای دوور بخاتەوە.

بێگومان خۆرەپێشکردنی جەمسەری سۆسیالیستی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کاریگەری ڕۆڵ و دیبلۆماسییەتی ئەم جەمسەرە بۆ لێك نزیك کردنەوەی هەر دوو لایەنی کوردی و عەرەبی کە ئەنجامەکەی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئاداری لێکەوتەوە. هەمووی ئەمانە ببوونە هۆی هەراسان کردن و ترساندنی جەمسەری ڕۆژئاوای لیبرالی و هاوپەیمانەکانی. بۆیە شای ئێران بە هاندان و پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، هەوڵ و تواناکانی خۆیان خستەگەڕ بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و حکوومەتی بەعس و

(١٤٧) مسعود البارزانی، مصدر سابق، ص ٣٧٤.

(١٤٨) **مث** امین قادر، قضایا القومیات و اثرها علی العلاقات الدولیة ( القضیة الکردیة نموذجا )، مرکز کوردستان للدراسات الاستراتیجیة، الطبعة الاولی، السلیمانیة، ٢٠٠٣، ص ١٥٣.



هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئادار. بۆ ئەم مەبەستەش شای ئێران بەر لە ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەکە پەیامێکی تایبەتی بۆ مستەفا بارزانی ڕەوانە کرد، و هانیدا کە ڕێکەوتنەکە هەڵبوەشێنتەوە، و شەڕ لەگەڵ بەعس ڕانەگرێ، لە بەرامبەر ئەمەش شای ئێران بە ناوی خۆی و حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە پەیمان و بەڵێنی هاوکاری زۆری پێدا.[١٤٩] بەڵام سەرکردایەتی سیاسی کورد سووربوونی خۆی لە سەر پابەند بوونی بە ڕێککەوتنامەکە بە شای ئێران ڕاگەیاند.[١٥٠]

لە بەرامبەردا، حکوومەتی بەعس پابەندی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئادار نەبوو، زۆربەی کات وەك حکوومەتەکانی پێش خۆی گفتوگۆ و دانووستاندن وەك پیلان و تەکنیك و گەمەی سیاسی و بە فیڕۆدانی کات بۆ بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و سەربازی خۆی بەکاری دەهێنا، هەر بۆیەش زۆری پێ نەچوو کەوتە پێشل کردن و پشتگوێ خستنی بەندەکانی ڕێککەوتننامەی ( ١١ )ی ئادار، و تێکدانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد و پیلانی تیرۆرکردنی بارزانیان داڕشت. [١٥١] لە ئۆکتۆبەری **١٩٧٠** بەغدا بڕیاریدا سەرژمێری کە هەردوو لا لە سەری ڕێککەوتبوون بۆ دیاریکردنی سنووری ناوچەی خودموختاری بە ئەنجام نەگەیەنێت، ڕێگای گرت لە بە دەستهێنانی ڕێگا چارەیەك یاخود دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ ئەو کێشانەی کە هێشتا ڕێکەوتنی لە سەر نەکرابوو، بە تایبەتی دەربارەی چارەنووسی کەرکوك و ناوچە نەوتییەکانی کوردستان. [١٥٢]

لە هەمانکاتدا سیاسەتی بە عەرەبکردنی ناوچە کوردنشینەکانی دەوروبەری و نێو خۆی کەرکوك و تەواوی ناوچە نەوتییەکان بە دەست و برد بەڕێوە دەچوو و تەواوی کرێکارانی کورد لە مەڵبەندە نەوتییەکانی کەرکوك دەرکردن.[١٥٣]

(١٤٩) مسعود البارزانی، مصدر سابق، ص ٢٣٦.

(١٥٠) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.

(١٥١) علي سنجاري، القضية الكوردية و حزب البعث العربي الاشتراكي في العراق، الجزء الاول، الطبعة الاولى، مطبعة، حاجي هاشم، اربيل ٢٠٠٦، ص ٤٤.

(١٥٢) کرێس کۆچێرا، بزوتنەوەی نەتەوەی کورد...، ل ٣٥.

(١٥٣) جاناتان ڕاندڵ، بەم هەمموو تاوانەوە لێبوردنی چی، وەرگێڕان سەلاحدین ئاشتی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٣، ل ٢١١.

هەروەها پرۆژەی ئەتۆنۆمی سەرکردایەتی شۆڕشی ڕەت کردەوە، کە لە ( ٩ )ی ئازاری ١٩٧٣ پێشکەش کرابوو بە گوێرەی ڕێککەوتننامەی ( ١١ )ی ئادار پێویست بوو گفتوگۆی لە سەر بکرێت [١٥٤].

لە لایەکی ترەوە حکوومەتی بەعس کەوتە دابڕینی ڕووبەرێکی فراوان لە خاکی کوردستان و خستینە سەر ئەو ناوچانەی کە سەر بە ناوەندن و پێوەی لکاندن. ئەو ناوچانەی بریتی بوون لە پارێزگای کەرکوك و قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و شەنگار و شێخان و کفری و توزخورماتوو ئاکرێ و زومار کە ڕووبەرەکەی بە ( ٣٩٩٣٨ کم ) مەزەندە دەکرا لە کاتێکدا سەرجەم ڕووبەری کوردستانی عێراق (٧٤٠٠٠ کم) ە.[١٥٥]

لە سەر ئاستی دەرەکیش بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی سۆڤییەت، و پەلکێش کردنی یەکێتی سۆڤییەت بۆ ناو ئەو بەرەیەی کە ڕژێم دەیویست دروستی بکات دژی کورد، ڕێگەی دا بە کەشتییەکانی یەکێتی سۆڤییەت کە دەروازە ئاوییەکانی عێراق لە کەنداو بە کاربهێنن، و مافی کار کردنیان لە کێڵگەی نەوتی ڕومیلەی پێ بەخشین، لە ئەنجامدا هاوکاری و پەرەسەندنی پەیوەندی دیبلۆماسی نێوان هەردوو گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرز کە بووە هۆی ئیمزاکردنی پەیمانی دۆستایەتی نێوان هەردوولا. (کۆسگین) سەرۆك وەزیرانی سۆڤییەت لە نیسانی ١٩٧٢ خۆی هات بۆ عێراق و ئیمزای کرد. [١٥٦]

بەستنی پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری نێوان هەردوولا بووە هۆی بەهێزبوونی پێگەی سەربازی و سیاسی و ئابووری حکوومەتی بەعس، یەکێتی سۆڤییەت چەك و فڕۆکەی زۆر پێشکەوتوو بە عێراق بەخشی، بەم شێوەیە لە ڕووی سەربازییەوە چەك و تەقەمەنی زۆر پێشکەوتووی دەستکەوت، هەروەها یەکێتی سۆڤییەت هانی حزبی شیوعی عێراقیدا کە هاوپەیمانی ببەستێ لەگەڵ حکوومەتی بەعس و هەڵوێستێکی دژایەتی وەربگرێ بەرامبەر کورد.[١٥٧] لە١٧ ی تەموزی ١٩٧٣ دا، بەرەی نیشتیمانی بە سەرکردایەتی حزبی بەعس و بە

(١٥٤) د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ل ٢١٢.

(١٥٥) عومەر نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠.

(١٥٦) مسعود البارزانی، مصدر سابق، ص ٢٨٢.

(١٥٧) علی سنجاری، مصدر سابق، ص ٥٠. حنا بطاطو، العراق،الشیوعیون والبعثیون و الضباط الأحرار...، ص ص ٤٢٤-٤٢٥



هاوپەیمانی حزبی کۆمۆنیستی ڕاگەیانرا[١٥٨]، سەرکردایەتی شۆڕش مەرجەکانی خۆی بۆ چوون ناو ئەم بەرەیە بەستەوە بەوەی کە عێراق پابەندی بەگشت بەندەکانی ریککەوتننامەی (١١)ی ئادار و دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی کە لە پێشدا لە سەری ڕێکەوتون. هەروەها بەشداریکردنی ڕاستەقینەی هەموو حیزبەکانی ناو بەرەی نیشتیمانی لە کاروباری بەڕێوەبردنی وڵاتدا و گەڕانەوەی دیموکراسییەتی ڕاستەقینە بۆ وڵات و هەڵبژاردنی گشتی و ئازاد لە عێراق ئەنجام بدرێ.[١٥٩]

خۆماڵی کردنی نەوت لە لایەن عێراق و بەستنی ڕێککەوتننامەی دۆستایەتی لەگەڵ سۆڤییەت و پابەندبوونی عێراق بە دوژمنایەتی کردنی ئیسرائیل، هەمووی ئەم پێشهاتە سیاسییانە تا دەهات واشنتۆن و تەهرانی هەراسانتر دەکرد، لەم بارەیەوە ( هنری کیسنجر )ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەڵێت : "عێراق یەکێك بوو لەو ناوچانەی زۆرانبازی لە سەر دەکرا ئەویش لەبەر لوتی شای ئێران بوو، هەروەها عێراق لە دوای سعودییە دەوڵەمەندترین سەرچاوەی نەوتە و بەند بوو بە پەیوەندی سیاسی ڕۆژهەڵاتیمانەوە، لێرەوە مەترسی تێکچوونی هاوسەنگی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕستداو بە تایبەتی لە کەنداودا سەریهەڵدا،سەیر نەبوو کە عێراقی ژێر ڕکیفی سەدام حسێن بێتە دەست و پێوەندێکی نزیکتر بۆ یەکێتی سۆڤییەت." [١٦٠]

بۆ دورخستنەوەی یەکێتی سۆڤییەت لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ڕێگرتن لە بە هێزبوونی پێگەکەی لە دەڤەرەکەدا، و گوشار خستنە سەر عێراق؛ (ریتشارد نیکسۆن) سەرۆکی ئەو دەمی ئەمەریکا لە ئایاری ١٩٧٢ دا سەردانێکی بیست و چوار سەعاتی بۆ ئێرانی کرد، لەو سەردانەدا، (نیکسۆن) مەسەلەی هاوپەیمانی کردنی لەگەڵ کورد هێنایە گۆڕێ و هەردوو لایەنی ئێرانی و ئەمەریکی نیگەرانی خۆیان لەبارەی زیاتر بوونی کارە ڕادیکالەکانی عێراق

(١٥٨) حنا بطاطو، العراق، الشیوعیون والبعثیون و الضباط الأحرار...،ص ص ٤٢٤-٤٢٥، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر حزبی شیوعی عێراقی بڕوانە: عزیز سباهی عقود من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، الجزء الاول والثاني، المنشورات الثقافة الجديدة، دار الرباط للطباعة النشر، دمشق، ٢٠٠٣؛ حنا بطاطو، العراق، الحزب الشيوعي، الكتاب الثاني، ترجمة: عفيف الرزاز، مؤسسةالابحاث العربية، الطبعة العربية الاولى، بيروت، ١٩٩٢.

(١٥٩) کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە...، ل ٣٧٢.

(١٦٠) وەرگێڕاوە لە عومەر نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠١.

دەربڕی،[161]لەو لایەشەوە سەرکردایەتی سیاسی کورد دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کە حکوومەت خۆی لە پراکتیزەکردنی ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەی ( ١١ ) ی ئادار لای داوە و ئاراستەی چارەسەری سیاسی ڕەت دەکاتەوە، ئەو کاتە ناچار بوو ڕوو بکاتە کارتی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.[162]

لە دوای ئەوەی عێراق بەهۆی ڕێکەوتنی دۆستایەتی لەگەڵ سۆڤییەت بەو پەڕی لە خۆ بایی و پەسەند نەکردنی ئاشتی ڕووی لە ئاشتی وەرگێرا لە ئەنجامدا یەکلایەنە لە ڕۆژی ( ١١) مارسی ١٩٧٤ یاسای ئۆتۆنۆمی ڕاگەیاند و ئیتر قۆناغێکی تری شەڕ دژی کورد دەستی پێ کرد.[163]

لە ڕاستیدا ئەم هەنگاوەی حکوومەتی بەعس و ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی یەکلایەنە ئەگەر لە لایەکەوە بە مانای پاشگەزبوونەوەی بە تەواوەتی ئەو حکوومەتە بێت لە پەیمان و بەڵێنەکانی خۆی و پشت گوێ خستنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار، ئەوا لە لایەکی تریشەوە ڕەوایی دان ( شەرعیەت دان) بووە بۆ ئەو شەڕەی کە دژی تەڤگەرا ڕزگاری خوازە کورد دەستی پێ کرد. لەم ڕووەوە ڕۆژنامەی (لۆمۆند)ی فەڕەنسی دەڵێت : "ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی یەك لایەنە و بێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە ڕیشەییەکانی کورد زەمینە بۆ بارودۆخێکی مەترسیدار لە کوردستانی عێراق خۆش دەکات."[164] هەروەها ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانی ( ئەما لویس ئیمانویل گاس ) زانای چالاکی لە بزاڤی مافی مەدەنی و گەلانی بن دەست و ڕوو لە نەمان، زۆر بە توندی ڕەخنەی لەو ڕەفتارەی عێراق گرت و ئاماژەی بەوەکرد کە :" ئەم ئۆتۆنۆمییە تەنیا پەردەیەکە بۆ داپۆشینی دەست پێ کردنەوەی پڕۆسەیەکی نوێی سەربازی." [165]

(١٦١) د. گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٥.

(١٦٢) د. گوینتەر دیشنەر، هەمان سەرچاوە ل ٢٤٣؛ سامی شۆڕش، بزاڤە ڕزگاری خوازی کورد، ئیدریس بارزانی نموونەیەك، وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی د. ڕزگار، چاپخانەی زانا، دهۆك، ٢٠٠٥، ل ١٥٩.

(١٦٣) د.خوشوي بابكر، كوردستان-روسيا ملاحظات دبلوماسي كوردي، ترجمة رضوان باديني، الطبعة الاولى مطبعة وزارة التربية، اربيل،٢٠٠٥، ص٩٠؛ کریس کۆچێرا، بزوتنەوەی نەتەوەی کورد...، ل ٣٥.

(١٦٤) د. گوینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پیشوو، ل٢٤٨.

(١٦٥) وەرگێڕاوە لە : هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٨.



هێرش و پەلاماری دڕندانەی حکوومەتی بەعس بۆ سەر خەڵکی مەدەنی لە باشووری کوردستان، وای لە سەرکردایەتی سیاسی کرد کە داوای یارمەتی بکات لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و لە (١٩٧٤/٥/١٥)دا بارزانی یادداشتنامەیەکی بۆ (کورت ڤالدهایم) سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان نارد و داوای لێ کرد گوشار بخاتە سەر عێراق کە هێرش بۆ سەر خەڵکی مەدەنی دانیشتووانی گوند و شارەکان ڕابگرێ.[166] و هەروەها لە دوای سێ (٣) هەفتە بارزانی نامەیەکی تری دایە نەتەوە یەکگرتووەکان کە تێیدا هاتبوو : "دزێوترین شەڕی دڕندانە کە تا ئێستا جیهان بە خۆیەوە بینیبێ، ئەم شەڕەیە کە دژی گەلی کورد لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە ئەنجام دەدرێ کە کوردی تێدا دەکوژن و لە هەمان ڕۆژدا ڕاپۆرتێکی دوور و درێژ بە بەڵگەنامە و وێنە و نەخشەوە دایە لیژنەی مافی مرۆڤ سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، لەم ڕاپۆرتەدا باس لە" قڕکردنی خەڵکی مەدەنی و بێ چەك و ڕوخاندنی خانوو و بەرەو سووتاندنی دەغڵ و دان و بەروبوومی کشتوکاڵییەکانی کرا کە هەموو ڕۆژێك لە کوردستانی عێراق ئەنجام دەدرێ، بەڵام یادداشتەکانی ناوبراو بێ وەڵام مانەوە، بە گوتەی دیبلۆماتێك لە دەزگای ڕاگەیاندنی ئەڵمانی (ڤالدهایم ) بۆیە بانگەوازەکانی بارزانی پشت گوێ خست بۆ ئەوەی یەکێتی سۆڤییەت نەڕەنجێ." [167]

لێرەدا دەردەکەوێت کە جارێکی تر یەکێتی سۆڤییەت بە گۆڕانی بارودۆخ و هاوکێشە سیاسییەکان پشتی لە کورد کرد و نەك تەنیا لە ڕووی سەربازییەوە بەڵکو لە باڵاترین ئاستی دیبلۆماسیدا لە ناو مەزنترین ڕێکخراوی نێو دەوڵەتیدا بەرگری ناڕەوای لە حکوومەتی عێراق دەکرد[168]، بەڵام وەك لە دوایدا دەرکەوت، ڕووسیا بەم هەڵوێستە، خۆی تووشی هەڵەیەکی ستراتیژی کرد بوو، لە بەر ئەوەی ڕووسیا پێویست بوو ئەوەی لەبەرچاوگرتبا کە عێراق دەوڵەتێکی خاوەن سەروەرییە سەرەڕای جیاوازی و ئەم کێشانەی کە لەگەڵ ئەمەریکا و دەوڵەتە دراوسێیەکان هەیەتی، بەڵام لە زۆر خاڵیشدا هاوبیر و هاوڕان بە تایبەت سەبارەت بە دۆزی کورد، بۆیە دەتوانرێ زۆر بە ئاسانی مانۆری سیاسی و دیپلۆماسی بکات و پشتی لێ بکات، لەبەرامبەر هاوکاری دەوڵەت هەڤسوویەکان و ئەمەریکا بۆ سەرکوت کردنی کورد،

(١٦٦) وەرگێڕاوە لە : هەمان سەرچاوە،ل ٢٧٥

(١٦٧) وەرگێڕاوە: هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

(١٦٨) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

به تایبەت کاتێك هاوپەیمانی رووسی — عێراقی لەو رووەوە سەرکەوتوو نەبێ، لە دوایشدا سەمت و رەووتی رووداوەکان هەر بەو ئاراستەیە چوون.

رژێمی عێراق کاتێك بۆی دەرکەوت کە لە رێگەی بە کارهێنانی هێز و پیادەکردنی سیاسەتی جینۆساید نەك هەر ناتوانێ ئامانجەکانی خۆی بە دەست بێنێ بەڵکوو سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە شەڕیان و نەمانیان راگەیاندبوو بە شێوەیەك سوپای عێراقیان شپرزە کردبوو، بەغدای خستبووە بەردەم دوو رێگە و رێگەی سێیەمی نەمابوو، یان دەبوو دان بنێ بەمافی ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کورد لگوڕ بەیاننامەی ١١ی ئادار و هەڵوەشاندنی ئۆتۆنۆمی کارتۆنی کە رای گەیاندبوو یاخود پەنابردن بۆ گەمەیەکی سیاسی و دیپلۆماسی و سازش و سەر شۆڕکردن بۆ ئەمەریکا و دەوڵەتی ئێران و پشت تێ کردنی یەکێتی سۆڤییەت.[١٦٩] حکوومەتی بەعس پەنای بردە بەر شێوازی دووەم و هەوڵیدا لە رێگەی مانۆرێکی سیاسی و دیپلۆماسی، گەمارۆی شۆڕش بدات و زاڵ بێ بە سەریدا.

بۆ ئەم مەبەستەش عێراق پەیوەندی بەو دەوڵەتانەوە کرد، کە پەیوەندی توند و تۆڵ و بە تینیان لەگەڵ ئەمەریکا هەبوو وەك سعودییە، ئوردەن و مسیر بۆ ئەوەی بتوانن ناوبژیوانی نێوان عێراق و ئێران بکات و بە هاوکاری یەکتر زاڵ بن بە سەر دۆزی کورد دا. لەم رووەوە (شا حسێن شای ئوردەن و ئەنوەر سادات) رۆڵێکی گەورەیان گێڕا، بە تایبەت ئوردەن کە تا ئەو کات توانیبووی بە شێوەیەکی چاك پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هەر دوو دەوڵەتی عێراق و ئێران بپارێزی و رۆڵێکی گرنگ ببینێ بۆ لێك نزیك کردنەوەی هەر دوو دەوڵەت، ئیتر بەم شێوەیە گەیشتن بە رێککەوتننامەیەك بە ناوبژیوانی دەوڵەتە عەرەبییەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا هەستی پی دەکرا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو یەکێتی سۆڤییەت بڕیاری ناردنی چەك و جبەخانەی بۆ عێراق کەم کردبوو چونکە بە شێوەیەکی ئاشکرا عێراق بەرەو بلۆکی رۆژئاوا دەچوو.[١٧٠]

لە زستانی ١٩٧٤ دا وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێران بە نهێنی لە جنێڤ کۆبوونەتەوە لە ناوەڕاستی زستانی ١٩٧٤ جارێکی تر وەفدی عێراق و ئێران لە ئەستەنبۆل کۆبوونەوە.

(١٦٩) مثنى امين قادر، مصدر سابق، ص ١٧٠.

(١٧٠) نادر ئینتسار، ئیتنو نەتەوایەتی کوردی، وەرگێڕان، عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٤، ل ل ٢٦٢ — ٢٦٣.



[١٧١]لە نیۆیۆرکیش (هنری کیسنجر) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا و (تالب شەبیب) نوێنەری عێراق لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی یەکتریان بینی و باسیان لە شێوازی چاککردنەوەی پەیوەندییەکانیان و دوورخستنەوەی پێگەی یەکێتی سۆڤییەت و ئاسایشی کەندا و پێویستی رۆیشتنی نەوت بۆ رۆژئاوا و نەرمی نواندنی عێراق لە هەمبەر دۆزی فەڵەستین کرد، بەو شێوەیە کە ئەمەریکا دەیەوێت، پاشان ئەم گفتوگۆیانە لە لایەن (غانم عبدالجلیل) سکرتێری تایبەتی سەدام حسێن تەواو کران و لە هەمانکاتدا سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە کرد کە (هێنری کسنجر) کە لە پایتەختەکانی یەکێك لە وڵاتانی عەرەبییەوە بە نهێنی بۆ ماوەی ( ٢٤ ) کاتژمێر سەردانی بەغدای کردووە و لەگەڵ سەرکردایەتی بەعس کۆبوونەتەوە و بناغەی رێککەوتننامەی جەزائیریان دارشتووە.[١٧٢]

ئیتر بەم شێوەیە بە هەوڵ و تێکۆشانی دەوڵەتانی وەك مصر و ئەردەن و تورکیا و جەزائیر و سعودییە پاڵپشتی راستەوخۆی ئەمەریکا، عێراق و ئێران لە ٦ ی ئاداری ١٩٧٥ بە یەك گەیشتن و رێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوانیان مۆرکرا، لە بەر رۆشنایی بڕیارەکانی رێککەوتننامەی جەزائیر ئێران بەڵێنیدا سنوورەکانی خۆی بە رووی شۆڕشدا بخات و هاوکاری شۆڕشی کورد نەکات، و ئەگەر پێویستیشی کرد بەرامبەری بووەستێت، لە بەرامبەردا عێراق بەڵێنیدا چیتر یارمەتی عەرەبەکانی ناوچەی خوزستانی ژێر دەسەڵاتی ئێران نەدات، و رازی بێ بە دەستکاری کردنی سنووری ئاوی (شەت العرب ) بۆ بەرژەوەندی ئێران.[١٧٣]

لە دوای ئەم رێککەوتنامەیە ئێران کەوتە بادانەوە و هەڵوێستی خۆی لەگەڵ کوردان گۆڕی و بە شێوەیەکی کت و پڕ تەواوی یارمەتییەکانی خۆی لە شۆڕش بڕی.[١٧٤]

(١٧١) جەزا تۆفیق طالب، العقبات الجیوبولیتیکیە للامن القومی فی اقلیم کوردستان، مرکز کوردستان للدراسات الاستراتیجیە، السلیمانیة، ٢٠٠٥، ص ٤١٣.

(١٧٢) د. حامد محمود عیسي، المشکلة الکردیة في الشرق...، ص ٢٣٧؛ عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٣.

(١٧٣) بڕوانە: عبد القادر البریفکانی، مصطفی البارزانی زعیم الحرکة القومیة الکردیة المعاصرة، الطبعة الاولی، المرکز الدولی للاعلام، القاهرة، ص ص٣٢٩+(٣٢٩-٣٤٢)؛ د. گونیتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٠؛ مثنی امین قادر، مصدر سابق، ص ١٧٣؛ د. کمال دیب، مصدر سابق، ص ١٧٨.

(١٧٤)د. گۆنیتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٠؛ جاناتان رندڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣.

بە گۆڕانی هەڵوێستی ئێران و پشت کردنی لە کورد و داخستنی سنوورەکانی خۆی، بارزانی نامەیەکی تایبەتی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ( هنری کسنجر ) نارد. لە نامەکەیدا ئاماژەی بەوە کردبوو :"جەنابی وەزیر عێراق و ئێران لە سەر حیسابی گەلی کورد ڕێککەوتوون، یەکێك لە ئامانجەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە لە ناوبردنی گەلی کوردە و ئەمەریکاش بە شێوەیکی ڕاستەوخۆ بەرپرسیارە لە ڕوودانی ئەم بارودۆخە و ئەرکێکی ئەخلاقی و سیاسی لە ئەستۆدایە دەرحەق بە گەلی کورد " [١٧٥]، هەروەها بارزانی لە نامەکەیدا داوای لە (کسنجر) کرد گوشار بخاتە سەر ئێران بۆ ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕش بتوانێ درێژە بە شەڕ بدات، بەڵام کسنجر هەرگیز وەڵامی ئەم نامەی بارزانی نەدایەوە [١٧٦].

بەم شێوەیە کورد لە سەر ئاستی ناخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتی بێ پشتیوان مایەوە، تەڤگەرا ڕزگاری خوازا کورد و شۆڕشی ئەیلول بوونە قوربانی ململانێ نێوان وڵاتە هەرێمی و زلهێزەکان لە ڕاستیدا ڕێککەوتننامەی جەزائیر پیلانێکی گەورەی نێودەوڵەتی و هەرێمی بووە لە سەر حیسابی مەسەلەی کورد ئەنجام درا، ئێران و عێراق کەونە هاوکاری کردنی یەکتر و ئەمەریکا و جیهانی عەرەبی و تورکیا پشتیوانیان لەم سات و سەودایە کرد، هەرچەندە کورد لە هاوبەندی و زۆرانبازی سیاسی ئەو کاتدا دەیویست سوود لە جیاوازی و ناکۆکییەکانی نێوان دوو جەمسەر وناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتانی هەرێمی وەربگرێت، بەڵام گەمەی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ژێر سایەو سێبەری مەرجەکانی جەنگی سارد لە توانای کورد گەورەتر بووە، ئاڵۆزییەکەش لەوە چڕ تر بوو کە کورد بتوانێ بەو پەراوێزە سیاسییە بچووکەی کە هەیبوو زەفەری پێ ببات.[١٧٧]

لە ڕاستیدا ئەمەریکا بەرپرسیاری سەرەکی ئەم پیلانەك بووە دژی کورد. (هنری کسنجر) ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە پێك گەیاندنی ئێران و عێراق لە سەر حیسابی دۆزی کورد و مافە ڕەواکانی. ئیدارەی ئەمەریکی بەڵێنی نەگۆڕی بە سەرکردایەتی کورد دابوو کە یارمەتییان دەدات و پشتیان لێ ناکات، بە تایبەت لە دوای بەستنی پەیمانی دۆستایەتی نێوان عێراق و ڕووسیا وە.[١٧٨]

(١٧٥) وەرگێڕاوە لە: د. گۆینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٩.

(١٧٦)وەرگێڕاوە لە: کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و....، ل ٢٢٤.

(١٧٧) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٥.

(١٧٨) د. گۆینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٨٦-٢٩٦



پشتگیری و بەڵێنەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جێگای دڵنیایی بارزانی و سەرکردایەتی شۆڕش بوو، لە بەر ئەوەی لە بنەڕەتەوە باوەڕیان بە شای ئێران نەبوو [١٧٩]، بەڵام هەڵوێستی ئەمەریکا لەم ڕووەوە هەڵخەڵەتاندن و قۆسنەوەی دەرفەت بووە بۆ سەپاندنی مەرجەکانی خۆی بە سەر عێراقدا. هەروەها دوورخستنەوەی یەکێتی سۆڤییەت لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بێ لە بەرچاوگرتنی چارەنووسی نەتەوەیەکی ژێر دەست کە تێدەکۆشێ بۆ بە دەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی، بە پێی ئەو زانیارییانەی دەست لیژنەی (پایك)[١٨٠]کەوتوون ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەمەریکا و شای ئێران سیاسەتی نە سەرکەوتن نە ژێر کەوتن لە هەمبەری کورد پەیڕەویان کردووە [١٨١]، لەم ڕووەشەوە ڕەخنەی توندی ئاراستەی ئیدارەی ئەمەریکی دەکات کە سیاسەتێکی دوور لە ڕەوشتیان هەمبەری کورد پەیڕەو کردووە، چونکە نە وازی لێ هێنان کێشەکانی خۆیان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی چارە بکەن و نە هاوکاری کوردیان کرد.[١٨٢]

(١٧٩) نادر ئینتیسار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٨. د. گۆینتەر دیشنەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٦٨-٢٩٦

(١٨٠) ئەم لیژنەیە لە لایەن ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکی بە سەرۆکایەتی ( تۆیس بایکی ) سیناتۆری دیموکرات و ئەندامی کۆنگریسی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٧٦ دروست بوو، بو بەدواداچوونی چالاکییە نهینییە کانی دەزگای هەواڵگەری ئەمریکی، یەکێك لەو مەسەلانەش دەستێوەردانی بوو لە کاروباری کورد، و لە ١٩٧٦/١/١٩ ڕاپۆرتێکیان پێشکەش بە کۆنگرێسی ئەمەریکی کرد لە یەکێك لە بڕگەکانی ئەم ڕاپۆرتە دا ئاماژە بە سیاسەتی ئەمەریکا هەمبەر کورد دەگات و جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە سیاسەتی ئەمەریکا هەمبەر کورد سیاسەتێکی بێ ئەخلاقانە بووە وە یەکێك لە فاکتەرەکانی هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول بووە،سەروکی ئەمریکا ریشارد نیکسون لە سەر راسپاردەی هنری کسنجر نامەیەکی ڕەوانەی کۆنگریس کردو دژایەتی خوی بۆ بەلاوکردنە وەی راپۆرتەکە نیشاندا بە بیانووی ئەوەی کە دژی بەرژەوەنیەکانی بالای دەولەتە، کۆنگریس لە دانشتنی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦ رەزامەندی خۆی لە سەر بەلاونەکردنی راپۆرتەکەنیشانیدا تەنها ئەو کاتە نەبێ کە دەسەڵاتی جێ بەجێ کردن رازی دەبێ، کەچی گوڤاری (دەنگی لادی) لە شاری (جرینتش) نزیك نیویورك دەردەچو بەلاوی کردەوە، بڕوانە : فەرهاد عەونی، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دووبارە شۆڕشی ئەیلول هەڵبسەنگێنینەوە، سەنتەری برایەتی، ژمارە ١، هەولێر، ساڵی یەکەم، ئابی ١٩٩٧، ل ٢٤ عومەرنورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٥.

(١٨١) **مثنى** امين قادر، مصدر سابق، ص ٤٤.

(١٨٢) د. حامد محمود عيسي، المشكلة الكردية في الشرق...، ص ٢٣٩.

## باسی سێیەم

## هەڵوێستی دەوڵەتانی هەرێمی لە هەمبەری کوردستانی عێراق

دۆزی کورد لە عێراق تەنها پەیوەندی بە حکوومەتەکانی عێراقەوە نەبووە، بەڵکو رەهەندێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی هەبووە، بە هۆی ئەو دابەشبوونەی کە لە کوردستان ئەنجام دراوە، و لکاندویانە بە دەوڵەتانی دەوروبەرەو، ئەمەش وای کردووە دۆزی کورد پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتەکانی هەرێمییەوە هەبێ[(١٨٣)]، بە واتایەکی تر هەر رابوونەك یاخود هەر شۆڕش و جوڵانەوەیەك لە هەر پارچەیەکی کوردستان، دەوڵەتانی کە کوردستانیان داگیرکردووە (ترکیا، ئیران، سوریا و عێراق) بە هەڕەشە و مەترسی راستەوخۆی لە سەر ئاسایشی نەتەوەیی و دەسەڵات و یەکێتی خاکی خۆیان زانیوە.

هەر بۆیە ئەم دەوڵەتانە بە درێژایی تەمەنی حکوومەتەکانی عێراق و تاکو گۆڕانکارییەکانی(٩)ی نیسانی ٢٠٠٣ و لە دوای گۆڕانکارییەکەش هەموو هەوڵ و تواناکانی خۆیان خستۆتە گەڕ بۆ تەگەرە خستنە بەردەم چارەسەری دۆزی کورد، سیاسەتی سەرکوت کردن و نکۆڵی کردن و گێڕان و چاندنی پیلان و نەخشەی هاوبەش دژی نەتەوەی کورد بۆتە ستراتیژی هاوبەشی ئەم دەوڵەتانە، هەر هەموویان کۆك و تەبا بوون لە سەر ئاستی دیار و نادیار دا ستراتیژی و بەرنامەی هاوبەشیان هەبێت بۆ رێگرتن لە هەر بزاڤەکا رزگاری خوازانەی کورد، یان هەر ئەگەرەك کە چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت کورد هەنگاو بەرەو ئازادی و گەیشتن بە مافی نەتەوەییەکانی هەڵ بنێت [(١٨٤)].

دەوڵەتە دراوسێیەکانی عێراق بە تایبەت ئێران و تورکیا، کە دەستیان بە سەر بەشێکی زۆری خاکی کوردستان داگرتووە بە هاوکاری و لە سەر داخوازی راستەوخۆی حکوومەتی ناوەندی عێراق بە درێژی سەدەی بیستەم، بۆ رووبەڕووبوونەوەی شۆڕش و راپەڕینەکانی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان بەگشتی تەڤگرا رزگاری خوازی کورد لە کوردستانی عێراق بە تایبەتی چەندین رێککەوتننامە و پەیماننامەیان مۆرکردووە، رێککەوتننامەی سەعد ئاباد کە لە ٨ ی تەمووزی

(١٨٣) مثنى امين قادر، مصدر سابق، ص ١٢٩.

(١٨٤) عەتا قەرەداغی، خەونی سەربەخۆیی لە واقعێکی ناجێگردا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٩١.



١٩٣٧ دا لە نێوان تورکیا و ئێران و عێراق و ئەفغانستان لە ژێر ناوی ( دەست درێژی نەکردن ) بەسترا، بەندی ٧ ی ئەم رێککەوتننامەیە بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئاماژە بە گرتنەبەری سیاسەتێکی هاوبەش دەکات دژی کورد، لەم بەندەدا هاتووە " هاوپەیمانەکان بەڵێن دەدەن لە مەڵبەندی سنوورییەکانی خۆیاندا؛ رێ نەدەن بە دامەزراندنی رێکخراو یان جموجوڵی تاقمی چەکدار. بە هیچ جۆرە تاقم یان رێکخستنەك کار بکا بۆ تێکدانی دامەزراوەکان یاخود بۆ شێواندنی ئاسایشی هەر بەشێك لە خاکی ولاتانی هاوپەیمان."[(١٨٥)]

هەروەها ئەم پەیماننامەیە دەستپێشخەری و پاڵنەری بەریتانیا و تورکیای لە پشتەوە بووە مەبەستیان پێکهێنانی بەرەیەکی هاوبەش و یەکگرتوو بووە لە ناوچەکەدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان [(١٨٦)] هەروەها بەلاداخستنی هێمنانەی ناکۆکییەکانیان بووە.[(١٨٧)]

بەم شێوەیە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم، بناغە و بنچینەی گرتنە بەری سیاسەتێکی هاوبەش لە نێوان عێراق و تورکیا و ئێران و دەوڵەتانی تر دارێژرا بوو. پرسی کورد سەرکەوت بۆ ئاستی پەیوەندییە ناوچەییەکان و هەر یەك لەم دەوڵەتانە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە کێشەی کورد لە ناویاندا بە دوو لایەنی کونترۆڵ ناکرێت، بەڵکو پێویستی بە هاوکاری و پاڵپشتی دەوڵەتانی ناوچەکە هەیە.[(١٨٨)]

لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی و دەست پێ کردنەوەی شەڕی سارد لە نێوان بلۆکی سۆسیالیستی بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤییەت و بلۆکی سەرمایەداری بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ جارێکی تر بوو بە مەیدانی کێشمەکێش و ململانێ و زۆرانبازی نێوان

(١٨٥) م.لازاريف المسألة الكوردية (١٩٢٣-١٩٤٥)...، ص٣٠١.

(١٨٦) د. عبدالجبار قادر غفور، تاريخ تركيا المعاصر، ١٩١٨ — ١٩٨٠ فى : د. ابراهيم خليل احمد و أخرون، مصدر سابق، ص ٤٤.

(١٨٧) نەوشێروان مصطفى ئەمین، حکوومەتی کوردستان رێبەندانی ( ١٣٢٤ سەرماوەزی ١٣٢٥ ) کورد لە گەمەی سۆڤیەتی دا، لە بلاو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٦،، ل ٢٣.

(١٨٨) هێرش عبدالله حمەکریم، پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا. ١٩٩١ — ١٩٩٨، نامەیەکی ماستەری بلاو نەکراوە، کۆلێژی زانستە کۆمەلایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٦ — ٢٠٠٧، ل ٣٩.

هەردوو لایەنی دژ بە یەکدا.[١٨٩] هەر بۆیە ئەمەریکا و بەریتانیا بە هاوکاری و هەماهەنگی هاوپەیمانەکانیان، کەوتنە خۆ بۆ دروستکردنی سەدێکی بەهێز لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە بەردەم پەلهاویشتنی یەکێتی سۆڤییەت.[١٩٠]

بۆ ئەم مەبەستەش پەیمانی بەغدا کە لە سەرەتا دا لە نێوان تورکیا و عێراق لە ساڵی ١٩٥٥ مۆر کرابوو، دواتر ئێران و پاکستان و بەریتانیا هاتنە ناوی و ئەمەریکاش وەك ئەندامی چاودێر وەرگیرا.[١٩١] لەم پەیمانەدا وێرای جەختکردن لە سەر رێگرتن لە کشانەوە و پەلهاویشتنی یەکێتی سۆڤییەت بۆ رۆژهەڵاتی ناڤین و ئاوەکانی کەنداو، لە هەمان کاتدا لە بەندی (١) دا ئاماژەیان بەوە کردبو لە دژی هەر دەستدرێژییەك وکارێکی تێکدەرانە بەرگیری لە خۆیان دەکەن.[١٩٢] ئەم بەندە بەشیوەیەکی ناڕاستەوخو مەبەستی دژایەتی کردنی کورد بووە.[١٩٣]

شایەنی باسە لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨، هێزە بەرهەڵستکارانی عێراق داوایانکرد عێراق لە پەیمانی بەغدا بکێشیتەوە. لەلایەن خۆیەوە پارتی دیموکراتی کوردستان لە یەکەم راگەیاندندا لە تەموزی ١٩٥٨ دا، داوای کرد کە عێراق لە پەیماننامەی بەغدا بکشێتەوە. دوای کشانەوەی عێراقیش لەم پەیماننامە ناوەکەی گۆڕاوە بۆ پەیمانی سەنتۆ.[١٩٤] لەم رووەوە ئاشکرا دەبێ کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بە تایبەت تورکیا و ئێران و عێراق رۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە لە تێکەڵ کردنی دۆزی کورد لەگەڵ جەنگی سارد و توانیان وەك هۆکارێکی یاخود فاکتەرێکی نا ئارامی و ناسەقامگیری لە رۆژهەڵاتی ناڤین پیشان بدەن.[١٩٥] لەوێشەوە فاکتەری نێودەوڵەتی بە

(١٨٩) نەورەس رەشید، کورد لە نێوان شارستانییەتی جەنگی سارد و شارستانیەتی جیهانگەرایدا، گۆڤاری رۆشنبیری کوردستان، ژمارە ( ٦ )، تشرینی یەکەم، هەولیر، ٢٠٠١، ل ٦.

(١٩٠) د. جاسم توفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد...، ل ٣٩٩.

(١٩١) د. عبدالجبار قادر غفور، مصدر سابق، ص ٢١٧.

(١٩٢) بروانە دەقی ئەم رێککەوتنامەیە لە: د. احمد نوري النعیمي، ترکیا و حلف شمال الاطلسي، ص ص (١٨٠-١٩٢) + (٣٨٣-٣٨٦) (د،م) (دت).

(١٩٣) محسن محمد الموتولي، کرد العراق، من الحرب العالمیة الاولی ١٩١٤ حتی سقوط الملکیة في العراق (١٩٥٨)، دار العربیة، الطبعة الاولی،٢٠٠١، بیروت، ص ٢٤٤.

(١٩٤) مثنی امین قادر، مصدر سابق، ص ١٣٤.

(١٩٥) هێرش عەبدوللا حەمە کەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.



ئاراستەی دژ لەگەڵ ماف و داخوازییەکانی گەلی کورد وەگەڕبخەن، لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەش کورد و تەڤگەرا رزگاریخوازەکەی بە هۆی بێ پشتیوانی و بەو پەراوێزە بچووکەی کە هەیبوو نەیتوانی خۆی لە بەرامبەر ئەم نەخشە و پیلانانە رابگرێ و تووشی شکەست و دارمان هاتووە. شۆڕشی ئەیلول یەکێکە لە نموونە هەرە دیارەکان کە بە خزانی فاکتەری هەرێمی و نێودەوڵەتی بوو ناو ململانەکە، هاوکێشە سیاسییەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندی بەغدا گۆڕانی بە سەر دا هات، ئەنجامەکەش رێکەوتنی جەزائیر کە پلانێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی بوو، نسکۆی بە شۆڕشی ئەیلول هێناوە.[١٩٦]

هاوکات لەگەڵ گۆڕانی هاوکێشە سیاسییەکان لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا و هاتنی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ سەر دەسەڵات، و دەست پێ کردنی شەڕی یەکەمی کەنداو لە نێوان عێراق و ئێران،[١٩٧] پەیوەندی نێوان تورکیا و عێراق لە رووی سیاسی و سەربازییەوە پێشڤەچوونێکی باشی بە خۆیەوە بینی، و هەردوو لا رێکەوتن لە سەر پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی یەکگرتوو و هاوبەش بۆ دژایەتی کردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە هەردوو بەرەی باکوور و باشووری کوردستان دا. لە ساڵی ١٩٨٢دا ( تەها یاسین رەمەزان ) جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیرانی عێراق بە سەردانێك گەیشتە ئەنقەرە، و رێککەوتننامەیەکی نهێنی بە ناوی راودونانی گەرم (المطاردة الساخنة)لە نێوان هەر دوو دەوڵەت مۆرکرا، ئەم رێککەوتننامەیە کۆمەڵێك خاڵی گرنگی لە خۆی گرتبوو، لەوانە "رێگەدان بە هێزەکانی هەردوو دەوڵەت بۆ چوونە ناو خاکی یەکتر بۆ بەرەنگار بوونەوەی کوردەکان، و هاوکاری و هەماهەنگی کردنی تەواو نێوان هەردوو دەوڵەت لە بۆاری ئاڵوگۆڕ کردنی زانیاری بە مەبەستی رووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیست، و بیر و چالاکی رووخێنەر و رێگرتن لە کاری تێکدەرانە کە لە ناوچەکەدا ئەنجام دەدرێت، و رێگە دان بە دام و دەزگای هەر دوو لا بۆ چاودێر کردن، و بە دوادا چوونەوەیی کار و چالاکییەکان ئۆپۆزسیۆنی هەر دوو لا، تەنانەت عێراق بڕی تێکچوونی هەموو جووڵەیەکی سەربازی تورکی لە ناو خاکی عێراق لە ئەستۆ گرت."[١٩٨]

(١٩٦) بروانە: دیڤید ماکدۆیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٥٥٥ — ٥٥٦.

(١٩٧) روبرت اولسن، المسالة الکردیة في العلاقات الترکیة — الأیرانیة، ترجمة: محمد احسان رمضان، الطبعة الاولی، دار ئاراس للطباعة و النشر، اربیل ٢٠٠١،، ص ص ٤٥-٤٦.

(١٩٨) وەگێراوە لە: د. جرجیس حسن، ترکیا في الاستراتیجیة الامریکیة بعد سقوط الشاه، الطبعة الاولی، ایران — ارومیة، ١٩٨٩، ص ص ٦٥-٦٦.

به وردبوونەوە و شیکردنەوەی بەندەکانی ئەم ڕێککەوتنامەیە بۆمان دەردەکەوێت مەبەستی سەرەکی بریتی بووە، لە ڕێخۆشکردن بۆ هاتنی سوپای تورکیا بۆ ناو خاکی عێراق لە باشووری کوردستان و لێدانی تەڤگەرا رزگاریخوازا کورد، چونکە لەو سەردەمەدا نەك هەر سوپای عێراق توانای ئەوەی نەبوو لەشکەر کێشی بکاتە ناو خاکی تورکیا، بەڵکو بە هۆی سەرقاڵ بوون بە شەڕی ئێرانەوە کۆنترۆڵی تەواوی ناوچە سنوورییەکانی خۆی لە باشووری کوردستان لە دەست دابوو، بۆیە دەیویست تورکیا ئەم بۆشاییە پڕ بکاتەوە هەر بۆیە بە پشت بەستن بەم ڕێککەوتنامەیە لە تەموزی **١٩٨٣** دا سوپای تورکیا بە قووڵایی **٢٥** کیلۆمەتر سنووری عێراقی بەزاند، و لە ئاب و مارسی **١٩٨٦** و **١٩٨٧** دووبارەی کردەوە.[١٩٩]

ئەگەر لە رووی بنەما و پڕەنسیپەوە، هەر دوو دەوڵەتی عێراق و تورکیا بە درێژایی سەدەی بیستەم بەرژەوەندی هاوبەشیان هەبووبێ کە ئەویش بریتی بووە لە ڕێ گرتن و سنووردانان بۆ دەرکەوتنی هەر جۆرە ئۆتۆنۆمییەك یان سەربەخۆیی کوردی و ئەم خاڵە و بەرژەوەندی هاوبەش جار لە دوای جار لە چەندساڵی رابردوو دا دەرکەوتبێ [٢٠٠]، بەڵام لە هەمانکاتدا دەکرێت ئەوەش بگوترێ هەر کاتێك سیستەمی سیاسی لە عێراق لاواز و لەرزۆك بووبێ، و ئەگەری هەڵوەشاندنی چوبێتە سەری یاخود بەغدا تەنانەت ئەگەر بە فڕوفێل بۆبێ خۆی لە دۆزی کورد نزیك کردبێتەوە ئەوە تورکیا هەر زۆر دۆسییەی ویلایەتی موسڵ کردۆتەوە و پیلان و نەخشەی داگیرکردنی باشووری کوردستانی دارِشتووە. لە دوای هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی پادشایەتی لە عێراق و هاتنە ئارای رژێمی کۆماری و خوڤەکشانی عێراق لە پەیمانی بەغدا و خۆنزیك کردنەوەی عەبدالکریم قاسم لە دۆزی کورد، وای لە تورکیا کرد کە هەلوێستەکی نگەتیڤی هەبی لە هەمبەر حکوومەتی قاسم، لەوەش زیاتر پلانێکی سەربازی دارِشت بۆ داگیر کردنی کوردستانی عێراق، بەڵام بە هۆی دژایەتی کردنی ئەمەریکا و بەریتانیا و گوشارەکانی یەکێتی سۆڤییەت، پاشگەزی لەم پیلانە کرد.[٢٠١]

---

(١٩٩) ڕوبرت اولسن، مصدر سابق، ص ص ٤٨ - ٤٩.

(٢٠٠) گراهام فۆللەر، ئاراستەی نوێی ڕۆژهەڵاتیانەی تورکیا : لە گراهام فۆللەر و ئەوانی تر، جیۆپـولیتیکی نوێ تورکیا، ئاسیای ناوەند، بەلْقان، کورد، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیـەوە : عـەتا قـەرەداغی، چـاپخانەی ڕۆن، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦ ل ١٤٣.

(٢٠١) لە دوای شۆڕشی ١٤ تەموزی١٩٨٥، تورکیا لـە ١٧ تـەموزی **١٩٥٨** راگەیانـد کـە دان نانێـت بـە کۆماری عیراق، و پیلانێکی سەر بازی دارِشت؛ بۆ لە شکرکێـشی بـۆ نـاو خـاکی کوردسـتان بـە مەبەسـتی



لە لایەکی ترەوە کاتێك عێراق لە ساڵانی **١٩٨٦** بە شێوەیەکی خراپ لە شەڕی عێراقدا لاواز دەبێت، و روو لە داشکانەوە بوو، سەرەڕای پەیوەندی بەتینی نێوان عێراق و تورکیا، بەڵام دیسان فراوانخوازی و چاوتێبڕینەکانی تورکیا سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ زیندوبوونەوە. زۆربەی بڵاوکراوەکان و دەزگا راگەیاندنەکانی تورکیا دەستیان کرد بۆ گەڕانەوە داواکانی کۆنیان، سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ کە لە ساڵی **١٩٢٦** لە ژێر گوشاری بەریتانیا دەست بەرداری ببوو.[٢٠٢]

کاتێك قەیران و تەنگژەی کەنداو لە ساڵی **١٩٩٠** سەری هەڵدا، تورکیا دەوڵەتانی دراوسێ عێراق خوازیاری ئەوە نەبوون کە لە کاتی کەوتنی ئاگرەکە، دەسەڵاتێکی کوردی یاخود قەوارەیەکی کوردی دروست ببێت، ئەم هەڵوێستەش بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕاگەیەندرابوو، بە تایبەت کاتێك قەیرانی نێوان عێراق و ئەمەریکا قووڵتر بووەوە، ( تورکوت ئۆزاڵ ) سەرۆك کۆماری تورکیا رایگەیاند :"تورکیا و ئێران و سووریا هاوڕا و هاودەنگن لە سەر ئەوەی هیچ جۆرە کیانێکی کوردی لە تەنگەژەی کەنداو سەرهەڵ نەداتڤ." [٢٠٣]

هەر بۆیەش زوربە ی هیزە سیاسییەکانی تورکیا زیاتر لە هێرشی سەربازی دەرەکی بۆ سەر حکوومەتی عێراق خوازیاری ئەوە بوون کە لە ناو خۆی عێراق گۆرانکارییەك یاخود زەمینەیەکی کودەتای سەربازی فەراهەم بکرێت، بەڵام کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانان بڕیاری هێرشی سەربازیان دەر کردو و سوور بوونی خۆیان بۆ وەدەرنانی عێراق لە کوێت دووپات

---

گەرانەوەی رژێمی پادشایەتی. تورکیا بە مەبەستی پشتگیری کردنی لە نەخشەکەی دەستێکرد بە هاوپـەیمانی کۆکردنووە، سەرەتا ئەمریکا و بەریتانیای لیێ ئاگادار کردەوە، بەڵام هەر دوو دەوڵەت بە هۆی بـە جـەماوەر بـوونی شۆڕەشـی ١٤ی تـەموز، ئـەم بیروکـەی یـان رەت کـردەوە. لـە هەمانکاتێـشدا یـەکێتی سـۆڤییەت هوشدارییەکی توندی ئاراستەی تورکیا کرد. هەمووی ئەمانە وایکرد کە تورکیا لە **٣٠** یولیو **١٩٥٨** دان بـە حکوومەتی عیراق بنێ و داوای کرد کە عیراق لە پەیمانی بەغدا دا بمێنیت بڕوانە: هێرش عەبدوللاحەمە کریم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠؛ د. جرجیس حسن، مصدر سابق، ص ٦٥.

(٢٠٢) گراهام فۆللەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٤٠-١٤١؛ سەلام ناوخۆش، بەرەو راست کردنەوەی مێـژووی سیاسی، مافی مێژووی غەیرە کورد بە سەر کوردستان، چاپخانەی هەتاو، چاپی یەکەم، کوردستان، ٢٠٠٤، ل ١٢١.

(٢٠٣) وەرگێڕاوە لە: دیڤید ماکدۆیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٩.

کردەوە، هەڵوێستی تورکیا لە ژێر کاریگەری و تێڕوانینەکانی ( تورکوت ئۆزاڵ ) لە هەمبەر عێراق گۆڕانکاری بە سەر دا هات. [(٢٠٤)]

تورکیا بە گوێرەی سیاسەتەکانی ئەمەریکا و هەڵوێستی نێودەوڵەتی رەفتاری کرد و گواستنەوەی یەك لە سێی گشتی نەوتی عێراق لە رێگەی خاکی وڵاتەکەیەوە بۆ دەرەوە ڕاگرت، بێ گومان چاوپۆشی کردنی تورکیا لە سوودە ئابوورییەکانی گواستنەوەی نەوت تەنیا لە بەر داواکارییەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و گوشارە شاراوەکانی ئەمەریکا نەبووە [(٢٠٥)]. لە پاڵ ئەم هەڵوێستەی تورکیادا، دوو فایل و دۆسیێی دیکە لە ژێر شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی (تورکوت ئۆزاڵ) دا بوون کە ئەویش دۆسییەی ویلایەتی موسڵ و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بوون. لە ٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٩١ ئۆزاڵ لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ سەرۆکی حکوومەت (ویلدۆم ئاق بلوط) و سەرۆکی ئەرکانی سوپای تورکیا (نەجیب تورومتای) ئەو پێشبینییەی کرد، کە "حکوومەتی عێراق دەڕوخێ و عێراق لە بەر یەك هەڵدەوەشێت و هێزە هاوپەیمانەکان لە ناوەڕاست و باشووری عێراق بەرەو بەغدا دەچن، بۆیە پێشنیازی کرد لە بارودۆخێکی ئاوە هادا پێویستە ئێمە ویلایەتی موسڵ داگیر بکەین و بیخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆماندا". [(٢٠٦)]

بەم شێوەیە جارێکی دیکە لە میانەی جەنگی کەندا و دا و ئەگەری لەبەر یەك هەڵوەشانی رژێمی بەعس و سەرهەڵدانی کیانێکی کوردی، چاو تێبڕین و فراوان خوازییەکانی تورکیا سەریهەڵدا و تورکیا هەوڵی دا ئەوەی لە شەڕی یەکەمی جیهانی لە دەستی دابوو بە دەستی بهێنێ.

دیڤید ماکدۆیل پێیوایە یەکێك لە هۆیەکانی چاوتێبڕین تورکیا بۆ ویلایەتی موسڵ و هەوڵ دان بۆ داگیرکردنی، ترس و نیگەرانی ئەم وڵاتە بووە لە گەشەکردنی ناسنامەی کلتووری کورد لە کوردستانی عێراق، کە کار دەکاتە سەر کوردەکانی تورکیا و دەیان وروژێنێ (دەیان ئازرینی) بۆیە ئەگەر ئەم

---

(٢٠٤) زریان رۆژهەڵاتی، سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان، (١٩٩١ – ٢٠٠٦)، لە دۆسێی تورکیا (( گۆڤار )) سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیژی، ژمارە ٥، سلێمانی، ئاداری ٢٠٠٧، ل ١١.

(٢٠٥) هەمان سەرچاوە، ل ١١.

(٢٠٦) وەرگێڕاوە لە: محمد نوردین، تورکیا لەسەردەمی گوراندا، وەرگیڕان بو کوردی ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٠،ل ٣٧٨.



ویلایەتە داگیرکرد دەیتوانی هەر ئەو سیاسەتەش بە سەر کوردەکانی عێراق بسەپێنێ کە بەرامبەر بە کوردەکانی خۆی پەیڕەوی لێ دەکرد. [(٢٠٧)]

تورکیا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەی خۆیان و کۆنترۆڵ کردنی ویلایەتی موسڵ لە کاتی لە بەریەك هەڵوەشانی عێراق، پێویستی بە چەند هەنگاوێکی بە پەلەو سیاسەتێکی ورد و پراکماتیکی هەبوو، گرنگترینیان بریتی بووە لە هاوکاری کردن و پاڵپشت کردنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و ئەمەریکا بۆ ئەوەی دژایەتی پلانەکەی نەکرێت، هەروەها لە سەر ئاستی ناوخۆیش بۆ چارەکردنی کێشەی کورد تورکوت ئۆزاڵ چەند هەنگاوی بوێرانەی هاویشت کە لە مێژووی تورکیا دا وێنەی نەبوو، و کۆمەڵێك ریفۆڕمی گرنگی ئەنجام دا [(٢٠٨)]. لە سەر ئاستی عێراقیش تورکوت ئۆزاڵ پێی وا بوو هەڵوەشانی عێراق سەنگ و قورسایی فاکتەری کوردی زیاتر دەبێت، و رۆڵێکی گرنگ لە ئایندەی سیاسی عێراق دا دەگێڕی، بۆیە ئۆزاڵ بۆ راکێشانی سۆزی کوردەکان بۆ لای خۆی و ڕازی کردنیان و هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان کوردەکانی توکیا و کوردستانی عێراق پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کورد بەتین کرد، و پەرەی پێی دان و پێیان راگەیاندن "با تورکیا وەك دوژمنی خۆیان سەیر نەکەن "[(٢٠٩)]، لە ٨ ی ئاداری ١٩٩١ رێگەی بە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان (موحسین دزەیی ) و ( جەلال تاڵەبانی ) سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ( PUK ) دا سەردانی تورکیا بکەن هەر لەم دیدارانە دا بوو کە جەلال تاڵەبانی رایگەیاند " لاپەڕەیەکی نوێ لە پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و کوردەکانی عێراق کراوەتەوە."[(٢١٠)]

---

(٢٠٧) دیڤید ماکدۆیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٩.

(٢٠٨) لە سەردەمی سەرۆك تورکۆت ئۆزاڵ داو پاش نزیکەی ٧٠ ساڵ بۆ یەکەم جار مۆڵەت درا کە وشەی کوردی لە تورکیا بە کار بهێنرێت، و بۆ یەکەم جار لە مێژووی کۆماری تورکیا، دانی نا بە بوونی کورد لە تورکیا و پێویستی چارەسەرکردنی کێشەکەیان بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە، گرنگترین ئەو هەنگاوانەی هاوێژران بریتی بوون لە رێگە دان بەو گەڕانەی ئەو کوردانەی مافی هاوڵاتی بوونیان لێ سەندرابوو دانی مافی دروست کردنی پارتی تایبەتی بۆ کوردەکان و بەشداری کردنیان لە پەڕلەمان، بڕوانە محمد نوردین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢، عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٨.

(٢٠٩) وەگێراوە لە : هێرش عەبدوللا حەمەکریم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.

(٢١٠) وەرگێڕاوە لە: مایکل گەنتەر، کوردستان دراوسێی نوێی تورکیا، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی، مەنفی ئەنوەر شوانی، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٣٦ )، هەولێر،٢٠٠٥/٥/١٢، ل ل ٣٨ - ٣٩.

مەزندە و پێشبینییەکانی( تورکوت ئۆزاڵ) وەك خۆی دەرنەچوو، و مەسەلەکەش بە دەرپەڕاندنی عێراق لە کوێت کۆتایی نەهات، لە ئەنجامی شەڕی کەنداوی ١٩٩١ سەرنجی تورکیا بە لای بابەتێکی زۆر گرنگتر و هەستیار تر راکێشا، نزیکەی نیو میلیۆن پەنابەری کورد کە لە دژی سەدام حسین و رژێمەکەی ڕاپەڕیبوون لە دوای پشت تێکردنی ئەمەریکا روویان لە سنوورەکانی تورکیا کرد، ئەم تراژیدییە مرۆییە کاریگەری گەورەی کردە سەر ئیدارەی حکوومەتی تورکیا، بۆیە بە رەزامەندی دەوڵەتانی هەرێمی بە تایبەت تورکیا و ئێران و رۆڵی کاریگەری فەرەنسا و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ( جۆن میجەر) ناوچەی دژە فڕین لە باشووری کوردستان دانرا [٢١١].

ئەم پشتگیری کردنەی دەوڵەتانی دراوسێ لە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش [٢١٢] و دامەزراندنی نەوای ئارام و ناوچەی دژە فڕین بە هۆی ئەوەوە نەبووە کە ئەم دەوڵەتانە بیانەوێت شتێك بۆ کورد بکەن، و یاخود خوازیاری دروستبوونی کیانێکی کوردی بووبن، چونکە ئەمە یەکەمجار نەبووە کە کورد تووشی کۆمەڵکوژی و سەرکوت کاری هاتبێت. لە ساڵانی (١٩٨٧ و ١٩٨٨) کورد رووبەڕووی پرۆسەی لە ناوبردن و جینۆسایت هات، و بە چەکی قەدەغەکراوی نێو دەوڵەتی کۆمەڵکوژ کرا، دەوڵەتانی هەرێمی بێ هەڵوێست بوون، تەنانەت تورکیا نکۆڵی لەوەی کرد کە چەکی کیمیاوی دژی کوردەکان بەکارهاتبێت [٢١٣]، بەڵام جیاوازی ئەم جارە لەوە دا بوو کە کۆچ رەوە ملیۆنییەکەی قەیرانێکی گەورەی لە ناوچەکەدا دروست کردبوو و ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتانی هەرێمی کەوتەبەر

---

(٢١١) هەمان سەرچاوە، ل ٣٨.

(٢١٢) لە دوای کۆچە میلیۆنییەکەی کورد، بەدەست پێشخەری چەند دەوڵەتێك لەوانە فەرەنسا و بەریتانیا لە ٥ — ٤- نیسانی ١٩٩١ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٨٨ دەری کرد بۆ دامەزراندنی نەوای ئارام و ناوچەی دژە فڕین بۆ کوردەکان، ئەم بڕیارە بە زۆرینەی(١٠) دەنگ لە کۆی (١٥) دەنگی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی دەرچو، هەر سێ دەوڵەتی( کوبا، یەمەن، زیمبابوی) دژی بڕیارەکە دەنگیانیاندا، دوو دەوڵەتی ( هند و سین)دەنگیان نەدا، ئەنجوومەنی ئاسایش ئیدانەی راونان و سەرکوتکردنی خەڵکی سیڤیل کرد و ئەم کارەی ڕژێمی بەعس بە هەڕەشەی دانا بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی بڕوانە د. جاسم تۆفیق خۆشناو، دەخالەتی مرۆڤانە لە کوردستان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤، ل ل ١٠٣ — ١٠٧، عبدالفتاح عبدالرزاق، مبدأ عدم التدخل والتدخل في القانون الدولي العام، دراسة تحليلية، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية،٢٠٠٢، ص ص ٣٧٩-٣٨١.

(٢١٣) هێرش عەبدوڵلاحەمەکریم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤.



هەڕەشەو مەترسییەوە، تورکیا مەترسی لەوە هەبوو کە کوردەکانی عێراق تێکەڵ بە کوردەکانی وڵاتەکەی ببن، ئەنجوومەنی ئاسایشی تورکیا لە کۆبوونەوەیەکدا سەبارەت بەم هەڕەشەیە، گەیشتە ئەو باوەڕەی مەبەستی سەرەکی عێراق لە ئاوارە کردنی دانیشتووانەکەی تێك دانی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیایە، و ئەنجوومەکە ئەو بۆچوونەی لای گەلاڵە بوو کە هاوشێوەی ئاوارەکانی فەلەستین کە لە لوبنان و ئەردەن نیشتەجێن، ئەوە کوردەکانیش لە تورکیا نیشتەجێ دەبن و کێشەی کورد ئەوەندەی تر ئاڵۆز دەبێت[٢١٤].

ئەم دەوڵەتانە بە هیچ شێوەیەك پێیان خۆش نەبوو ئەم دیفاکتۆیەی کە لە قەیران و تەنگەژەی کەنداو سەری هەڵدابوو بەرەو پێش بچێ، و یاخود پرسەکە لە کێشەیەکی مرۆییەوە بگۆڕێت بۆ کێشەیەکی سیاسی، هەر بۆیە کاتێك بەرەی کوردستان بە هۆی کشانەوەی ئیدارەی حکوومەتی ناوەندی لە کوردستان بڕیاری ئەنجام دانی هەڵبژاردنیدا، رووبەڕووی هەڕەشە و گوشارەکانی ئەم دەوڵەتانە بوو و ئەم هەڵوێستە دیموکراتییەی کوردیان بە هەڕەشە بە سەر ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان لێك دایەوە.

تورکیا سەبارەت بە بەڕێوەچوونی پرۆسەی هەڵبژاردن ئەوەی ئاشکرا کرد، کە رێگا نادات هیچ جۆرە دیفاکتۆیەك لە هەرێمی کوردستان دروست بێت و هەڕەشە لە ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا بکات، و لە ١٣/مایسی ١٩٩٢دا؛ واتە تەنها یەك هەفتە پێش بەڕێوەچوونی پرۆسەی هەڵبژاردن، وتەبێژێك بە ناوی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا ئەوەی راگەیاند کە "هەڵبژاردنەکەی هەرێمی کوردستان لەگەڵ سیاسەتی تورکیا بەرامبەر عێراق و ناوچەکە ناگونجێت "، هەر رۆژێك لە دوای لێدوانەکەش فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا کەوتنە بۆمباران کردنی دەڤەرە سنوورییەکانی کوردستان [٢١٥]، لە لایەکی ترەوە کۆماری عەرەبی سووریاش بە ترسی و نیگەرانییەوە دەیڕوانییە ئەم پێشهاتە سیاسییانەی کە لە هەرێمی کوردستان روودەدان، چونکە وای بۆ دەچوو پرۆسەی هەڵبژاردن کوردەکان هەنگاوێکی تری لە سەربەخۆیی نزیك دەکاتەوە، ئەمەش کاریگەری و کاردانەوەی نیگەتیڤی دەبێ لە سەر کوردەکانی

---

(٢١٤) عبد الرحمان سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ص ٢٦١.

(٢١٥) رۆتهۆف و ئەوانی دیکە، هەڵبژاردنەکانی کوردستانی عێراق، ١٩/مایسی ١٩٩٢، ئەزموونێکی دیموکراسیانە، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی، صفوة رشيد صدقي، ئەمەستردام، ئابی ١٩٩٢، ل ٤٥.

ولآتەکەی، هەر بۆیە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو تێڕوانین و بۆچوونانەدا پێش ئەنجام دانی پرۆسەی هەڵبژاردن پارتە کوردییەکانی ناچار کرد کە بارەگاکانیان لە دیمەشقەوە بگوازنەوە بۆ بەیروت[216].

هەروەها ئێران کە دوژمنێکی سەر سەختی سەدام حسین بوو، و شەڕێکی خوێناوی لە نێوانیان هەڵگیرسابوو، بەڵام سەبارەت بە پێشڤەچوونە سیاسییانەی کوردستان نیگەران بوو، ڕۆژنامەی ( ئێران تایمز) کە زمانی وەزارەتی دەرەوەی ئێرانەوە پرۆسەی هەڵبژاردن لە کوردستان بە پیلان و نەخشەی ئەمەریکی لە قەڵەم دا، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، و ئەوەی ڕاگەیاند کە کێشەی کوردەکان لە باکووری عێراق پێویستە لە سەر بنەما و پرەنسیپی ڕەوا ( مەشروع ) لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا چارە بکرێت نەك لە ڕیێ پرۆسەییەکی هەڵبژاردنەوە کە ئەمەریکا سەرپەرشتی دەکات [217].

کاتێك ئەنجامەکانی پرۆسەی هەڵبژاردن بووە هۆی لە دایکبوونی حکوومەت و پەرلەمانی کوردستان، و لە ٤ ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ پەرلەمانی کوردستان بڕیاری لە سەر سیستەمی فیدرالی دا [218] وەك بناغەیەك بۆ پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و حکوومەتی عێراق، هەڵوێستی دەوڵەتە هەرێمییەکان توندتر و هەڕەشە ئامێزتر بوو. حکوومەتی تورکیا چوار(٤ ) ڕۆژ لە دوای جاردانی بڕیاری فیدراڵیەت ڕایگەیاند "بڕیاری فیدراڵی لە لایەن کوردەوە یەکلایەنەیە و دەبێتە هۆی دابەش کردنی عێراق، و کاریگەرییەکی زۆر خراپ و نیگەتیڤ دەبێ بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی دەڤەرەکە و هەرێمەکە ڕووبەڕووی کێشەیەکی گەورە دەکاتەوە و دووپاتی کردەوە ئەو پرۆژەیە لە بەرژەوەندی کورد دا نییە" [219].

لە لایەکی ترەوە (بولەند ئەجەوید) سەرۆکی حزبی چەپڕەوی دیموکراتی تورکیا لە سەروبەندی ڕاگەیاندنی فیدراڵییەتدا لە ناو پەرلەمانی تورکیادا ئاماژەی بەوەی کرد کە "دەوڵەتی کوردی لە دوای هەڵبژاردنەکانەوە بە تەواوی دامەزراوە، و ئەوەی ماوەتەوە تەنیا دان پیێ دانانی فەرمییە و تورکیا لە ڕێگای پەیوەندییەکانییەوە بەم کارە هەڵساوە و ئەو دەوڵەتانەی ئێمە بە هاوپەیمان و

(٢١٦) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٣٠٩ — ٣١٠.

(٢١٧) مثنى امينى قادر، مصدر سابق، ص ١٣٧.

(٢١٨) د. جاسم تۆفیق خۆشناو، دەخالەتی مرۆڤانە...، ل ١٠٨.

(٢١٩) وەرگێڕاوە لە: هێرش عەبدوللا حەمەکریم، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.



هەڤاڵبەندی خۆمان دەزانی بە ئاشکرا خەریکی تاوتوێ کردن و زیندووکردنەوەی پەیمانی سیڤەرن بە تایبەتی پەرلەمانی ئەوروپا "[220].

بە هەمان واتا و ئاراستە( علی ئەکبەری ویلایەت) وەزیری دەرەوەی ئێران ڕایگەیاند "هەندێ وڵاتی ڕۆژئاوا خەریکن کێشەکە ئاڵۆزتر دەکەن بۆ نموونە هەڵوێستیان بەرامبەر مەسەلەی هەستیار و ناسکەکان وەك مەسەلەی کورد، چونکە دروستکردنی هەر جۆرە ئۆتۆنۆمییەك لە باکووری عێراق کاردانەوەی نیگەتیڤی دەبێ بۆ دەوڵەتانی ناوچە و پێش هەموویان بۆ تورکیا و پێویستە ڕێگە لە هەر جۆرە دەستتێوەردانێکی دەرەکی بگیرێ، سەروەری تەواوی عێراق زۆر گرنگە بۆ گەلەکەی و وڵاتانی عەرەب و بۆ جیهانی ئیسلامی و ئەگەر عێراق پارچە پارچە بکرێت ئەوە کۆتایی بە کێشەکە نایەت و بەڵکو دەبێتە سەرەتای ئاڵۆزی کە ئەنجامەکەی کارەساتە" [221].

وڵاتانی عەرەبیش لە لایەن خۆیانەوە دژایەتی خۆیان بۆ پیادەکردنی سیستەمی فیدراڵی لە کوردستانی عێراق دەربڕی، و ڕایانگەیاند کە هیچ جۆرە دەستکارییەکی سنوورەکانی عێراق قبووڵ ناکەن [222].

بۆ لە باربردنی ئەزموونی دیموکراسی کوردستان و شکست هێنان و تێکشکاندنی بڕیاری فیدراڵییەت کە لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە ڕاگەیەنرابوو، هەروەها بۆ دەست وەشاندن و لێدان و گەمارۆدان و زاڵبوون بە سەر حکوومەت و پەرلەمانی تازە دامەزراوی کوردستان، و تەنگ پیێ هەڵچنینی دۆزی کورد، دەوڵەتە هەرێمییەکان دەستیان بە بزاڤ و چالاکی سیاسی و دیپلۆماسی کرد، و پیلان و نەخشەی جۆراوجۆریان دارشت.

لە سەر ئاستی هەرێمی، دۆزی کورد و ئەزموونە دیموکراسییەکەی کوردستان ئەو خاڵە هاوبەشە بوو کە تورکیا و ئێران و سووریای لە دەوری یەکتر کۆکردەوە، و ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی بە گرتنە بەری سیاسەتێکی هاوبەش و پاڵپشتی کردنی یەکتر ڕووبەڕووی حکوومەت و پەرلەمانی کوردستان ببنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دیدار و چاوپێکەوتن، کۆبوونەوەی سێ قۆڵی و چەند قۆڵی یان ڕێکخستن و زنجیرەیەك پرۆتۆکۆڵی ئاسایشیان بەست و سووربوونی خۆیان لە سەر دژایەتی کردنی ئەزموونی کوردستان دووپات کردەوە.

(٢٢٠) وەرگێڕاوە لە: هەمان سەرچاوە، ل ٣٥.

(٢٢١) وەرگێڕاوە لە: عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١١.

(٢٢٢) وەرگێڕاوە لە: د. جاسم تۆفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد و...، ل ٥٧.

یەکەم پرۆتۆکۆلی ئاسایشی لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ لە ئەنقەرە بەسترا، جەختیان لە سەر ئەوە کرد کە بەرهەڵستی دابەشبوونی عێراق دەکەن، و سیستەمی فیدراڵییان بۆ چارەسەری دۆزی کورد لە عێراق رەت کردەوە و بە هەڕەشە و مەترسی گەورەیان دانا بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی ناوچەکە [٢٢٣]، بە هۆی ئەم کاردانەوە نیگەتیڤانەی دەوڵەتانی هەرێمی و دژایەتی کردنی ئاشکرای ماف و داخوازییەکانی گەلی کوردستان، پەرلەمانی کوردستان نامەیەکی ئاراستەی ئەم دەوڵەتانە کرد، روونی کردەوە کە بەرێوەچوونی هەڵبژاردن ئەنجامی کشانەوەی ئیداراتی حکوومەتی ناوەندی بووە، و حکوومەتی کوردستان دەست لە کاروباری دەوڵەتە هەڤسوییەکان وەرنادات. سەبارەت بە فیدراڵییەتیش ئەوەی وە بیرهێنانەوە کە نابێتە هۆی دابەشکردنی خاکی عێراق، بەڵکو یەکێتی خاکەکە بەهێزتر دەکات [٢٢٤].

لە ئابی ١٩٩٤ لە دیمەشق کۆبوونەوەیەکی تری سێ قۆڵی لە لایەن دەوڵەتە دراوسێکان بەسترا، و هەر سێ وڵات جارێکی تر جەختیان لە سەر پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق کردەوە، و مکوڕبوونی خۆیان راگەیاند لە سەر ئەوەی دژی هەر جۆرە هەنگاوێکن کە ببێتە هۆی دابەشکردنی خاکی عێراق [٢٢٥]. هەروەها لە ٨ ی ئەیلولی ١٩٩٥ کۆبوونەوەیەکی تری سێ قۆڵی لە نێوان وەزیرانی دەرەوەی( ئەنقەرە، تهران و دیمەشق) لە تەهران بەسترا، جارێکی تر هەڵوێستی پێشووی خۆیان دووبارە کردەوە و ترس و نیگەرانی خۆیان لە زۆربوونی چەك و تەقەمەنی لە هەرێمی کوردستان دەربڕی [٢٢٦].

لە سەر ئاستی عێراقیش کاتێك بینیان رژێمی عێراق بەم زووانە ناڕوخێت و شوێن پێی خۆی قایم کردووە، هەوڵیان دا دەسەڵاتی ناوەندی بگەڕێننەوە هەرێمی کوردستان و ئەم قەوارە سیاسییەی کە هاتۆتە ئاراوە لە ناوی بەرن، ئەگەر لە ساڵی ١٩٩١ – ١٩٩٤ پەیوەندی دیپلۆماسی نێوان عێراق و دەوڵەتە هەرێمییەکان روو لە کزی کردبێ ئەوە دیسان کەوتنە بەهێزکردن و توندتۆڵ کردنی پەیوەندییە سیاسییەکانی خۆیان لەگەڵ بەغدا و خوازیاری ئەوە بوون بە هەر نرخێك بێت رێڕەوی دۆزی کورد ئاراستەی بەغدا بکەن، هێماو ئاماژەکانی ئەم سیاسەتە زیاتر و زۆرتر هاتە بەر چاو، کاتێك سەردانی نێوان تورکیا و عێراق بۆ لای یەکتر وەگەڕکەوتەوە، (محمد سعید الصحاف) وەزیری دەرەوەی عێراق لە

(٢٢٣) روبرت اۆڵسن، مصدر سابق، ص ص ٦٣ – ٦٤؛ هێرش عەبدوڵڵا حەمە کریم، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦.

(٢٢٤) ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان، پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی پێنجەم،، ١٩٩٧، ل ١٧٢.

(٢٢٥) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٢.

(٢٢٦) روبرت اۆڵسن، مصدر سابق، ص ص ٦٥ - ٦٦.



شوباتی ١٩٩٥، سەردانی تورکیا کرد و داوای لێ کرد چی تر درێژە بە مۆڵەت دان بە مانەوەی هێزەکانی چاودێری نەوای ئارام و دژە فڕین نەدرێت و هەر دوو لا وا سەیری کێشەکە بکەن کە کێشەیەکی ناوخۆییە [٢٢٧].

لە بەرامبەردا تورکیا ئەوەی پێ راگەیاندن کە هیچ جۆرە گرفتێك نییە بەرامبەر هەر هەوڵێکی بەغدا بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی خۆی بۆ هەرێمی کوردستان [٢٢٨].

لە لایەکی ترەوە بۆ هەمان مەبەست (بۆلند ئەجەوید) سەرۆکی حیزبی چەپڕەوی دیموکراسی لە نیسانی (ئەپریلی )١٩٩٦ پلانێکی پێشکەش بە پەرلەمانی تورکیا کرد، و ئەوەی خستەڕوو کە پێویستە هەرێمی کوردستان بگاتە رێکەوتنێك و دەسەڵاتی بەغدا بگەرێتەوە کوردستان، هەروەها دەبێ ئەرك و چالاکییەکانی هێزی هاوپەیمانان لە (ئەنجێرنیك) دووبارە رێکخرێتەوە، هەروەها بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی پێویستە تورکیا پشتینەیەکی ئاسایش بە قووڵایی ( ٢ تا ١٥ کم ) لە ناو خاکی کوردستان دروست بکات [٢٢٩].

دەوڵەتانی هەرێمی بەوەش نەوەستان، بەڵکو رۆڵێکی گرنگیان گێڕا لە خۆش کردنەوەی ئاگری شەڕی ناوخۆیی، و لە دەستتێوەردان و هاندانی هەردوو لایەنی شەڕەکە دەستیان نەپاراست، و تا رادەیەکی زۆر توانیان ئەو یەکگرتوویە و یەکدەنگییە و یەك هەڵوێستییە کە لە دوای راپەڕین لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هاتبووە ئاراوە نەهێڵن، و لاوازی بکەن، تەنانەت تەگەرە و ئاستەنگی زۆریان خستە بەردەم هەوڵی دەوڵەتە گەورەکان وەك ئەمەریکا و فەرەنسا کە دەیانویست ئاگری شەڕی ناوخۆ پەرەنەستێنێ، و کۆتایی بە ناکۆکییەکانی هەردوو پارتی سەرەکی کوردستان بهێنن.

ئەوەتا کاتێك فەرەنسا وەك دەوڵەتێکی زلهێزی جیهانی لە ٢٢ ی تەمووز ( جولیو) ی ١٩٩٤ لە کۆشکی کۆماری ( ئەلیزا ) لە پاریس لە دوای زنجیرەیەك دانووستاندن بۆ کۆتایی هێنانی ناکۆکییەکانی نێوان پارتی و یەکێتی( رێکەوتن نامەی پاریس) راگەیەندرا و بڕیار بوو( مسعود بارزانی و جەلال تالەبانی) بە ئامادەبوونی سەرۆك کۆماری فەرەنسا ( فەرەنسۆ میتران) ئیمزای

(٢٢٧) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ٣١٢.

(٢٢٨) بڕوانە: د.جلال عبدللة معوض، صناعةالقرار فی ترکیاوالعلاقات العربیة-الترکیة، الطبعة الاولی، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، اب١٩٩٨، ص ص١٥٤-١٥٥.

(٢٢٩) رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٢٦٣، ١٥/٤/١٩٩٦.

بکەن، تورکیا ئەم ڕێککەوتننامەی بە هاودژ لەگەڵ بەرژەوەندییە نەتەوییەکانی خۆی پێناسە کرد و ڕێگری کرد لەوەی سەرکردە کوردەکان لە تورکیاوە بەرە و پاریس بچن، (مومتاز سوسیال) وەزیری دەرەوەی تورکیا زۆربەتوندی دژی ئەم ڕێککەوتننامەیە وەستا، وای بۆی دەچوو کە ئەمە هەوڵدانێکی ڕۆژئاوایی – فڕەنسییە بۆ بە نیودەوڵەتی کردنی دۆزی کورد، و دامەزراندنی کیانێکی سەربەخۆی کوردی لە باشووری کوردستان و ڕاکیشانی پشتگیری نیۆدەوڵەتییە بۆی، بە شێوەیەکی ئاشکرا دژایەتی خۆیان بۆ ڕۆڵی( کەندالٚ نەزان) سەرۆکی پەیمانگەی کوردی لە پاریس نیشاندا، تاوانباری کردن بە وەی دژایەتی بەرژەوەندییەکانی تورکیا دەکەن، بۆیە تورکیا دەستی بە هەڵمەتەکی سیاسی و دیپلۆماسی و ڕاگەیاندنی کرد لەگەڵ دەوڵەتە هەرێمی و ڕۆژئاواییەکان بۆ سەرنەگرتنی ڕێککەوتنامەکە لەم پێناوەشدا وەزیری دەرەوەی تورکیا سەردانی فەڕەنسای کرد، لە ئەنجامدا ڕێککەوتنامەکە هەرەسی هێنا. [230]

دەوڵەتە هەرێمییەکان بە تایبەت تورکیا بەردەوام بوون لە سەر گوشار خستنە سەر کورد بۆ دەست هەڵگرتن لە مافە نەتەوەییەکان و لەم ڕووەوە تەواوی توانای سیاسی و ئابووری و دیپلۆماسی خۆیان بەکارهێناوە. سەرەڕای ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرە و پیلانانەی بۆ کورد دانرابوون، بەڵام نەیانتوانی وەك خۆیان دەیانوویست دۆزەکە بەرەو هەڵدێری و نابووتی ببەن، کاتێکیش قەیران و تەنگ و چەلەمەی نێوان ئەمەریکا و عێراق دوای ڕووداوەکانی ١١ ی ئەیلول زیادی کرد و هێما و ئاماژەکانی گۆڕانکاری چاوەڕوان کراو لە عێراق بەدەرکەوتن تورکیا لە سەر دوو ئاستی سیاسی جیاواز هەڵسوکەوتی لەگەڵ قەیرانەکە کرد، لە لایەکەوە تورکیا دژی هەر جۆرە گۆڕانکارییەك بوو لە عێراقدا کە، لە ڕێگەی هێزی سەربازی دەرەکییەوە بێت، بە هۆی ئەو ئەزموونەی لە شەڕی دووەمی کەنداوەوە وەری گرتبوو، وای بۆی دەچوو ئەگەر شەڕی دووەمی کەنداو کیانەکەی دیفاکتۆی کوردی لەگەڵ خۆی هێنابێ ئەوە ئەمجارە ئەم دیفاکتۆیە بە ئاراستەی سەربەخۆی دەچێت، هەر لە بەر ئەمەش بۆ ڕێگرتن لە هەڵگیرسانی شەڕ بە هاوکاری دەوڵەتانی هەرێمی و عەرەبی کۆبوونەوەییەکی گەورەیان لە ٢٣ی کانوونی دووەم ٢٠٠٣ دا لە ئەنقەرە ڕێکخست بۆ دۆزینەوەی دەریچەیەك بۆ قەیرانی عێراق. دەوڵەتە بەشداربووەکان لە ڕاگەیاندێکدا هەڵوێستی خۆیان ئاشکرا کرد :" دەوڵەتانی ناوچەکە

(٢٣٠) الحزب الديموقراطي الكوردستان( ح.د.ك) مكتب الدراسات و البحوث المركزي، الاقتتال الـداخلى فـى كوردستان العراق، كيف اندلع و من المسول عنه من منشورات مكتب الدراسات و البحوث المركزي، الطبعـه الاولى، ١٩٩٧، ص ص٤٢٥-٤٢٦.



خوازیاری ئەوە نین شەڕێکی تر لە دەڤەرەکە ڕووبدات و پێویستە ئەمەریکا لە جێگای شەڕ پەنا ببانە ڕێگا چارەیەکی ئاشتییانە."[231]

لە لایەکی ترەوە تورکیا کە بۆی ڕوون بۆتەوە لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕەکە ناتوانرێ لە دەرەوەی هاوکێشە سیاسییەکانی ناوخۆی عێراق و هەرێمی و نێو دەوڵەتی بێ، کەوتە وتووێژ و دانووستاندن لەگەڵ ئەمەریکا، دۆزی کورد و ئەزموونە دیموکراسییەکەی، تەوەری هەرە گرنگ و پڕ کێشمە کێشی دانووستاندنی نێوان هەر دوو لا بوو، لە ئەنجامدا هەر دوو لا گەیشتە ڕێککەوتنامەیەك [232] کە لایەنی جۆراوجۆری لە خۆگرتبوو لە ڕووی سەربازییەوە بە گوێرەی ڕێککەوتنامەکە تورکیا لە بەرامبەر هاوکاری کردنی ئەمەریکا و کردنەوەی بەرەی باکووری شەڕ، مافی ئەوەی هەبوو بە درێژایی ٤٠ کیلۆمەتر سوپای خۆی لە ناو خاکی عێراق جێگر بکات و ئاماژەشی بەوە کرد بوو تورکیا لە دوو حاڵەت دەتوانێ هێز دژی کوردەکان بەکاربهێنێ، یەکەم کاتێ کوردەکان بیانەوێ کەرکوك بخەنە سەر هەرێمی کوردستان، دووەم ئەو کاتە کە کوردەکان بیانەوێ پاك سازی ئەتنیکی بکەن و زیان بە تورکمانەکان بگەینن.[233]

خاڵێکی تر کە مەبەستێکی ئابووری هەبوو ئەمەریکا ڕازی بوو بە بڕی ٢ میلیارد دۆلار یارمەتی تورکیا بدات لە ماوەی ١٥ ساڵیش زیاتر لە ٢٤ ملیاد دۆلار قەرز بداتە ئەم دەوڵەتە. خاڵی سێیەمیش کە ڕەهەندێکی سیاسی هەبوو، ڕێکەوتنەکە جەختی لەسەر ئەوەی کرد کە ئەمەریکا بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نادات خاکی عێراق پارچە پارچە بکرێت و ڕێگاش لە دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەگرێت.[234]

(٢٣١) د. احمد نوري النعيمي، العلاقات العراقيـة- - التركيـة، الواقـع و المستقبل، مجلـة العلـوم الـسياسية، العدد ٢٩، جامعة بغداد، تشرين الاول، ٢٠٠٤، ص ٣٣.

(٢٣٢) شـایانی باسـە هەنـدێك لـە سەرچـاوەکان ئـەم ڕێککەوتننامـەی نێـوان ئەمـەریکا و تورکیـا، بـە یادداشتنامە ( المذكرة ) ناوی دەبەن، بڕوانە : محمد نورالدين، اهميـة العـراق لتركيـا في : احمـد يوسـف احمـد و اخرون، احتلال العراق و تداعياته، عربيا و اقليما و دوليا، بحـوث و مناقـشات النـدوة الفكريـة نظمهـا مركـز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الاولى، بيروت، اب ٢٠٠٤، ص ص ٤١٤ — ٤١٥.

(٢٣٣) زریان ڕۆژهەلاتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٥ - ١٦.

(٢٣٤) محمد نورالدين، اهمية العراق لتركيا فى: احمد يوسـف احمـد واخـرون، مـصدر سـابق، ص٤١٣،عومـەر نوردینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٤.

شایانی باسە ئەنقەرە لە رێگای ئەم رێککەوتننامەیەوە دەیویست چەند ئامانجێکی گرنگ و ستراتیژی مسۆگەر بکات لەوانە گێڕانی رۆڵێکی گرنگ و بنەڕەتی سەبارەت بە ئایندەی باشووری کوردستان و داهاتووی عێراق، مەبەستی تورکیا لە هاتنە ناوەوەی سوپا بۆ ناو خاکی کوردستان بە قوولایی ٤٠ کیلۆمەتر بریتی بووە لە دروستکردنی مەیدانێکی سیاسی و سەربازی بۆ ئەوەی لەوێوە بتوانن کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم بە فیدرالی بوونی عێراق و رێگرتن لە هەر گۆرانکارییەك کە بەرژەوەندی کوردی تێدابێ، لە لایەکی ترەوە بە ئامادەبوونی هێزی سەربازی رێگای بۆ ئەوەی خۆش دەکرد کە مەسەلەی تورکمان زیاتر زەق بکەن وەك کارتێکی سیاسی بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان گەمەی پێ بکەن.[٢٣٥]

لە بەرامبەر ئەم رێککەوتننامەیەدا هەندێك لە لایەنە نەتەوە پەرەستەکانی تورکیا پێیان وابوو دەبێ ئەمەریکا سەنەدی مەرگ و نەمانی کورد ئیمزا بکات و تەواوی مەرج و خواستەکانیان سەبارەت بە کوردەکان و ئایندەی سیاسی عێراق پەسەندی بکات، لەوانە رەت کردنەوەی سیستەمی فیدرالی و دامەزراندنی حکوومەتێکی سەنترالیزمی توند لە بەغدا و رێگەدان بە دەستێوەردانی لە کاروباری کوردەکان بەبێ گوێدانە هیچ دەسەڵاتێکی ئەمەریکی، و داماڵینی چەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بەشداری کردن لە بڕیاردانی چارەنووسی سیاسی عێراق، دان پێ دانان بە رۆڵی تورکیا و پاراستنی تورکمانەکان و ماندێیت بە سەریاندا. دابینکردنی بەشی نەوت لە کەرکوك و موسڵ[٢٣٦]، کاتێك بۆیان دەرکەوت ئەمەریکا ئەو داوایانەی تورکیای رەت کردووە و بەڵێنی تەواوی پێ نەداون، لەسەر هەندێك بابەت و خاڵی تر لەگەڵ حکوومەتی تورکیا رێککەوتووە، کەوتنە دژایەتی کردنی رێککەوتننامەکە لە ئەنجامدا بووە هۆکاری سەرەکی سەرنەگرتنی رێککەوتنامەکە و رەتکردنەوەی لە لایەن پەرلەمانی ئەو وڵاتەوە.[٢٣٧]

(٢٣٥) زریان رۆژهەڵاتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٧ — ٢٠.

(٢٣٦) صلاح بدرالدين، الكورد و العرب، اتحاد اختياري و شراكة عادلة، مطبعة: حاجي هاشم، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٤، ص ص ٣٥ — ٣٧.

(٢٣٧) لە یەکەمی ئاداری ٢٠٠٣ پەرلەمانی تورکیا دژی رێککەوتننامەی( تورکی - ئەمەریکی ) دەنگی دا و رێککەوتننامەکەی حکوومەت دەنگی پێویستی نەهێنا واتا ٢٦٤ بە دەستی هێنا بەرامبەر ٢٥١ دژی وەستان و ٩ کەس دەنگیان نەدا، رێککەوتننامەکە پێویستی بە ٢٦٨ دەنگ بوو شایانی باسە ئەحمد نەژدەت سیزەر سەرۆك کۆماری تورکیا و



بەمەش کوردەکانی عێراق لەم بارودۆخە قەیراناویەدا گەورەترین هاوپەیمانی جیهانیان دەست کەوت و لە پیلانێکی گەورەی تورکیا رزگاری بوو و بەرەی باکووریش بە هاوکاری، و پاڵپشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێنا.[٢٣٨]

لە دوای گۆڕانکارییەکانی ( ٩ ) ی نیسانی٢٠٠٣ لە عێراق[٢٣٩]و دارِمانی رژێمی بەعس، پەیوەندی نێوان تورکیا و هەرێمی کوردستانی عێراق خۆی لە بازنەیەکی ئاڵۆز و قەیراناویدا دیتەوە، هەڕەشە و گوشارەکانی تورکیا بۆ دەستوەردان لە کاروباری ناوخۆیی کوردستان هەڵکشان و بەرز بوونەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینی، لەم رووەوە ئەگەر لە دوای دارِمانی رژێمی عێراق، تا رادەیەك سووریا و ئێران لە بەر سەرقاڵ بوونیان بە هەندێك کێشەی تر و سەرهەڵدانی کۆمەڵێك هاوکێشەی سیاسی نوێ لە عێراق و دەڤەرەکە، هەڵوێستەکی نەرمتر و لە سەرخۆیان گرتبێتەبەر لە هەمبەری باشووری کوردستان. ئەوا لە بەرامبەردا تورکیا وەك قسەکەرێك بە ناوی ئەوانیش بە ئاشکرا دژایەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەکات و هەموو هێز و توانای خۆی لە سەر ئاستی ناخۆی عێراق و هەرێمی و نێودەوڵەتی خستۆتەگەڕ بۆ تەنگ پێ هەڵچنینی دۆزی کورد و تەگەرە خستە بەردەم چارەسەربوونی و زۆر بە ئاشکرا دژایەتی خۆی بۆ مافەکانی گەلی کوردستان راگەیاندووە بە کارت و ئامرازی جۆراوجۆری ئابووری و سەربازی هەڕەشە و گوشاری بۆ سەر **کورد هێناوە.**

سەرۆك پەرلەمان ( بۆلنیت ارینتیچ ) کە سەر بە حزبی داد و گەشە پێدان بوو هاوکاری سەرەکی سەرنەگرتنی ئەم رێککەوتننامەیە بوون، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە؛ محمد نورالدين، اهمية العراق لتركيا....، ص ص ٤١٦ — ٤١٧.

(٢٣٨) مایکل گەنتەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.

(٢٣٩) پڕۆسەی رزگاکردنی عێراق کە لە لایەن ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بەڕێوە چوو بووە هۆی رووخانی رژێمی بەعسی عێراقی کە لە ساڵی ١٩٦٨ تاکو ٢٠٠٣ فەرمانڕەوایی کرد، ئەم پڕۆسەیە ناوی جۆراوجۆری لێ نراوە وەك شەڕی سێیەمی کەنداو، شەڕی ئازادی عێراق، پڕۆسەی رزگارکردنی عێراق، ئەم پڕۆسەیە کە لە ٢٠ ی ئاداری ٢٠٠٣ دەستی پێ کرد وە لە ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ هێزەکانی ئەمەریکا توانیان شاری بەغدا کۆنترۆل بکەن هەر بۆیە هەندێ جار بەم پڕۆسە دەگوترێ گۆڕانکارییەکانی ٩ ی نیسان، شایانی باسە ئەمەریکا و بەریتانیا بە پێی بڕیاری ١٤٨٣ کە لە ٢٢ی ئایاری ٢٠٠٣دا دەرچوو خۆیان وەك دەوڵەتی داگیرکەر لە قەڵەمدا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: التقرير الاستراتيجي العربي ( ٢٠٠٣ — ٢٠٠٤ )، مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية، القاهرة، ٢٠٠٤، ص ص ٣٢ — ٤٣.

# بەشی دووەم

## گۆڕانکارییەکانی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ لە عێراق و کاریگەرییەکانی لەسەر دۆزی کورد

**باسی یەکەم: رووخانی رژێمی عێراق لە لایەن ئەمەریکاوە.. هۆکارەکان**
**باسی دووەم: دروستبوونی گوتاری سیاسی یەکگرتوو**
**باسی سێیەم: دەستووری هەمیشەیی عێراق و مافەکانی گەلی کوردستان**

## باسی یەکەم

## رووخانی رژێمی عێراق لە لایەن ئەمەریکاوە..هۆکارەکان

لە دوایی داگیرکردنی کوێت لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ لە لایـەن عێراقـەوە[١]، ئەمـەریکا لـە ڕێـی هاوپەیمانییەکی جیهانییەوە و بە پشتگیری هەمـە لایەنـەی کۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی، هێزەکـانی عێراقی لە شوباتی ١٩٩١ لە خاکی کوێت وەدەرنا.[٢] ئەگەرچـی ئـەوکات دەتـوانرا کۆتـایی بـە فەرمانڕەوایی رژێمی دیکتاتۆری سەدام بهێنرێـت، بـەڵام لـە بـەر کۆمـەڵێك هۆکـاری نـاوخۆیی پەیوەست بە عێراق و هەندێك هاوکێشەی سیاسی هەرێمی، ئەمـەریکا خـۆی لـەم کـارە بـە دور گـرت.[٣] و کەوتـە پـەیڕەوکردنی سیاسـەتی دابڕانـدن و گۆشـەگیرکردنی عێـراق لـە کۆمـەڵگای نێودەوڵەتی، ئەم سیاسەتە کە لـە لایـەن ئیـدارەی بۆشـی بـاوك و دواتـریش لـە لایـەن ئیـدارەی کلینتۆنـــەوە درێـــژەی پێـــدرا، بـــووە مایـــەی گلـــەیی و رەخنـــەی پارێزگـــارە نوێیـــەکان (Neoconservatives).[٤]لە وانە (ورتیشارد ل. ئارمیتاج، جۆن بۆلتۆن، فرانـسیس فۆکۆیامـا، روبری کاغان، ویلیام کریستول، ریتشارد بیرل، بیتر رودمان، زالمای خلیل زاد، وۆڵفۆتێز) و پێیان وا بوو سیاسەتی دابڕاندن (ئیحتیوا کردن) لە هەمبەر رژێمـی عێـراق شکـستی هێنـاوە و خزمـەتی بەرژەوەندییەکانیان ناکەت.[٥] لەم رووەوە ئاماژەیـان بـەوە دە کـرد، کـە ئەگـەر سـەدام حسین و ڕژێمەکـەی، چـەکی کۆمـەڵکوژیان دەسـتکەوێ؛ ئـەو کـات ژیـانی هێـزە ئەمەریکییـەکان و هاوپەیمانەکانی وەك ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبییە میانڕەوەکان و بەشـێکی زۆر سەرچـاوەی وزەی جیهان دەکەوێتە مەترسییەوە. بۆیە داوایانکرد هەرچی زووە کار بۆ لادانی رژێمی سەدام بکرێت.[٦]

رووداوەکانی تیرۆریستی (١١) ئـەیلولی٢٠٠١، راسـتی بۆچـوون و تێـڕوانینی پارێزگـارە تازەکـانی زیـاتر سـەلماند و گۆڕانکارییـەکی گەورەشـی بـە سـەر سیاسـەت و سـتراتیژییەتی ئەمەریکا داهێنادا، لە هەمبەر جیهان بە گشتی و رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـە تایبـەتی، ئـەم رووداوە وایکرد ئیدارەی ئەمەریکا بە پەلەتر و کاریگەرانەتر کار بۆ لابردنی ڕژێمە دیکتـاتۆرو خۆسەپێنەرەکان بکات. ئەویش بە گرتنە بەری ستراتیژییەتێکی نوێ کە جەخت دەکاتـە سـەر وەشاندنی گورزی سەربازی پێوەختە[٧] لەم چوارچێوەیەدا عێـراق لـە دوای رووخانـدنی رژێمـە توند رەوە ئیسلامییەکەی تالّیبان لە ئەفغانستان لە تـشرینی ٢٠٠١، بـوو بـە دووەم شـوێنی پراکتیزەکردنی ئەم ستراتیژییە نوێیە، لێرەدا هەوڵ ئەدەین گرنگترین ئـەو هۆکـار و فاکتەرانـە بخەینە روو کە رۆڵ و کاریگەرییان کردە سەر ئیدارەی ئەمەریکا بۆ لادانی رژێمی بەعس:

---

(١) جرجيس فتح الله، مغامرة الكويت، الوجه و الخلفية، الجزء الاول، ١٩٩٨، ستوكولم، ص ١٧.

(٢) شوارتزكوف فى الخليج (النص الكامل لمذكرات)، ترجمة: حسام الـدين كساب المتـولى، الطبعة الاولى، مكتبة مدبولي، ١٩٩٣، ص ص ٢٠٧-٢١٣.

(٣) بروانە: مصدر نفسه، ص ص٢٩٩-٣٠٦.

(٤) هەرچەندە ناکۆکی لەسەر سەرەتا و کات و چونێتی سەرهەڵدانی پارێزگارە نوێیەکان هەیە، بەڵام زۆربـەی پسپۆڕان دەگەڕێنەوە بۆ شەست و هەفتاکانی سەدەی بیست. پارێزگارە نوێیەکان کۆمەڵێك رۆشنبیری لیبرالێن و جیاوازن لە پارێزگارە تەقلیدییەکان کە زیاتر واقعی و کەنار گیرن، و لە هەردوو باڵی راسترەوی مەسـێحی و راسترەوی سیاسی پێك دەهێن. لە دوای رووداوی ١١سێپتەبەر پارێزگـارە نوێیـەکان پێگـە و نفـووزی زۆریـان پەیدا کرد. ئایدۆلۆژیای پارێزگارە نوێیەکان گرنگی بە ئاراستەی ناوخۆ و دەرەوەی ئەمریکا دەدەت. لـە سـەر ئاستی ناوخۆ گرنگیی بە ژیانی کۆمەلایەتی، ئابووری و سیاسەتی ناوخۆ دەدات و لەلایەن (تێرین کریـستول) بەرێوەبەرایەتی دەکرا؛ ئاراستەی دووەم جەختی دەکردە سەر مەسەلە نێودەوڵەتییـەکان و سیاسـەتی دەرەوەی ئەمریکا. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بلێین پارێزگارەنوێییەکان سێ خاڵی سەرەکی کۆیان دەکاتەوە:

باوەڕ بوون بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت باشە و خراپە لە یەکتری جیا بکاتەوە.



باوەڕ بوون بەوەی کە هێزی سەربازی و ئارەزوی بەکارهێنانی ناوەڕۆکی پەیوەندی نیوان دەوڵەتانـە جەختکردنـەوە لەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی بەو پییەی هەرەشە لە بەرژەوەندییـەکانی ویلایەتـەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەن: بڕوانە؛ ستيفن هالبرو جوناثان كلارك التفرد الامريكي، المحافظون الجدد و النظام العالمي، ترجمة : عمـر الايـوبي، دارالكتـاب العربـي، بـيروت، ٢٠٠٥ ن، ٢٠؛ ئـاکۆ حەمـە کـەریم رەحـیم سـتراتیژی ولاّتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرنبەر رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، لـە دوای رووداووەکـانی ١١ی سـێپتەبەرەوە (نموونـەی عێراق) نامەیەکی ماستەری بلاّونەکراوە، کولێژی یاسا و رامیاری زانکۆی سەلاّحەددین، هەولێر ٢٠٠٨، ل٧٦

(٥) مايكل هدسون، الرؤية الاستراتيجية الأمريكيةالجديـدة للمنطقـة العربيـة والعـالم في: احمـد يوسـف احمـد و اخرون مصدر سابق، ص ٧١؛ ستيفن هالبرو جوناثان كلارك، مصدر سابق، ص ١٩٥

(٦) مايكل هدسون، مصدر سابق ص ٧١؛ ستيفن هالبرو جوناثان كلارك، مصدر سابق، ص ١٩٥.

(٧) د. السيد ولد أباه، العالم بعد (١١) سبتمبر ٢٠٠١، الاشكاليات الفكرية و الاستراتيجية، الطبعة الاولى، مكتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ٨٥.

## داماڵینی چەکی کۆمەڵکوژی عێراق:

لە دوای وەدەرنانی سوپای عێراق لە کوێت لە شوباتی ١٩٩١ دا [٨]، ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بە بڕیاری (٦٨٧)، لە٣ی نیسانی ١٩٩١دا گەمارۆی ئابووری بە سەر عێراقدا سەپاند و لابردنی گەمارۆی ئابووری بەستەوە بە داماڵینی چەکی کۆمەڵکوژی عێراق و دەستبەرداربوون و وازهێنانی رژێمی بەعس لە بە دەست هێنانی چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی، ئەتۆمی، هەر بە پێی ئەم بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایش، لیژنەیەکی تایبەت بە ناوی لیژنەی پشکێنەرانی نێودەوڵەتی بۆ گەڕان بە دوای چەکی کۆمەڵکوژی عێراق و لە ناوبردنیان دروست بوو.[٩]

هەر لە سەرەتای دەست بەکاربوونی لیژنەی پشکنەرانی نێودەوڵەتی تایبەت بە داماڵینی چەکی کۆمەڵکوژی عێراق، رووبەڕووی تەگەرە و کۆسپی زۆر بووە، رژێمی بەعس بە بیانوو و پاساوی جۆراوجۆر هەوڵی بە بنەبەست گەیاندنی کارەکانیان دەدا، هەر بۆیەش لیژنەکە بەردەوام عێراقی بە سەرپێچی کەر لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش تاوانبار دەکرد ئەمەش خۆی لە خۆیدا گرژی و ئاڵۆزی زۆری لە نێوانیاندا دروست کرد.

لە ١٧ ی کانونی دووەمی (ینایر) ١٩٩٨دا، سەدام حسێن ڕایگەیاند هەموو ئەندامانی لیژنەی نێودەوڵەتی تایبەت بە چەکی کۆکووژ، لە عێراق دەردەکات و لە ٢١ ی کانوونی دووەمی ١٩٩٨ دا، حکوومەتی عێراق هەموو چالاکییەکانی پشکنەرانی نێودەوڵەتی وەستاند، [١٠] ئەمەش وایکرد کە (ریتشارد بتلر) سەرۆکی لیژنەکە هەموو پشکنەرانی خۆی لە عێراق بکشێنێتەوە و کۆتایی بەکارەکانی خۆی بهێنێت.[١١]

---

(٨) شوارتزکوف، مصدر سابق، ص ٢٧٣.

(٩) بڕوانە : جعفر ضياء جعفر، اسلحة الدمار الشامل، الاتهامات و الحقائق، في : احمد يوسف احمد و آخرون، مصدر سابق ص١٦٩؛ د. مصطفى الانصاري، العراق والامم المتحدة (١٩٩٠-١٩٩٧)، بنك المعلومات العراقى، ١٩٨٨، ص ص٨٢- ٨٣؛ جيف سيمونز، التنكيل بالعراق، العقوبات والقانون والعدالة، الطبعة الثانية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٨، ص ص٧٩-٨٠.

(١٠) د. محمد السيد سعيد و آخرون، الخليج و المسألة العراقية، مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية بالاهرام، القاهرة، مارس ٢٠٠٣، ص ٣٠.

(١١) مايسة مدني محمد مدني، حرب الخليج الثالثة من منظور المدرسة الواقعية في العلاقات الدولية، رسالة ماجستر غير منشورة، في جامعه النيلين، قسم العلوم السياسية، ٢٠٠٥، ص ٩٨؛ يفجينى بريماكوف، العالم بعد ١١ السبتمبر و غزو العراق، ترجمه عبدالله حسن، الطبعة الاولى، مكتبة العيكان، الرياض، ٢٠٠٤، ص ١٦٤.



سەدام حسێن و رژێمەکەی لە ڕێگای ئەم گەمەو مانۆرە سیاسییانەوە دەیویست گوشار بخاتە سەر ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بەوەی کە گەمارۆی ئابووری لە سەری لابردرێت و جارێکی تر دەرفەتی بۆ بڕەخسێ بۆ پەرەپێدانی بەرنامەی چەکی کۆمەڵکوژی خۆی، بەڵام ڕووداوەکانی (١١) سپتمبری ٢٠٠١، پیلان و نەخشەی حکوومەتی بەعسی تێکدا و ئاراستە و ڕەوتی ڕووداوەکان بە لایەکی تردا ڕۆیشت.

لە دوای کردەوە تیرۆرستییەکەی ١١ی ئەیلول، گوشارەکانی ئیدارەی ئەمەریکا بۆ ملکەچ کردنی عێراق بۆ بڕیارەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی چڕتر و زیاتری لێ هات، ئەمجارە جیاواز لە جارەکانی پێشوو ئیدارەی ئەمەریکا بە سەرۆکایەتی (جۆرج دەبلیو بۆش) چەکی کۆمەڵکووژی عێراقی کردە پاساوێکی ڕەوا بۆ کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایی رژێمی بەعس.

لە ١١ ی ئەیلولی ٢٠٠٢ دا بەرێز جۆرج بۆش لە وتارەکەی خۆیدا لە بەردەم کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دا، داوای لە جیهان و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کرد هەڵوێستێکی توند و یەکلاکەرەوە لە هەمبەر چەکی کۆمەڵکوژی کیمیاوی و بایولۆژی عێراق وەربگرن. بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم وتارەی بۆش لە هەمان رۆژدا (کۆشکی سپی) بەڵگەنامەیەکی بە ناوی (عقدٌ من الخداع والتحدي) بڵاوکردەوە، کە تێیدا ئاماژە بە پێشێلکارییەکانی سەدام حسین کردبوو؛ بەرامبەر بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵگەنامەکە ئاماژەی بەوەی کردبوو کە سەدام حسین خاوەن بەرنامەی ناوەکی بووە پێش شەڕی کەنداو و ئێستاش بەردەوامە لە پەرەپێدانی، ئەم بەڵگەنامە پشت ئەستوور بوو بە راپۆرتی ٩ ی ئەیلولی ٢٠٠٢ کە لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی ستراتیژی (معهد الدراسات الاستراتيجيه) دا دەرچووبوو، و گەشتبووە ئەو باوەڕەی یاخود ئەو ئەنجامەی کە رژێمی بەعس دەتوانێ لە چەند مانگێکی کەمدا بۆمبی ئەتۆمی دروست بکات.[١٢]

بە هەمان ئاراستە لە ٢٤ی ئەیلولی ٢٠٠٢دا بەریتانیا دۆسییەکی لە ژێر ناوی (چەکی کۆمەڵکوژی عێراق و هەڵسەنگاندەکانی حکوومەتی بەریتانیا) دەرکرد، تێیدا زۆر بە وردی ئاماژەی بە چەکە کۆمەڵکوژەکانی عێراق کرد بوو کە تیایدا هاتبوو: [١٣]

عێراق بۆتە خاوەنی چەکی کۆمەڵکوژ، ئەگەری ئەوە هەیە چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی بە کاربهێنێ لە هەر روو بە رووبوونەوەیەکدا.

---

(١٢) ماسية مدني محمد مدني، مصدر سابق، ص ٩٨.

(١٣) جعفر ضياء جعفر، مصدر سابق، ص ١٦٩.

ڕژێمی سەدام بەردەوامە لە پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمی، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێشێل کردنی بنەماکانی پەیمانی ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی کۆمەڵکووژە و ناکۆك و هاودژە لەگەڵ بڕیاری (٦٨٧) ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی.

عێراق بەردەوامە لە گرنگی پێدان بە چەکی کۆمەڵکووژ و بە دەستهێنانی ئەو مووشەکانەی کە بە بەردی بناغە دادەنرێن بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی هەرێمی خاوەن توانا.

عێراق خاوەن کۆمەڵێك مووشەکی سکودی پێشکەوتووە کە دەتوانرێ بگاتە تورکیا، ئێران، ئیسرائیل.

بەرنامە و نەخشەی سەربازی عێراق لە هەر هەڕەشە و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئایندە دا بریتییە لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی.

لە هەمان چوارچێوە دا لە ٢٧ ئابی ٢٠٠٢ (دیك چینی) جێگری سەرۆك کۆماری ئەمەریکا لە وتەیەکدا لە بەردەم ئەنجوومەنی شەرکەرە دێرینەکان (مجلس المحاربين القدماء) دا، ئاماژەی بەوەی کرد کە "گومانی تێدا نییە کە سەدام حسێن خاوەن چەکی کۆمەڵکووژە و هەوڵی بە دەستهێنانی دەدات بۆ ئەوەی لە دژی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بەکاری بهێنێ هەروەها ڕایگەیاند بوونی چەکی کۆمەڵکوژ لە دەست ڕژێمیکی دیکتاتۆری وەك سەدام یاخود گروپە تیرۆرستییەکان کە هەردوو لا هاوپەیمان و هاوکاری یەکترن، گەورەترین هەڕەشە و مەترسییە کە مرۆڤ دەتوانرێ هزری تێدا بکات، بۆیە کات لە بەرژەوەندی ئێمە دا نییە و مەترسییەکانی دەستێوەرنەدان زۆر گەورەترن و زیاترن لە مەترسییەکانی دەستێوەردان."(١٤)

بەم شێوەیە ئیدارەی ئەمەریکی خۆی یەکلاکردەوە بەوەی بوونی ڕژێمیکی دیکتاتۆری دڕندەی وەك ڕژێمی بەعس کە خاوەن چەکی کۆمەڵکوژە جێگای قبووڵ کردن نییە و یان دەبێ واز لە چەکی کۆمەڵکوژ بهێنێ و ملکەچی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش بێ یان ڕووبەڕووی وەشاندنی گورزی سەربازی دەبێ. لەم پێناوەشدا و بە پێی بڕیاری (١٤٤١) کە بە تێکڕای دەنگی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە (٨) ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ دەرکرا، دوا دەرفەت درا بە حکوومەتی عێراقی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەواو دۆور لە گەمە و مانۆڕی

(١٤) وەرگێراوە لە: اريك لوران، حرب آل بوش، ترجمة: سلمان حرفوش، الطبعە الاولى، دارالخيال للطباعة و النشر، بيروت، ٢٠٠٣، ص ١٢٩.



سیاسی هاوکاری پشکنەرانی نێودەوڵەتی بکات.(١٥) بەڵام ئەم بڕیارە نەیتوانی ڕێ لە هەڵگیرسانی شەڕەکە بگرێت، کۆلن پاول وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا و کۆندالیزا رایس ڕاوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی ئەو کاتی ئەمریکی، ڕژێمی بەعسیان بە سەرپێچی کردن لە بڕیارەکە و ملکەچ نەبوون بە ئیرادەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تاوانبار کرد، لەم ڕووەوە (کۆلن پاول) ئاماژەی بەوەی کرد " بڕیاری (١٤٤١) دەرفەتێك بۆ کە بە عێراق درا تا چەکە کۆمەڵکوژەکانی ئاشکرا بکات بەڵام عێراق لە ماوەی (١٢) ساڵدا گشت بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی پێشێل کردووە و بە پێی ئەم بڕیارە دوا دەرفەت بە عێراق درا، بەڵام سوودی لێوەر نەگرت "(١٦)، هەروەها (کۆندالیزا رایس) جەختی لە سەر پێشێل کردنی بڕیاری (١٤٤١) کردووە لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە و ڕایگەیاند " عێراق پێشێلی بڕیاری (١٤٤١) کردووە بە تایبەت ئەو ڕاپۆرتەی کە دەبوو بە پێی بڕیارەکە بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بنێرێت. ڕاپۆرتەکە لە چەند بەڵگەنامەیەك پێك هاتووە کە ئامانجەکەی چەواشەکردنی قەوارەی ڕاستەقینەی عەمبارە ناوەکییەکانی عێراقە، ئەمەش پێشێلکاری بڕیارەکەیە و هیچ شتێك ناسەلمێنێت کە عێراق وڵاتێك بێ مکور بێت لە سەر چەك داماڵین، بەڵکو دەوڵەتەکە چەکەکان دەشارێتەوە، عێراق تا ئێستا واکار دەکات لەگەڵ پشکێنەران کە ئەمە گەمەیەکە بەڵام دەبێ بزانێ کە کات لە بەرژەوەندی ئەودا نییە."(١٧)

لە لایەکی ترەوە لە ٦ ی ئاداری ٢٠٠٣ دا، واتە چەند ڕۆژێك پێش پرۆسەی داگیرکردنی عێراق، جۆرج بۆش سەرۆکی ئەمەریکا سووربوونی خۆی بۆ داماڵینی چەکی کۆکوژی عێراق و لابردنی ڕژێمەکەی دووپات کردەوە و ڕایگەیاند: " ئێمە لە بەردەم کات و ساتێکی ناسك و یەکلاکەرەوە داین بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هەڕەشە و مەترسییانەی ڕووبەڕووی گەلی ئێمە و ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی دەبێت، بە هۆی ڕژێمی سەدام و چەکە کۆمەڵکوژ و ترسناکەکەی کە مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە لە ستەم و دوژمنکاری و ئەنجامدانی تاوان. سەدام و چەکە کۆمەڵکوژەکەی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ وڵاتەکەی و گەلی ئێمە و تەواوی جیهان، ئەگەر

(١٥) هانس بليكس، نزع سلاح العراق، الغزو بدلا من التفتيش، الطبعة الاولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، آب ٢٠٠٥، ص ٩٨.

(١٦) وەرگێراوە لە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٢٠)، ٦ ی شوباتی ٢٠٠٣، ل ٨.

(١٧) وەرگێراوە لە: هەمان سەرچاوە، ٨-٩.

کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرەنگاری ئەم هەڕەشەیە نەبێتەوە ئەوا پەنا بۆ هێز دەبەین، ئێمە ناتوانین دەستەوەستان بین، تاکو بزانین تیرۆریستان و ئەم دەوڵەتانەی دالدەیان دەدەن چی دەکەن، ئێمە سوورین لە سەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هەڕەشانە لە هەر کوێیەك بێت. ئێمە گەلی ئەمەریکا بە جێ ناهێڵین بۆ ئەوەی لە ژێر ڕەحمەتی ڕژێمی سەدام و چەکە کۆمەڵکوژەکەیدا بن."[18]

بەم شێوەیە دۆسییەی چەکی کۆمەڵکوژی عێراق یەکێك بووە لە کارتە هەرە گرنگەکانی ئیدارەی ئەمەریکی بۆ لادانی ڕژێمی بەعس. بە هۆی ئەوەی بوونی ڕژێمێکی دیکتاتۆری وەك ڕژێمی بەعس خاوەن چەکی کۆمەڵکوژ و هاوپەیمان لەگەڵ تیرۆریستان گەورەترین هەڕەشە و مەترسییە بۆ سەر تەواوی جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. شایانی باسە لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق، ئەمەریکا لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی (دەیڤید کای) پێك هێنا بۆ گەڕان بە دوای چەکی کۆمەڵکوژی عێراق، بەڵام لیژنەکە ڕاگەیاند هیچ جۆرە چەکێکی کۆمەڵکووژی نەدۆزییەوە.[19]

**پەیوەندی عێراق بە ڕێکخراوی تیرۆریستی (القاعدة):**

لە دوای کردەوەی تیرۆرستی ١١ ی ئەیلولی(سیپتەمبەر) ٢٠٠١ لە ئەمەریکا؛ بەرەنگار بوونەوەی تیرۆر و ڕاونانی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان و وشك کردنەوەی سەرچاوەی داراییان، بە هەموو شێوازێکی سەربازی و هەواڵگری و یاسایی، و گوشار خستنە سەر و لێدانی ئەو ڕژێمانەی پەیوەندییان بە ڕێکخراوەکانی تیرۆریستییە وە هەیە و دالدەیان دەدەن، بوو بە بەشێکی گرنگی ستراتیژییەی نوێی ئەمەریکا.[20]

هەر لە دوای ئەم کردارە تیرۆرستییەی کە ڕووبەڕووی ناوەندی بازرگانی جیهانی پێنتاگۆن بووەوە بە گوشاری ڕاستەوخۆی ئەمەریکا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی هەر دوو بڕیاری

(١٨) وەرگێراوە لە: کریستو بتر – روبرت بتر و آخرون، کذبات بوش خمس الکبیرة، ترجمة: محمود علي عیسي، الطبعة الاولی، دمشق، ٢٠٠٤، ص ١١١.

(١٩) بڕوانە: جایمس بوفارد، خیانە بۆش، ، الطبعة الاولی، مکتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٦، ٣٥٥؛ د. محمد علي حوان، العرب و امریکا، الطبعة الاولی، مکتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٦، ص١٧٣؛ د.أحمد طه خلف الله، سقوط العرب فی الحرب علی العراق (الأسباب و النتائج)، الطبعة الاولی، دار الکتاب العربی، دمشق، ٢٠٠٤، ص٢٧.

(٢٠) عماد فوزي شعیبي، الصورة النمطیة للعالم و النظام العالمي في الاستراتیجیة الامریکیة الجدیدة و موقع العراق کساحة عملیات فیها في: احمد یوسف احمد أخرون، مصدر سابق، ص ص ١١١-١١٣.



(١٣٦٨) و (١٣٧٣) دەکرد، کە هەر دوو بڕیارەکە جەختیان کردە سەر گرتنە بەری هەموو ڕێوشوێنەکی پێویست و بەکارهێنانی هەموو ئامرازێك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هەڕەش و مەترسییانەی کە ڕووبەڕووی ئاشتی و سەقامگیری جیهان دەبێتەوە و داواش لە هەموو دەوڵەتانی جیهان کرا کە خۆیان بە دوور بگرن لە هەر جۆرە پاڵپشتێکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ بۆ ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان یاخود دالدەدانیان و دروستکردنی پەناگای ئارام بۆیان.[21]

لەمیانەی ڕاگەیاندی شەڕی دژە تیرۆر لە سەرتاسەری جیهان (جۆرج دەبلیو بۆش) سەرۆکی ئەمەریکا لە ٢٠ی ئەیلولی ٢٠٠١ دا لە بەردەم کۆنگرێسی ئەمەریکا ڕایگەیاند: " هەموو دەوڵەتێك دەبێ خۆی یەکلا بکاتەوە و پێویستە لە سەریان بڕیار بدەن لەگەڵ مانن یا لە دژمانن."[22]

لەم چوارچێوەیەدا ئەمەریکا لە ٢٨ ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ دا دەوڵەتانی (عێراق – سووریا –ئێران – کۆریای باکوور) ی بە چەقی شەڕەنگێز (محوری شەڕ) ناوزەد کرد و بە هاوکاریکردنی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان و هەوڵدان بۆ بە دەست هێنانی چەکی کۆمەڵکوژ تۆمەتبار کرد [23]. هەروەها عێراقی خستە ریزی پێشەوەی ئەو دەوڵەتانەی کە هاوکارو و هاوپەیمانی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکانە و پەیوەندییەکی نزیك و بەتینی لەگەڵ ڕێکخراوی تیرۆریستی (القاعدة)وە هەیە و ڕاهێنان بە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە دەکات و خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە ئەوەیش دژایەتی کردنی ئەمەریکا و لێدانی بەرژەوەندییەکانییەتی.[24]

بەم شێوەیە زۆربەی بەرپرسەکانی واشنتۆن لەمیانەی خۆ ئامادەکردن بۆ وەشاندنی گورزی سەربازی بۆ سەر عێراق، بەردەوام جەختیان کردۆتە سەر هەبوونی پەیوەندی نێوان ڕژێمی

(٢١) هەر ڕۆژێك لەدوای کردەوە تیرۆرستییەکەی ١١ ی ئەیلولی ٢٠٠١ لە ئەمەریکا ئەنجوومەنی ئاسایش لە ١٢ ئەیلولی ٢٠٠١ بڕیاری (١٣٦٨)ی دەرکرد کە جەخت دەکاتە سەر بە کار هێنانی هەموو ئەمرازێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشەو مەترسییانەی ڕووبەڕووەوی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەبن، هەروەها لە ٢٨ی ئەیلولی ٢٠٠١ بڕیاری (١٣٨٣) دەرکرا سەبارەت بە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، بۆ بینینی دەقی ئەم دوو بڕیارە بڕوانە: عبدالحسین شعبان، الاسلام و الارهاب الدولي، الطبعة الاولی، دارالحکمة، لندن، ئەیلولی ٢٠٠٢، ص ص ١٤٥ – ١٥١.

(٢٢) وەرگێراوە لە: عثمان علي حسن، الارهاب الدولي، ظاهرة قانونیة وسیاسیة، رسالة ماجستیَر غیر منشورة، کلیة القانون و السیاسة، جامعة صلاح الدین، اربیل، ٢٠٠٥، ص ١٥٨.

(٢٣) هانز بلیکس، مصدر سابق، ص ٧١.

(٢٤) اریك لوران، مصدر سابق، ص ١٤٤.

عێراق و ڕێکخراوی تیرۆریستی ئەلقاعیدە و لادانی ئەم ڕژێمەش بە بەشێك لە شەڕی دژە تیرۆر و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشە و مەترسییانەی کە ڕووبەڕووی جیهان بەگشتی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی دەبێتەوە پێناسەی کردووە.

لەم چوارچێوەیەدا و لە تشرینی یەکەمی ۲۰۰۲دا، واتە تەنها چوار ڕۆژ پێش ڕێگەدانی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا بۆ بەکارهێنانی هێز دژی عێراق، (جۆرج دەبلیو بۆش) سەرۆکی ئەمەریکا ڕایگەیاند: " ئێمە دەزانین کە عێراق و ڕێکخراوی تیرۆرستی (القاعدة) دوژمنی سەرەکی ئەمەریکان و بەشدارن لە پیلان گێڕان دژی بەرژەوەندی نەتەوەی ئەمەریکی، دەزانین کە عێراق و ڕێکخراوی تیرۆرستی(القاعدة) پەیوەندییەکی نزیك و بەتینیان یان لەگەڵ یەکتر هەیە و عێراق ڕاهێنان بە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە تیرۆرستییە دەکات بۆ دروستکردنی بۆمبی کوشندە و ژەهراوی لە پێناوی لێدانی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا "[25]. هەروەها (جورج تینێن) بەڕێوەبەری (CIA)ی ئەمریکی لە ئۆکتوبەری۲۰۰۲دا، ئاماژەی بەوەی کرد کە "عێراق مەشقی بە ئەندامانی ڕێکخراوی تیرۆرستی (القاعدة) کردووە لە سەر ژەهرەکان وگازەکان بو دروستکردنی بومبی ئاسایی."[26]

لە لایەکی ترەوە و بە هەمان ئاراستە (کۆلن پاوڵ) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە ٥ی شوباتی ۲۰۰۳ لە دانیشتنێکی تایبەتی ئەنجوومەنی ئاسایش پەیوەست بە پرسی عێراق و سەر کێشییەکانی ئەم دەوڵەتە هەمبەر ئیرادەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، دووبارە جەختی سەر هەبوونی پەیوەندی نێوان ڕژێمی عێراق و ڕێکخراوی تیرۆرستی (القاعدة) کردەوە، و بە یارمەتی دەری ئەم ڕێکخراوە تیرۆرستییە تۆمەتباری کرد، لەم ڕووەوە ئاماژەی بەوە کرد کە " ئەبو موسعەب زەرقاوی کە کەسی هەرەدیاری ناو ڕێکخراوی تیرۆرستی (القاعدة)، لە ساڵی ۲۰۰۲ دا لە ئەفغانستانە وە هاتۆتە ناو عێراق و ئێستا ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە زۆر بە ئازادی لە ناو عێراق هاتوچوو دەکەن و چالاکی ئەنجام دەدەن، هەروەها عێراق مەشق و ڕاهێنان بە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە دەکات و لە ڕێگەی بالیۆزخانەی عێراق لە ئەفغانستان ئاڵوگۆڕی زانیاری دەکەن."[27]

---

(۲٥) وەرگێڕاوە : امی ورپنفتون، روبرت فیسك و أخرون، العراق، الغزو - الاحتلال -المقاومە، الطبعة الاولی، مرکزدراسات الوحده العربیه، بیروت، تموز٢٠٠٤، ص٥٦.

(۲٦) وەرگێڕاوە لە: لورانس کاپلان ویلیام کریستۆل، جەنگی عیراق، ستەمکاری و پەیامی ئەمریکی، وەرگێران عەبدولکەریم عوزێری، چاپی یەکەم، چاپخانەی: شڤان، سلێمانی، ۲۰۰۷، ل ٥٤.

(۲۷) وەرگێڕاوە لە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤۲۰) ٦ شوبات، ۲۰۰۳، ل ۸.



بەم شێوەیە ئیدارەی ئەمەریکا یەکێك لەو خاڵانەی کە پێش پرۆسەی داگیرکردنی عێراق بەردەوام جەختیان لە سەر دەکردەوە، بریتی بووە لە بوونی پەیوەندی نێوان ڕژێمی سەدام و ڕێکخراوی تیرۆریستی قاعیدە و لێدان و وەشاندنی گورزی سەربازی بۆ سەر عێراق و لادانی ئەم ڕژێمە یان وەك بەشێك لە شەڕی دژە تیرۆریان ناساند، بەو پێیەی بوونی دەوڵەتێکی دیکتاتۆری وەك ڕژێمی بەعس هاوکار و هاوپەیمان لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان گەورەترین هەڕەشە و مەترسییە بۆ سەر بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمەریکا و ئاشتی و ئاسایشی و سەقامگیری جیهان و تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

## بە دیموکراسی کردنی عێراق:

یەکێکی تر لە ئامانجە ڕاگەیەنراوەکانی ئەمەریکا لە پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق بریتی بووە لە بە دیموکراسی کردنی ئەم وڵاتە و کردنی بە دەروازەیەك بۆ گۆڕانکاری گەورە و بنەڕەتی لە نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.[28] تێڕوانین و بۆچوونی ئەمەریکا لە دوای شەڕی سارد، بەو ئاراستەیە بوو کە بەرپرسیارەتی سەدەی بیست و یەکەم ئەوەیە کە دیموکراسییەت بنیات بنرێت و پشتیوانی لێبکرێت و هەوڵ بدرێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی پۆزەتیڤانەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و مرۆڤایەتی، و هەنگاونان بە ئاراستەی ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە سەر بنەما و بەها و پرەنسیپەکانی دیموکراسییەت و ڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و بە سەروەر کردنی کۆمەڵگای مەدەنی و دژایەتی کردنی تیرۆر و ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی کۆمەڵکوژ و لادانی سیستەمە دیکتاتۆرەکان. ئەمەریکا لەو باوەڕە دابوو فراوانبوونی بازنەی تیرۆر و پەرەسەندنی توندوتیژی و تێکچوونی ئاسایش و سەقامگیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری جۆراو جۆرە، لەوانە: [29]

نەبوونی دیموکراسییەت و سیستەمی دیموکراسی لە زۆربەی دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

---

(۲۸) رتشارد کلارك في مواجهة جميع الإعداء، الطبعة الاولی، لبنان، ۲۰۰٤، ص ۳۳۹؛ أحمد ابراهيم محمود العراق و اسلحە الدمار الشامل، الطبعة الاولی مرکز الدراساة الاسترتتيجية بالاهرام، القاهرة، ۲۰۰۲، ۲۰۷.

(۲۹) د. حسين شريف، إحتلال أفغانستان و غزو العراق و الخريطة الطريق والسوق الاشرق الاوسطية الاولی، دعائم الامبراطورية الامريكية (۲۰۰۲ — ۲۰۰۳) الجزء السادس، مطبع الهيئة المصرية العامة للكتاب، ص ٥۹۷.

قەیران و تەنگەژەی کەمینەکان و کێشەی فرەنەتەوەیی.

ململانێ و ناکۆکی ئایینی و ئەتنی.

گەشەسەندنی رێکخراوە تیرۆرستییەکان لە ژێر پەردەی ئاییندا.

پێشێل کردنی مافی مرۆڤ

لەبەر ئەمە ستراتیژی نوێی ئیدارەیی ئەمریکی کە لە لایەن ستراتیژزان و پسپۆران لە ئاسایشی نەتەوەیی و وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی بەرگرییەوە دارێژرابوو، و لە ٢٠ ئەیلولی ٢٠٠٢دا راگەیەنرا زیاتر جەختی کردە سەر بەلاوکردنەوەی دیموکراسییەت و بەهاکانی لە سەرتا سەری جیهان و یارمەتی دانی دەوڵەتانی دیموکراتخواز و گوشار خستنە سەری دەوڵەتە نا دیموکراسییەکان، بەڵگەنامەی ستراتیژی ئەمریکا بە وشەکانی رەوشتی دەست پێ دەکات، دەڵێت :" ئێمە وای بۆی دەچین کە ئەو ململانێیەی لە سەدەی بیستەم روویدا لە نێوان دەوڵەتە ئازادەکان و دەوڵەتە دیکتاتۆرەکان بە سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتە ئازادەکان کۆتایی هات، بۆیە لە دەستپێکی سەدەی (٢١)دا دەبێ دەرگا بکرێتەوە بۆ بە دەستهێنانی ئەوەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە دەست نەهاتووە کە بریتییە لە رێز گرتن لە مافی مرۆڤ و گرنتی کردنی ئازادی سیاسی و ئابووری، ئێستا ئەمەریکا مەزنترین دەوڵەتی زلهێز و دەست رۆیشتووە لە جیهاندا ئەمەش وا دەخوازێ کە هەڵبستێ بە نەهێلانی ئەو شوێنەوارانەی کە دەرهاوێشتەی شەڕی ساردن [٣٠]، هەروەها بەڵگەنامە دەڵێت " ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خۆی لە بەردەم ئەرکێکی ئەخلاقی و بەرپرسیارێتێکی مێژوویدا دەبینێت کە بریتییە لە گواستنەوەی بنەما و پرەنسیپەکانی دەستووری ئەمەریکی بۆ گشت جیهان، پێویستە لە سەر ئەمەریکا بیسەلمێنێت بۆ گشت جیهان و هەموو هاولاتیانی جیهان کە گشت نەتەوە و تایفە و رەگەز دەتوانن پێکەوە بە ئازادی و یەکسانی لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتدا بژین، هەروەها ستراتیژییە نوێیەکە جەخت دەکاتە سەر ئازادی ئایینی و رێزگرتن و بیروڕای جیاواز و بەلاوکردنەوەی دیموکراسییەت لە جیهان و لادانی رژێمە دیکتاتۆرەکان."[٣١]

(٣٠) د. عماد فوزي شعيبي، السياسة الامريكية و صياغة العالم الجديد، الطبعة الاولى، داركنعان، دمشق، ٢٠٠٢ — ٢٠٠٣، ص ص ١٠٢ — ١٠٣؛ د. وحيد عبدالمجيد، حرب امريكا بين بن لادن و صدام حسين، مصر، (د. ت)، ص ١٠٦؛ ترفيتيان تودورف، اللانظام العالمي الجديد، ترجمة د. علي اسعد، الطبعة الاولى، دار المرساة، سوريا، ٢٠٠٥، ص٤٤.

(٣١) د. عماد فوزي شعيبي، السياسة الامريكية و صياغة....، ص ص ١٠٢ - ١٠٣.



لە چوارچێوەی ئەم ستراتیژییە نوێیەدا؛ ئەمەریکا لە لایەکەوە گوشارەکانی خۆی بۆ سەر دەوڵەتە میانڕەوە هاوپەیمانەکانی خۆی زیادی کرد. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاشتییانە هەوڵی ریفۆرم و گۆڕانکاری ناوخۆیی بدەن ئەویش بە رێگەدان بە دروستبوونی ئۆپۆزسیونی سیاسی و پارتە سیاسییەکان و رێکخراوە ناحکومییەکان و پابەند بوون بە ئالوگۆڕی ئاشتییانەی دەسەلات لە لایەکی ترەوە ئەو دەوڵەتانەی دژی ئەمەریکا بوون و لە هەوڵی بە دەستهێنانی چەکی کۆمەلکوژ دا بوون و هاوکار و هاوپەیمانی تیرۆرستان بوون هەوڵی لابردنیان دەدا [٣٢] و بە دەوڵەتانی لادەر و شەڕانی و دەرچوو لە یاسا پێناسەی کرد (الدول المارقه) کە بەم خالانەی خوارەوە دەناسرێن : [٣٣]

دەوڵەتە دیکتاتۆر و توتالیتارەکان.

دەوڵەتە لەبەریەك هەڵوەشاو و ناسەقامگیرەکان.

ئەو دەولەتانەی هەوڵی بە دەستهێنانی چەکی کۆمەلکوژ دەدەن.

ئەو دەوڵەتانەی دالدەی تیرۆر دەدەن.

حکوومەتەکانی کە گەلەکانیان دەچەوسێنن و سامان و سەروەتیان بە فیڕۆ دەدەن.

رێز لە رێسا و یاسای نێو دەوڵەتی ناگرن و هەڕەشە و مەترسین بۆ سەر ئاسایشی جیهان.

رقیان لە ئەمەریکا یەو دژی پرەنسیپەکانین.

بەم شێوەیە ستراتیژییەتی نوێ ئەمەریکا لە دوای رووداوەکانی (١١) ئەیلول جەختی کردە سەر دووبارە رێکخستنەوەی بارودۆخی ناوخۆی دەوڵەتە فاشیلەکان و ئەم دەوڵەتانەی دالدەی تیرۆر دەدەن و هەولْ دان بۆ لابردنیان و دووبارە دارشتنەوەی نەخشەی رۆژهەلاتی ناوەراست بە شێوەیەك کە خزمەت بە بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیەکەی بکات [٣٤] و لە هەمانکاتدا ئاشتی و سەقامگیری لە دەڤەرەکەدا جێگیر بێت.

(٣٢) د. محمد عبدالمطلب الهوني، المأزق العربي، العرب في مواجهه الاستراتيجية الامريكية، الطبعة الاولى، دمشق، ص ص ٦٦ — ٦٩.

(٣٣) د. عماد فوزي شعيبي، السياسة الامريكية و صياغة...، ص ٨٦؛ د. محمد عبدلمطلب الهوني، مصدر سابق، ص ٦٦.

(٣٤) د. حسين شريف، مصدر سابق، ص ٣٧٨، ستيفن هالبر و جوناثان كلارك، مصدر سابق، ص ٢٦١؛ مجموعة مؤلفين الاسرائيلين، الدورالاسرائيلي في الحرب الامريكيية على العراق، ترجمة: أحمدابوهدية، الطبعة الاولى، مركز دراسات الفلسطنية، دمشق، ٢٠٠٥، ص١٥٢.

لەلایەکی ترەوە لە پێناوی هاوێژتنی هەنگاوی پراکتیکی بو بەدیموکراسی کردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٢ دا کولن پاول وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەسپێشخەری هاوبەشی نێوان ئەمەریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاگەیاند. پاول ڕاشکاوانە ئاماژەی بەوە کرد کە گرفتی سەرەکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەبوونی ڕۆشنبیری دیموکراسییە. هەر بۆیە پێویستە بهاکانی دیموکراتیەت لە نێو ڕۆشنبیری ئیسلامیدا بچێنریت. لە ڕێگەی گۆڕانکاری کردن لە پرۆگرامەکانی پەروەردەدا.(٣٥)

بە شێوەیەکی گشتی ئیدارەی ئەمەریکا وای بۆ دەچوو کە لادانی ڕژێمی بەعس، ڕەوتی پەرەسەندن و پێشکەوتنی دیموکراسییەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خێراتر و بە پەلەتر بکات و ڕێگاش بە ئاراستەی گۆڕینی نەخشەی دەڤەرەکە لە ڕێی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتە دیکتاتۆرو توتالیتارییەکان و هاتنە سەر کاری ڕژێمەکانی دیموکراسی و میانڕەو و خۆشتر و ئاسانتر دەکات. هەر بۆیە ئاراستەی سیاسەتی ئەمەریکا لە هەمبەری عێراق تێپەڕی کرد، لەوەی کێشەی عێراق تەنیا کێشەی چەکی کۆمەڵکوژ بێت، بەڵکو خۆی لە چەند ڕەهەندێکی دیکەی مەودادووردا (درێژخایەندا) بینییەوە.

زۆربەی بەرپرسانی ئەمەریکا لە وانە (کۆلن پاول، جۆرج دەبلیو بۆش) جەختیان لە سەر ئەوە دەکرد کە گۆڕینی ڕژێمی عێراق، دەسپێکی شەپۆلێکی فراوانی چاکسازی و گۆڕانکاری سیاسی و ئابووری و کلتووری و کۆمەڵایەتییە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەم چوارچێوەیە دا کۆلن پاول ساڵی ٢٠٠٢دا جەختی لە سەر ئەوەی کرد کە " ڕزگارکردنی عێراق ڕێگە بۆ ئەمەریکا خۆش دەکات بۆ ئەوەی سەر لەنوێ نەخشەی ناوچەکە بگۆڕێت."(٣٦)

بە هەمان ئاراستە و لەمیانەی چڕبوونەوەی هەوڵە سیاسی و دیپلۆماسییەکانی ئەمەریکا بۆ بەدەستهێنانی پشتگری نێودەوڵەتی سەبارەت بە لادانی ڕژێمی بەعس و ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە عێراق ئیدارەی ئەمەریکا داوای لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کرد کە هەموو هاوکارییەك پێشکەش بە ئەمەریکا بکەن بۆ ڕزگارکردنی عێراق لە ڕژێمی سەدام و دامەزراندنی ڕژێمێکی میانڕەو و دیموکراسی لەم وڵاتەدا لەم ڕووەوە (جۆرج بۆش) لە ٢٣ی ئەیلولی ٢٠٠٢ لە وتارێکدا ڕایگەیاند :"

(٣٥) وەرگیراوە لە: د. شێرزاد احمد نجار، بۆش و خەمەکانی عێراق.. ڕێگەی بەرەو ئازادی و دیموکراسی (وتاری سەرۆکی ئەمریکا لە ٢٠٠٣/١١/٦)، هەفتە نامەی گولان، ژمارە (٤٥٩)، ٢٠٠٣/١١/١٣، ل١٣.

(٣٦) وەرگیراوە لە: ناظم عبدالواحد جاسور، تعقیب، فی: احمد یوسف احمد وآخرون، مصدر سابق، ص ٣٦٠.



گەلی عێراق ڕووبەڕووی زۆر هەڕەشە بووتەوە، عێراق وەك دەوڵەتێکی دیکتاتۆر توانای گەورەی هەیە بۆ دروستکردنی گرژی و ئاڵۆزی و پەشێوی و ناسەقامگیری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام عێراقێکی دیموکراسی و ئارامگرتوو توانایەکی گەورەی دەبێ بۆ پەرەپێدانی دیموکراسییەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هاندانی دامەزراوەکانی دیموکراسی بە شێوەیەك عێراق دەبێتە نموونەیەك بۆ دەوڵەتانی دەوروبەری کە چاوی لێ بکەن ". (٣٧)

## هۆکاری نەوت:

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یەکێکە لە ناوچە هەرە گرنگ و ستراتیژییەکانی جیهان لە ڕووی سەرچاوەی وزە و نەوتەوە، زیاتر لە ٦٠ ٪ی یەدەکی نەوتی جیهان لەم ناوچەدا کۆ بووەتەوە [بڕوانە خشتەی ژمارە (٩)]. هەر بۆیەش بەردەوام جێگای ململانێ و چاوتێبڕینی دەوڵەتە زلهێز و گەورەکانی وەك ئەمریکا و بەریتانیا ڕۆسیا بووە. ئەمەریکایە کە لەو دەوڵەتە گەورانەی کە بەرژەوەندی گەورە و ستراتیژی لەم دەڤەرەدا هەیە و بەشێکی گرنگی ئەم بەرژەوەندییانەش پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە سەرچاوەی وزە و نەوتەوە هەیە، بەو پێیەی ئەمەریکا گەورەترین بەکاربەری نەوتە لە جیهاندا و بەشی هەرە زۆری ئەم نەوت و گازەش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەوڵەتانی کەنداو بۆی دێت و پێداویستییە نەوتییەکانی خۆی لەم ناوچەیە دابین دەکات. (٣٨) ئەمەش وایکردووە ئەمەریکا بەردەوام هەوڵ بدات باڵادەستی خۆی لە دەڤەرەکە بپارێزێ و دروست بوونی هەر جۆرە هەڕەشە و مەترسییەك بۆ سەرچاوەکانی نەوت بەهەڕەشە و مەترسی ڕاستەوخۆی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی خۆی لێکبداتەوە.(٣٩)

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین یەکێك لە هۆکار و فاکتەرە سەرەکییەکانی شەڕی دووەمی کەنداو و دەرپەڕاندنی عێراق لە کوێت پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دروستبوونی مەترسی بۆ سەر سەرچاوەکانی نەوتەوە هەبووە، لەم ڕووەوە(جۆرج بۆشی باوك) سەرۆکی ئەمەریکا لە ٧ ئابی

(٣٧) وەرگیراوە: جعفر عتریسی، سقوط بغداد، دارالمحجة البیضاء، الطبعة الاولی، (د.ت) ص ١٥١.

(٣٨) مایکل کلیر، الحروب علی الموارد، الجغرافیا الجدیدة للنزعات العالمیة، ترجمة: عدنان حسین، دارالکتاب العربیة، بیروت، لبنان، ٢٠٠٢، ص ص ١٥، ٦٣.

(٣٩) حامد محمود عیسي، القضیة الکردیة في العراق...، ص ٤٧٢.

١٩٩٠ دا ئاماژەی بەوە کرد " نزیکەی نیوەی نەوتی ئێمە لە ولاّتانی کەنداوەوە دێت بۆیە ئەم هەولّەی عێراق هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر ئاسایشی ئابووری ئێمە ".[٤٠]

لە لایەکی ترەوە عێراق یەکێکە لەو دەولّەتە گرنگانەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست کە خاوەن دووەمین یەدەکی نەوتی جیهانییە زۆربەی مەزندەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە عێراق زیاتر لە ١١ ٪ یەدەکی نەوتی جیهانی هەیە، تەنانەت هەندێك بە ٢٥ ٪ دەخەملێنن.[٤١]

| دابەشبوونی نەوت لە جیهاندا | رێژەی یەدەك |
|---|---|
| رۆژهەلاّتی ناوەڕاست | ٪٦٦ |
| ئەمریکای لاتین | ٪٩ |
| ئەفریقیا | ٪٧ |
| کۆمارەکانی پێشووی سۆڤییت | ٪٦ |
| ئەمریکای باکوور | ٪٦ |
| ئاسیا-پاسفیك | ٪٤ |
| ئەورووپا | ٪٢ |

**خشتەی ژمارە(٩): رێژەی دابەشبوونی یەدەکی پترۆل لە جیهان.[٤٢]**

(٤٠) وەرگێراوە لە : مایکل کلیر، مصدر سابق، ص ٤٠.

(٤١) نبیل جعفر عبدالرضا، خصخصة قطاع النفط فی العراق (الابعاد ومخاطره)فی: حسن عبید عیسی و أخرون، استراتیجیة التدمیر(ألیات الاحتلال الامریکی للعراق ونتائجه، الطبعة الا ولی، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، حزیران ٢٠٠٦، ص ص ١٣٨- ١٣٩؛ مایسة مدني محمد مدني، مصدر سابق، ص ص ١٨٦ – ١٨٧.

(42) www. iags.org/futureofoil.htm institute for the Analysis of global Security.



| دەولّەتەکان | رێژەی یەدەك |
|---|---|
| سعودییە | ٪٢٥ |
| عێراق | ٪١١ |
| ئیمارات | ٪٩ |
| ئێران | ٪٨ |
| کوێت | ٪٩ |
| لیبیا | ٪٢ |

**خشتەی ژمارە (١٠) : بەرزترین رێژەی یەدەگی نەوت لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا.[٤٣]**

(43) هەمان سەرچاوە.

## باسی دووەم

## دروستبوونی گوتاری سیاسی یەکگرتوو

لە کاتی پەلاماری عێراق بۆ سەر کویت، هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی کەنداو لە (١٧ – ١٨) کانوونی دووەمی ١٩٩٠ دا [٤٤] و دواتریش تێکشکانی رژێمی بەعس، جەماوەر و هێزە سیاسییە سەرەکییەکانی کوردستان بە هۆی یەکگرتووییان و کۆبوونەوەیان لە ژێر چەتری بەرەی کوردستانیدا [٤٥] توایان بە قۆستنەوە و سوود وەرگرتن لەو قەیران و تەنگەژەییەی کە ئەوکات سەری هەڵدابوو، لە (٧-٢١ ئاداری ١٩٩١) زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان رزگار بکەن [٤٦]، هەر ئەو راپەڕینە و دواتریش کۆچڕەوە ملیۆنییەکەی کورد، سەرنج و سۆز و رای گشتی جیهانی بەلای خۆیدا راکێشا، هەلومەرجێکی وای هێنایە پێشەوە کە لە کوردستانی عێراق ناوچە و نەوای ئارام دابمەزرێندرێت. ئەم بارودۆخە نوێیەش رێگەی خۆشکرد، کە لە ١٩ ی ئایاری ١٩٩٢دا، یەکەم هەڵبژاردن بە مەبەستی دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراسی هەلقولاو پشت بەستوو بە ئیرادە و حەز و ویست و شەرعییەتی گەل لە لایەك، و پڕکردنەوەی ئەو بۆشایی و کەلێنەی کە بە کشانەوەی دامەزراوە کارگێرییەکانی حکوومەتی ناوەندی هاتبووە ئاراوە، لە لایەکی ترەوە ئەنجام بدرێت.[٤٧]

(٤٤) شوارتزکوف، مصدر سابق، ص ص ٢٠٧-٢١٣. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ئەم بابەتە، بڕوانە: محمد حسنين الهيكل، حرب الخليج: اوهام القوة و النصر، الطبعة الاولى، مركز الاهرام للترجمة و النشر، القاهرة، ١٩٩٢، ص ٢٨٥ و ما بعدها

(٤٥) بەرەی کوردستانی لە ئایاری ساڵی ١٩٨٨ ڕاگەیەنرا، کە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و چەند حزبێکی دکەی کوردستانی پێك هاتبوو، بەرەی کوردستانی، پڕۆژەیەکی بۆ مافی خۆ بەڕێوەبردنی لە کوردستان گەڵاڵە کردبوو، شایانی باسە کە ئیدریس بارزانی رۆڵێکی کاریگەری هەبوو بۆ دامەزراندنی ئەم بەرەیە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، الحزب الديموقراطي الكوردستان، مكتب الدراسات و البحوث المركزي، الاقتتال الداخلي فی کوردستان العراق، كيف اندلع و من المسئول عنه، الطبعه الاولى، ١٩٩٧ص ص ١٨ -١٩.

(٤٦) کرێس کوچێرا، بزووتنەوەی نەتەوەی....، ل ل ١٠٥-١١٠.

(٤٧) ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستانی عێراق، پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم ١٩٩٢، ل٥.



بەڵام دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ بە سەر ئەنجام دانی پرۆسەی هەڵبژارتن، بە هۆی رۆڵە هەڵکشانی ململانی و ناکۆکی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، و زالبوونی بەرژەوەندی تاکە حزبی بەسەر بەرژەوەندی نەتەوەییدا، هەروەها دەست وەردانی راستەوخۆی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لە کاروباری هەرێمی کوردستان[٤٨] بەمەبەستی شکست پێ هێنانی ئەزموونی دیموکراسییەکەی و دروستبوونی تەوەربەندییەکی هەرێمی دژبەری بەرژەوەندی گەلی کوردستان، هەمووی ئەمانە هەرێمی کوردستانی پەلکێشی ناو شەڕێکی ناوخۆیی کوردی – کوردی کرد، کە رەهەند و دەرهاوێشتەکانی لە رووی سیاسی و مرۆیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەوە، زۆر بە خراپی بە سەر کورد و دۆزە رەواکەی شکایەوە، سازش و پاشەکشەیەکی گەورە بوو لە سەر مەسەلەی نەتەوایەتی، چارەنووسی حکوومەت و پەرلەمان و خودی هەرێمەکەشی بەرەو لاوازی و دوو لەت بوون و دابەش بوون برد و مەترسی و هەڕەشەی لە ناوچوون و زیندە بە چاڵ کردنی چووە سەری و لە سەر ئاستی دەرەکیش لە گرنگی و بایەخی دۆزی کورد هێنایە خوارەوە.

هەر چەند هەر لە سەرەتای شەڕەکەوە دۆستانی کورد چ لە ناوخۆی کوردستان و چ لە دەرەوە، کەوتنەخۆ و هەوڵ و کۆششی زۆریان دا، بۆ وەستاندنی شەڕەکە و پەرەنەگرتنی، لەم پێناوەشدا، چەندین جار ئاگر بڕ ڕاگەیەندران و دانوستاندن کران و چەندین رێککەوتننامەش بەستران [٤٩]، بەڵام ئاگری شەڕەکە درێژەی کێشا و بۆ ماوەی (٤) ساڵ بەردەوام بوو، دواتریش

(٤٨) کرێس کۆچیرا، بزووتنەوەی نەتەوەی....، ل ل ١٤٢-١٦٤؛ جەمال نەبەز، کۆ بەرهەم ن زنجیرە وتار و توێژ لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندن، ژمارە (١)، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٣.

(٤٩) لە دوای دەستپێکردنەوەی شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ئایاری ١٩٩٤، بەدرێژایی شەڕی نێوخۆی چەندین هەوڵ و تەقەلا دران لە لایەن دەوڵەتە گەورەکان و دۆستانی گەلی کورد بۆ کۆتایی هێنانی بە شەڕەکە و چەندین ڕێککەوتننامە لەم ماوەیەدا بەستران بەڵام هەرەسیان هێنا تاکو رێککەوتننامەی واشنتن لە ١٧ئەیلولی١٩٩٨ مۆرکرا، لە گرنگترینی ئەم رێککەوتننامانە بریتی بوون :

١ - **رێککەوتننامەی پاریس** : لە ١٦ ی تەمووزی ١٩٩٤ گفتوگۆ و دانوستاندنەکانی نێوان پارتی و یەکێتی دەستی پێکرد بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی ناوخۆ و لە ٢٢ ی تەمووزی ١٩٩٤دا لە پاریس گەیشتنە رێککەوتننامەیەکی گشتگیر و هەمەلایەنە، سەبارەت بە کۆتایی هێنان بە شەڕەکە، لەم کۆبوونەوە و

دانوستانانەدا وەفدی پارتی لە (شەهید سامی عبدالرحمن و د. رۆژ نووری شاوێس، هۆشیار زێباری، **محسن** دزەیی، بیروت ابراهیم و نوێنەری پارتی (جعفر گلی)لە پاریس پێك هاتبوو.وەفدی یەکێتیش لە (نەوشیروان مستەفا، د. فواد مەعسوم، قادر حاجی عەلی، دارا شێخ نووری، د.بەرهەم صالح) و نوێنەری یەکێتیش لە پاریس (محمد صابر) پێك هاتبوو.

ئەو چارەسەریانەی لە رێککەوتننامەی پاریسدا هاتبوو، دوو قۆناغ بووە : یەکەم بەردەوام بوون لە سەر ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان و گەڕانەوەی بارودۆخ بۆ رێڕەوی ئاسایی خۆی و خۆ ئامادەکردن لە ماوەیەکی زۆرکەمدا بۆ رێکخستنی هەڵبژاردنەکان، قۆناغی دووەم، ئەنجام دانی پرۆسەی هەڵبژاردنی گشتی و سەرتاسەری بووە، بۆ پەرلەمانی کوردستان و دیاریکردنی سەرۆکی هەرێم، ئەمە دەبوایی لە مانگی ئایاری ١٩٩٥دا ئەنجام بدرێت، بەڵام پێش ئەمە، دەبوو بە شێوەیەکی خێرا بارودۆخ ئاسایی بکرێت و حکوومەتی ئیئتیلافی پێك بهێنرێت و ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی پێك بهێنرێت کە لە سەرۆکی حکوومەت و سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی مەحکەمەی تەمیزی دەگرتە خۆی، هەروەها دەبوو سەرژمێری دانیشتووانی بکرێت و رێ خۆشبکرێت بۆ هاتنی چاودێرە نێودەوڵەتییەکان لە ماوەی هەڵبژاردنەکاندا، بەڵام ئەم رێککەوتننامەیە سەری نەگرت، شایانی باسە تورکیا رۆڵێکی خراپی هەبوو بۆ سەر نەگرتنی ئەم رێککەوتننامەیە لەبەر ئەوەی بە هاودژ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆی لێکی دایەوە.

٢ - **ڕێککەوتننامەی (دورگیدا)** کە لە (٩ — ١١ ئاب ١٩٩٥)دا لە دورگیدا کە شارێکی بچووکە لە دەورووبەری (دبلن — پایتەختی ئیرلەند) لە نێوان پارتی و یەکێتی بەسترا، بە سەرپەرشتی و چاودێری (ڕۆبێرت دویچ) دیپلۆماتکاری ئەمەریکی و بەرپرس لە کاروباری کەنداو بە ئامادەبوونی دوو ئەندامی کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی یەکگرتوو (ئەحمەد چەلەبی، هانی فەکیکی ئەندامی پێشووی حزب بەعس)، هەر دوو حزب لە سەر چەند خاڵێك رێکەوتن لەوانە :

**یەکەم** : داماڵینی چەك لە هەولێر.

**دووەم** : پێکهێنانی لیژنەیەکی بێ لایەن بە سەرپەرشتی کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی یەکگرتوو، دوورخستنەوەی هێزی پێشمەرگە لە دەوروپشتی شاری هەولێر، کۆکردنەوەی دەرامەتی گومرگ و کۆنترۆڵ کردنیان لە لایەن کۆمیتەیەکی بێ لایەنەوە، کۆبوونەوەی پەرلەمانی کوردستان، دوای (٤٨)کاتژمێر لە چەك راماڵینی هەولێر و دەست بەکاربوونی ئیدارات و دام و دەزگاکانن حکوومەت.

٣- جولەی دووەم بۆ رێگرتن لە شەڕی ناوخۆی لە دوای رێککەوتننامەی دۆرگیدا)، دانیشتنەکەی دووەم لە دبلن کرا، لە سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٩٥، وەفدی ئەمەریکی پرۆژەیەکی (٦) خاڵی ئامادە کردبوو بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکییەکانی، بەڵام ئەم گفتوگۆیەیانەش گەیشتنە رێگەیەکی داخراو.



بە هۆی فراوانبوونی بازنەی شەڕەکە، و دەستتێوەردانی راستەوخۆی دەوڵەتانی هەرێمی، بە تایبەت لە دوو ساڵی کۆتایی شەڕەکەدا، وای کرد کە ئەمەریکای بە شێوەیەکی چالاکتر و کاراتر بهێتە ناو کێشەکەوە. بە هۆی ئەوەی شەڕی ناوخۆیی و دەستێوەردانەکانی دەوڵەتانی دراوسێ (ئێران، تورکیا، و) و عێراق تەوەربەندییەکی هەرێمی دژبەری بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا خوی بەسەر هاوکێشە سیاسییەکانی ناوخۆی کوردستاندا سەپاند. بەمەش تا دەهات گەمەی سیاسی ئەمریکا بەر تەسك دەبوو و مەترسی ئەوە هاتبوو ئاراوە، کە کوردستانی عێراق لە جێگای ئەوەی ببێتە سەنگەری برەوپێدانی سیاسەتی دەرەکی واشنتۆن لە ناوچەکەدا، خەرێك بوو، دەبوو بە سەنگەرێکی دژایەتی کەر و هەڵگەڕاوە لە بەرژەوەنییەکانی ئەمریکا بوویە لە ئەنجامی هەوڵ و گوشارەکانی ئەمریکا بۆ سەر هەردوو لایەنی شەڕکەر(پارتی و یەکێتی)، لە (١٧)ی ئەیلولی (١٩٩٨)دا رێککەوتننامەی واشنتۆن لە نێوان هەردوو لادا مۆرکرا و کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ هات.[٥٠]

ئەم رێککەوتننامەیە گرنگی و بایەخێکی گەورەی هەبوو، سەبارەت بە گەلی کوردستان چونکە لە لایەك بووە هۆی ئەوەی سەر لە نوێ پەیوەندییەکانی نێوان پارتی و یەکێتی بەرەو ئاسایی بوونەوە و ئاشت بوونەوە بچن، و بووە بناغە و بنچینەیەکی بە هێز بۆ دووبارە کرانەوەی دەرگای گفتوگۆ و دانوستاندن بۆ چارەسەکردنی کێشە و ناکۆکییەکان بە رێگەیەکی دیموکراسی و ئاشتیانە و لە سەر بنەمای لێك تێگەیشتن و لە بەر چاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردستان، لە لایەکی ترەوە، ئەمە یەکەم جار بوو، مەزنترین زلهێزی جیهانی، بە

٤-- لەدوای ئەمەش **ڕێکەوتننامەی تەهران** لە (٦ ئۆکتۆبەری ١٩٩٥ و **رێککەوتننامەی ئەنقەرەی** لە (٣٠ ئۆکتۆبەری ١٩٩٦) بە دوایداهات کە نەیانتوانی کۆتایی بە شەڕەکە بهێنن تاکو لە (١٧) ئەیلولی ١٩٩٨ رێککەوتننامەی واشنتۆن مۆرکرا لە ئەمەریکا و کۆتایی بە شەڕی ناخۆی هێنا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الحزب الديموقراطي الكوردستان، مكتب الدراسات و البحوث المركزي، الاقتتال الداخلى فى كوردستان العراق، مصدر سابق ص ص ٣٠٩ — ٤٢٧؛ **کریس کۆچێرا**، بزووتنەوەی کورد...، ل ل ١٥٤ — ١٥٥؛ صلاح خرسان، التيارات السياسيه فى كردستان العراق(١٩٤٦-٢٠٠٣)، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٣.ص ٥٥٠؛ هێرش عبدالله حەمە کریم، مصدر سابق، ص ٨٤.

(٥٠) — بڕوانە: عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٤٥٣ — ٤٥٦ و ل٣٩٥.

شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، سەرپەرشتی پرۆسەی چەسپاندنی ئاشتی لە نێوان دوو پارتی سیاسی بە شەڕ هاتوو لە ناو بزافی سیاسی نەتەوەو گەلێکی چەوساوە و دابەشکراو بکات.[٥١]

بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج و تێبینی و تا ڕادەیەك نیگەرانی بووە، هەنگاوەکانی چەسپاندنی پرۆسەی ئاشتی زۆر سست و شل و خاو بەڕێوە دەچوون لە دوای (٤) ساڵ ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی واشنتۆن، لە (٦)ی ئابی ٢٠٠٢دا، هەر دوو مەکتەبی سیاسی پارتی و یەکێتی لە شاری کۆیە کۆبوونەوە، بە مەبەستی چەسپاندنی پرۆسەی ئاشتی کوردی — کوردی هەر دوو لا ڕێکەوتن لە سەر چارە کردنی گرفتی پەرلەمان بە شێوەیەك ناوی (ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان) وەك خۆی بمێنێ و پێکهاتەی تازەی پەرلەمان بەو شێوەیە بێ، کە لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەی واشنتۆندا هاتووە، واتە ٥١٪ بۆ پارتی و ٤٩٪ بۆ یەکێتی و (٥) کورسی بۆ ئاشوورییەکان و هەروەها لەو کۆبوونەوەییەدا، بڕیار درا، کە بارەگا حزبییەکان لە سنووری ژێر دەسەڵاتی یەکتر بکەنەوە، وەك هەنگاوێك بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان.[٥٢]

لە هەمان چوارچێوە و لە هەنگاوێکی دیکەی گرنگی بە گورخستنی پرۆسەی ئاشتەوانیدا، (٧ — ٨ ئەیلولی ٢٠٠٢) هەر دوو سەرکردایەتی سیاسی پارتی و یەکێتی بە سەرپەرشتی مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لە هاوینە هەواری سەلاحەددین کۆبوونەوە، لەو کۆبوونەوە هاوبەشەدا، جەخت لە سەر بەرەو پێش بردنی پرۆسەی ئاشتەوانی کرایەوە. لە بەیاننامەی کۆتایی ئەو کۆبوونەوەیەدا، ئەوە خرایە ڕوو کە هەر دوو لا هاو هەڵوێست و هاودەنگن لە سەر سوود وەرگرتن لە گۆڕانکارییە نوێیەکان، بە شێوەیەك لە بەرژەوەندی گەلانی عێراق و خەڵکی کوردستان دابێ، سووربوونی خۆیان بۆ دژایەتی کردنی تیرۆر و دیکتاتۆرییەت دووپات کردەوە، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا چوار لیژنەی کاری هاوبەش پێکهێنران بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی هاوبەش فیدراڵی، و ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان و چارە کردنی گرفتە ئەمنیەکان و گرتنەبەری سیاسەتێکی یەکگرتوو و هاوبەش لە سەر ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی، بڕیار دا ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان لە (٤) ی تشرینی یەکەم٢٠٠٢دا کۆ ببێتەوە.[٥٣]

(٥١) جەمال نەبەز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.

(٥٢) ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٣٧٥٨)، هەولێر، ٧ ئاب ٢٠٠٢.

(٥٣) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٤.



لە ئەنجامی گفتوگۆ و کۆبوونەوەکانی نێوان پارتی و یەکێتی و مکوربوونی هەردوو لا لە سەر ڕێکخستنی ناوماڵی کورد و بەرەوپێش بردن و چەسپاندنی پرۆسەی ئاشتی هەنگاوی پراکتیکی و کردەیی بە دوادا داهات. لە ڕۆژی (٤) ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ دا، دوای (٨) ساڵ لێك دابڕان، بە ئامادە بوونی مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی و خاتوو دانیال میتران (خیزانی سەرۆك کۆماری فەڕەنسا فرانسو میتران)، پەرلەمانی کوردستان بە ئامادەبوونی هەر سێ فراکسیۆنی (زەرد و سەوز و مۆر) کۆبوونەوەی خۆی گرێدا، ئەم هەنگاوە پراکتیکییەی کورد لە لایەن دەوڵەتە زلهێز و کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە، پێشوازی لێ کرا و پشتیوانی خۆیان بۆ پشتگیری کردنی دۆزی کورد دووپات کردەوە. وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا (کۆلن پاوڵ) و وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (جاك سترۆ) لە دوو نامەی تایبەتدا بۆ پەرلەمانی کوردستان، پشتگیری خۆیان بۆ مافەکانی گەلی کوردستان دووپات کردەوە.[٥٤]

لە دوای کۆبوونەوەی پەرلەمان، لە هەنگاوێکی دیکەی پراکتیکیدا بۆ بەرەو پێش بردنی پرۆسەی ئاشتەوایی لە ڕۆژانی (١٢-١٥)ی شوباتی ٢٠٠٢دا بارەگای پارتی لە شاری سلێمانی و بارەگای یەکێتی لە شاری هەولێر کرایەوە، ئەمەش بڕوا و متمانەی جەماوەری بە پرۆسەی ئاشتی و ئایندەی سیاسی گەلی کوردستان بەهێزتر کرد.

هاوکات لەگەڵ ئەم پێشڤەچوونە سیاسییانە، بە هۆی نزیك بوونەوەی ئەگەری هێرشی سەربازی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق و ڕوودانی گۆڕانکاری چاوەڕوان کراو لە سەر ئاستی عێراق و ناوچەکە، سەرکردایەتی سیاسی کورد، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکان و قۆستنەوەیان بە ئاراستەی بەرژەوەندی گەلی کوردستان لە ٩ ی ئاداری ٢٠٠٣ دا سەرکردایەتی هاوبەشیان پێك هێنا، بۆ وەرگرتنی بڕیاری پێویست لە بەرامبەر هەر ئەگەرێکی چاوەڕوان نەکراو کە لە بار ە ئاڵۆزەکەی عێراق و ناوچەکەدا بکەوێتە، و دەسەڵاتی تەواویش درا بە سەرکردایەتی هاوبەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەموو ئەگەر و پێشهاتە سیاسییەکان.[٥٥]

(٥٤) بۆ زانیاری زیاتر و بینینی دەقی ئەم بروسکانە بڕوانە: ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٣٨٢٠)، هەولێر، ٢ تشرینی ٢٠٠٢؛ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٨٨٠)، سلێمانی، ٢٠٠٢/١٠/٥.

(٥٥) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٢٤)، هەولێر، ٢٠٠٣/٣/١٣، ل ٦.

لە دوای داگیرکردنی عێراق لە ٩ ی ئاداری ٢٠٠٣، بارودۆخ و هەلومەرجێکی نوێ لە کوردستان و عێراق و ناوچە کە هاتە ئاراوە، کۆمەڵێك هاوکێشەی سیاسی نوێ سەریان هەڵدا، ئاشکرا بوو سەنگ و کاریگەری کورد لە سەر رەوتی رووداوەکان و بارودۆخەکەی و سوود لێ وەرگرتن، بە ئاراستەی بەرژەوەندی گەلی کوردستان، پێوەند بووە، بە یەکگرتووی و یەك هەڵوێستی و یەك گوتاری سیاسی کوردەوە. بە تایبەت لە دوای دارمانی رژێمی بەعس ئەمەریکا خوازیاری پیادە کردنی سیستەمێکی فیدڕاڵی ناناوەندی (لامەرکەزی) بوو.کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پرسی کورد لە پرسێکی سیاسی و نەتەوەییەوە بە ئاراستەی پرسێکی ئیداری دەبرد. چارەنووسی کوردستانیش بەرەو پارچە پارچە بوون و دابەشبوون ئاراستە دەکرد. نەخشە و بەرنامەی ئەمەریکا ئەوە بوو بە شێوەیەکی زۆر خێرا کوردستان تێکەڵ بە عێراقی تازە بکات و هەرێمی کوردستان بکاتە پاشکۆی حکوومەتی ناوەندی.[٥٦]

بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسییانە و یەکخستنی هەوڵەکان و رێکخستنی ناومالّی کورد و ئاشکراکردنی هەڵوێستی فەرمی سەبارەت بە پڕۆسە و ئایندەی سیاسی عێراق و مافە نەتەوییەکانی گەلی کوردستان، سەرکردایەتی سیاسی کورد لە نیوەی یەکەمی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ دا لە دوای کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی نێوان پارتی و یەکێتی لە دوکان، هاوڕایی و هاوهەڵوێستی جەختی لێ کرایەوە، سەبارەت بە مەسەلەی فیدڕاڵییەت و شێوازەکەی و پابەند بوون بە بڕیاری پەرلەمانی کوردستان لە هەمبەر فیدراڵی جوگرافی — مێژووی بۆ هەرێمی کوردستان و بە تاکە گرەنتی پاراستنی ئاشتی و تەبایی لە عێراق و ناوچەکە دایە قەڵەم، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا جەختیان لە سەر چارەسەرکردنی پرسی کورد و سڕینەوەی شوێنەواری تەعریب کرایەوە، و هەردوولا پابەند بوونی خۆیان بۆ رێکخستنی نێو ماڵی کورد و پێکهێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو و کۆتایی هێنان بە دیاردەی دوو ئیدارەیی دووپات کردەوە.[٥٧]

ئەم هەڵوێستەی سەرکردایەتی سیاسی کورد لە سەر ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی کاردانەوەی جۆراوجۆری لێکەوتەوە، لە سەر ئاستی هەرێمی، (بەشار ئەسەد) سەرۆك کۆماری

(٥٦) پیتەرو. کالبریت، کوردستان بە فیعلی سەربەخۆیە، یەکەم جارە لە مێژوودا، بەخت بە رووی کورد پێدەکەنێت، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٦٦)، ٢٠٠٤/١/٨، ل ١٢.

(٥٧) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٦٦)، هەولێر، ٢٠٠٤/١/٨، ل ٦.



سوریا کە لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ بە سەردانێك گەیشتبوو ئەنقەرە رایگەیاند کە :" سوریا و تورکیا لە سەر مەسەلەی عێراق هاوهەڵوێستن و بڕیاردان لە سەر مەسەلەی فیدرالّییەت بۆ هەرێمی کوردستان هێڵی سورە". بەڵام لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی (کۆلن پاول) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ جەختی لە سەر ئەوەی کرد کە" دەبێ عێراقییەکان خۆیان چارەسەرێك بۆ پرسی فیدرالّییەت بدۆزنەوە، هەروەها رایگەیاند : " هەر لە سەرەتاوە رای ئێمە وا بووە کە عێراق یەکگرتوو بێت، بەڵام گەلانی عێراق چۆن وڵاتی خۆیان رێك دەخەن و بەڕێوە دەبەن ئازادن "، هەروەها رایگەیاند : " کوردەکان خوازیاری ئەوەن پارێزگاری ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بکەن و پێ لە سەر جوگرافیای کوردستاندا دەگرن."[٥٨]

ئەنجامەکانی هاوهەڵوێستی و هاوئاراستە بوونی دیدو بۆچوونی سەرکردایەتی سیاسی کورد و مکوربوونیان لە سەر پاراستنی تایبەتمەندییەکانی هەرێمی کوردستان، توانرا بەشێك لە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان بگوازنەوە ناو یاسای کاتی عێراق و تێدا دەقنووسی بکەن.

هەر پێوەند بەم مەسەلەیەوە، بۆ بەشداریکردن لە پڕۆسەی هەڵبژاردنەکانی عێراق و یەك خستنی هێز و توانای کورد لە سەر ئاستی عێراق، لە یەکی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤دا بڕیاری بەشداریکردنی کورد بە لیستی هاوبەش درا [٥٩]، و زۆرینەی پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتی، نەتەوەی و ئایینی کوردستان، لە ژێر چەتری (لیستی هاوپەیمانی کوردستان) کۆ بوونەوە، ئامانج و بەرنامەی خۆشی سەبارەت بەرەو پێش بردنی پڕۆسەی سیاسی عێراق دیاری کرد، کە بریتی بوو لە کارکردن بۆ دانانی دەستوورێکی هەمیشەیی لە سەر بنەمای تەوافق، بە شێوەیەك گرەنتی هێنانە دی سیستەمی فیدرالّی، دیموکراسی — فرەیی بکات، و دانپێنان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان بە کورد و تورکمان و ئاشووری و سریانییەوە و هەوڵدان بو نەهێلانی شوێنەواری تەعریب و گەڕاندنەوەی ناوچە تازە رزگارکراوەکان بۆ سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان.[٦٠]

(٥٨) هەمان سەرچاوە، ل ٦.

(٥٩) بڕوانە، هاوری باخەوان لە سایتی ئەلکترونی:

http://www.bakhawan.com/nawdocs/pdf

(٦٠) بۆ زیانیاری زیاتر بڕوانە : د. منذر الفضل، من الانفال الى الاستقلال، الطبعە الاولى، مطبعە وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥، ص ١٤؛ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥١٨)، ٢٠٠٥/١/٥، ل ل ٨-٩.

لە ئەنجامدا لە ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ دا لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی گشتی و سەرتاسەرییەوە (لیستی هاوپەیمانی کوردستان)، توانی لە سەرووی ٢٥ ٪ دەنگەکان و (٧٥) کورسی پەرلەمان بە دەست بهێنێ.(٦١) بڕوانە خشتەی ژمارە (١١)

| ژمارەی لیست | ناوی لیست | کۆی دەنگ | ڕێژەی دەنگ | ژمارەی کورسی |
|---|---|---|---|---|
| ١٦٩ | لیستی هاوپەیمانیەتی یەکگرتووی عیراق | ٤٠٧٥٢٩٥ | ٪٤٨,١٨ | ١٤٠ |
| ١٣٠ | لیستی هاوپەیمانی کوردستان | ٢١٧٥٥٥١ | ٪ ٢٥ ,٧٢ | ٧٥ |
| ٢٨٥ | لیستی(العراقیه) | ١١٦٨٩٤٣ | ٪١٣, ٨٣ | ٤٠ |
| ٢٥٥ | لیستی العراقیون | ١٥٠٦٨٠ | ٪١ ,٧٨ | ٥ |
| ١٧٥ | لیستی بەرەی تروکمانی | ٩٣٤٨٠ | ٪١ ,١٠ | ٣ |
| ٣٥٢ | کادرو هەڵبژاردە نیشتیمانییە بێلایەنەکان | ٦٩٩٣٨ | ٪٠ ,٨٢ | ٣ |
| ٣٢٤ | یەکێتی گەل (حزبی شیوعی) | ٦٩٩٢٠ | ٪٠ ,٧١ | ٢ |
| ٢٨٣ | کومەڵی ئیسلامی کوردستان | ٦٠٥٩٢ | ٪٠ ,٥١ | ٢ |
| ١١١ | لیستی ڕێکخراوی کاری ئسلامی لە عێراق | ٤٣٢٠٥ | ٪٠ ,٤٣ | ٢ |
| ٢٥٨ | هاوپێمانێتی نیشتیمانی دیموکراتی | ٣٦٧٥٩ | ٪٠ ,٣٦ | ١ |
| ٣١١ | کۆتلەی(المصالحه والتحریر) | ٣٠٧٩٦ | | ١ |
| ٢٠٤ | لیستی رافیدەینی نیشتیمانی مەسیحی | ٣٦٢٥٥ | | ١ |
| | کۆی هەمووی | ٨٤٥٦٢٦٦ | ٪١٠٠ | ٢٧٥ |

**خشتەی ژمارە (١١)، ژمارەی دەنگەکانی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لە هەڵبژاردنەکانی ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ بۆ ئەنجوومەنی نشتیمانی عێراق.**(٦٢)

---

(٦١) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٢٤)، هەولێر، ٢٠٠٥/٢/١٧، ١٥.

(٦٢) بڕوانە: ماڵپەری کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان: www.ieciraq.org



| ژمارەی لیست | ناوی قەوارەی سیاسی | کۆی ژمارەی دەنگەکان | کۆی ژمارەی کورسی |
|---|---|---|---|
| ٥٥٥ | لیستی هاوپەیمانیەتی یەکگرتووی عێراق | ٥٠٢١١٣٧ | ١٢٨ |
| ٧٣٠ | لیستی هاوپەیمانی کوردستان | ٢٦٤٢١٧٢ | ٥٣ |
| ٦١٨ | بەرەی تەوافقی عێراقی | ١٨٤٠٢١٦ | ٤٤ |
| ٧٣١ | لیستی نیشتیمانی(العراقیه) | ٩٧٧٣٢٥ | ٢٥ |
| ٦٦٧ | بەرەی عێراقی بۆ دانوستاندنی نیشتیمانی | ٤٩٩٩٦٣ | ١١ |
| ٥٦١ | یەکگرتوی ئیسلامی کوردستان | ١٥٧٦٨٨ | ٥ |
| ٥١٦ | کوتلەی(المصالحه والتحریر) | ١٢٩٨٤٧ | ٣ |
| ٦٣١ | الرسالیون | ١٤٥٠٢٨ | ٢ |
| ٦٣٠ | لیستی بەرەی تورکمانی | ٨٧٩٩٣ | ١ |
| ٧٤٠ | لیستی رافیدەین | ٤٧٢٦٣ | ١ |
| ٦٢٠ | لیستی میسل ئالوسی بو نەتەوەی عێراق | ٣٢٢٤٥ | ١ |
| ٦٦٨ | بزووتنەوەی ئێزدی بۆ چاکسازی پێشکەوتن | ٢١٩٠٨ | ١ |
| کۆ | | | ٢٧٥ |

**خشتەی ژمارە (١٢)، ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ١٥ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ بۆ ئەنجوومەنی نشتیمانی عێراق.**(٦٣)

---

(٦٣) بڕوانە: ماڵپەری کۆمیسیۆنی باڵای هەلبژاردنەکان : www.ieciraq.org؛ نتائج انتخابات عراقیة من ویکیبید، یا **http:ar.wikpedia.0rg/wiki** " کۆمیسیۆنی باڵای سەربخۆی هەڵبژاردنەکان لە عیراق، راپورتێك بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، سێ پرۆسەی هەڵبژاردنی مێژوویی لە ساڵێك دا، وەرگێران ساڵح ئەمین و ئەحمەد محمد ئیسماعیل، بەغدا، ئەیلولی ٢٠٠٦، ل ل ٧٠-٩٢

دوای ئەمەش سەرکردایەتی سیاسی کورد لە ٣ ی شوباتی ٢٠٠٥دا، جەلال تاڵەبانیان وەك کاندیدی لیستی هاوپەیمانی کوردستان بۆ یەکێك لە پۆستە سەروەرییەکانی عێراق و مسعود بارزانی بۆ پۆستی سەرۆکی هەرێم و نێچیرڤان بارزانی بۆ پۆستی سەرۆکی حکوومەت و عەدنان موفتی بۆ پۆستی سەرۆکی پەرلەمان پێشنیازکران [٦٤]. لە ١٦ی ئاداری ٢٠٠٥دا لە رێ‌ پرۆسەیەکی دیموکراسییەوە و بە زۆرینەی دەنگی ئەندام پەرلەمانەکانی عێراق جەلال تاڵەبانی بو پۆستی سەرۆك کۆماری عێراق هەڵبژێردرا.[٦٥]

بەهێزبوونی فاکتەری کوردی لە هاوکێشە سیاسییەکانی عێراقدا و ئەو دەستکەوتانەی کە بە هۆی یەکگرتوویی و یەك ریزی گەل و سەرکردایەتی سیاسی کورد لە سەر ئاستی عێراق بە دەستیان هێنا کاریگەری راستەوخۆی کردە سەر دۆزی کورد، و پرۆسەی ئاشتەوایی ناوخۆی بردە قۆناغێکی نوێ‌ ترەوە و هەلومەرجێکی لە باری هێنایە پێشەوە بۆ زاڵبوون بە سەر ناکۆکییەکاندا و رێگەی خۆش کرد بۆ ئەوەی لە ١٢ی حوزەیران ٢٠٠٥دا، (مسعود بارزانی) بە تێکڕای دەنگ لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردرێت، لە ١٤ حوزەیرانی ٢٠٠٥، لە تەلاری پەرلەمانی کوردستان سوێندی یاسایی خوارد.[٦٦]

لە دوای ئەم هەنگاوە گرنگە، هەوڵەکان چڕ کران بۆ کۆتایی هێنان بە دیاردەی دوو ئیدارەیی و پێك هێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو لە کوردستاندا، بۆ ئەم مەبەستەش لە پاش هەوڵ و کۆششێکی دوور و درێژ لە (٧ کانوونی دووەمی ٢٠٠٦)دا رێککەوتننامەیەکی ستراتیژی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە سەر گشت ئەو خاڵانەی ناکۆکیان لە سەر بوو مۆرکرا [٦٧]، دواتریش بۆ بە یاسایی کردنی ئەم

(٦٤) مجلە الصوت الاخر، العدد (٣٤)، اربيل، شباط ٢٠٠٥، ص ٣.

(٦٥) بڕوانە: خەلیل عەبدوڵڵا، تاڵەبانی لە لوتکەی دەسەڵاتی عێراق دا، مەکتەبی بیرو هۆشیاری(ی.ن ك)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٤٣؛ خالد یونس خالد، زعيم الاتحاد الوطني الكردستاني جلال الطالباني، الطبعة الثانية، منشورات مكتبة الفكر والتوعية(ى.ن.ك)، السليمانية ٢٠٠٥، ص ص٨٠-٨٣.

(٦٦) رۆژنامەی خەبات، ژمارە (١٨٢٣)، ١٣ ی حوزەیرانی ٢٠٠٥؛ مجلة الصوت الأخر، العدد (٥١)، اربيل، ١٥ حوزيران٢٠٠٥، ص ص ٢- ٥.

(٦٧) رۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٠٢٥)، هەولێر، ٢٠٠٦/١/٨.



رێککەوتننامەیە و شەرعییەت پێ‌ دانی لە ٢١ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ دا، پەرلەمانی کوردستان پڕۆژە بڕیاری یەکگرتنەوەی هەر دوو ئیدارەی پەسند کرد و لە لایەن مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانییەوە ئیمزای لە سەر کرا[٦٨].

دوای ئەم هەنگاوەش پەرلەمانی کوردستان لە ٢٢ی شوباتی ٢٠٠٦دا لە دانیشتنێکی نائاساییدا بە تێکڕای دەنگ، نێچیرڤان بارزانی بۆ پۆستی سەرۆکی حکوومەتی یەکگرتوو عمر فەتاح بۆ پۆستی جێگری سەرۆکی حکوومەت، دەستنیشانکرا [٦٩] و لە ٢٦ ئاداری ٢٠٠٦ لە لایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەرۆکی حکوومەت و جێگرەکەی راسپێردران بۆ پێکهێنانی کابینەی پێنجەم [٧٠] و لە ٧ی ئایاری ٢٠٠٦ دا کابینەی حکوومەتی نوێی کوردستان ڕاگەیەندرا و دوای ١٢ ساڵ لە دوو کەرت بوونی حکوومەت، کۆتایی بە دیاردەی دوو ئیدارەیی و دوو حکوومەتی هات.[٧١]

هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم و دواتریش، کۆتایی هێنان بە دیاردەی دوو ئیدارەیی و دوو حکوومەتی و پێکهێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو و یەکلاکردنەوەی کێشە و ناکۆکییەکان بە شێوازی دیموکراسی و لە رێگەی گفتوگۆ و دانووستاندن و لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی نەتەوەیی، کاریگەری و باندورێکی مەزنی کردە سەر بەرەو پێشچوونی دۆزی کورد و ناساندنی لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە و فاکتەری کوردی کردە فاکتەرێکی گرنگ و بەهێز لە هاوکێشە سیاسییەکانی عێراق و ناوچەکەدا و لە لایەن هێزە هەرێمی و نێو دەوڵەتییەوە حیسابی تایبەتی بۆ کرا، دەتوانین بڵێین هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم و پێکهێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو و بە قۆناغێکی گرنگ دادەنرێ‌ لە مێژووی نەتەوەی کورددا ، لێرەدا هەوڵ دەدەین رەهەندە جیاوازەکانی ئەو بایەخ و گرنگییە پیشان بدەین و شرۆڤەی بکەین.

(٦٨) بۆ بینینی دەقی رێکەوتن نامەکە بڕوانە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٧١)، ٢٠٠٦/١/٢٦، ل ٢.

(٦٩) هەفتەنامەی گوڵان ژمارە (٥٧٥)، ٢٠٠٦/٢/٢٣، ل ٥.

(٧٠) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٧٩)، ٢٠٠٦/٣/٣٠، ل ٧؛ رۆژنامەی خەبات، ژمارە، (٢٠٩٥) ٢٠٠٦/٣/٢٧.

(٧١) رۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢١٣٧)، ٢٠٠٦/٥/٨؛ هەفتەنامیە گوڵان، ژمارە (٥٨٥)، ٢٠٠٦/٥/١١، ل ٣.

## ڕەهەندە جیاوازەکانی گرنگی هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم:

هاوکات لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی ١٩ ی ئایاری ١٩٩٢ دا، دەبوایە ڕێبەری بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە دیاری بکرێت(٧٢)، بەڵام بە هۆی ناکۆکی و ململانێ بەرتەسکەکانی ئەوکاتی حیزبایەتی، سەرکردایەتی سیاسی کورد نەیتوانی ئەم پۆستە بە کاری بهێنێ و بیخاتە گەڕ بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردستان.

لەگەڵ هەموو ئەم دواکەوتنەشدا، بەگەڕخستنی ئەم پۆستە و هەڵبژاردنی بەڕێز (مسعود بارزانی) وەك یەکەمین کەس لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە بۆ پۆستی سەرۆکایەتی هەرێم؛ خاڵی وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکی مەزن بووە، بە ئاراستەی چەسپاندن و قووڵبوونەوە و بەرەو پێش چوونی ئەزموونی دیموکراسی هەرێمی کوردستان بە شێوەیەك لە دوای ئەم هەنگاوە گرنگە، هەوڵەکانی چڕ تر کران بۆ زاڵبوون بە سەر ناکۆکییەکاندا و نەهێلانی کۆسپ و تەگەرەی بەردەم پرۆسەی یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی (هەولێر و سلێمانی) و لە ئاکامیشدا کۆتایی بە دیاردەی دوو حکوومەتی و دوو ئیدارەیی هات.

لە لایەکی ترەوە یەك هەڵوێستی و یەکگرتووی سەرکردایەتی سیاسی و دانانی بەردی بناغەی سەرۆکایەتی هەرێم، کوردی کردە فاکتەر و توخمێکی گرنگ، لە هاوکێشە سیاسییەکانی عێراق و ناوچەکە دا، وای کرد کە هەولێر وەك پایەتەختی دەوڵەتانی ناوچەکە، ببێتە خاوەن بڕیار و پێگەیەکی گرنگ، بە شێوەیەك بۆ بە وێستگەی گەشتە سیاسی و دیپلۆماسی دەوڵەتە گەورەکان بۆ گفتوگۆ و ڕاوێژکردن لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی سەبارەت پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکان.(٧٣) بێگومان ئەمانە هێما و ئاماژە بەخش بۆتە بەوەی

---

(٧٢) کریَس کۆچێرا، بزووتنەوەی کورد...، ل٢٠ -٢١.

(٧٣) هەر دوا بە دوای کاندیدکردنی بەڕێز(مسعود بارزانی) بۆ پۆستی سەرۆکایەتی هەرێم، لە ١٢ ی نیسانی ٢٠٠٥ لە کەڤانی سەردانەکەیدا بۆ عێراق، وەزیری بەرگری ئەمەریکا (دۆنالد رامسفێلد)، سەرەدانی کوردستانی کرد، دوای کۆبوونەوە لەگەڵ مسعود بارزانییەوە، هەردوو لا زۆر بە وردی پرۆسەی سیاسی عێراق و مەسەلەی دەستووری هەمیشەیی و هەروەها پەیوەندی و هاوپەیمانی نێوان گەلی ئەمریکا و گەلی کوردستان، گفت و گۆیان لە سەر کرد، لە لایەن خۆیەوە (دۆنالد رامسفێلد) پشتگیری و پێزانینی خۆی بۆ مافەکانی گەلی کوردستان دەربڕی، و داواشی لە سەرکردایەتی سیاسی کرد، چۆن لە پرۆسەی ئازادی عێراقدا ڕۆڵیان هەبووە، بە هەمان شێوە لە ئاوەدانکردن و بەرەو پێش بردنی پرۆسەی سیاسی ڕۆڵی گرنگ بگێڕن، لە



---

هەمانکاتدا و هەردوولا هاوڕایی و مکوری خۆیان بۆ یاسای کاتی عێراق دووپات کردەوە، وەك بنچینەیەك بۆ داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی.

لە هەمان چوارچێوەدا و لە میانەی گەرم بوونەوەی گفتوگۆ و دانوستاندنەکان لەسەردەستووری هەمیشەیی، لە ١٥ ئایاری ٢٠٠٥ (کۆندالیزا رایس) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بە شێوەیەکی فەرمی سەردانی کوردستانی کرد، لەم سەرەدانەکەی رایس بۆ لای بەریز مسعود بارزانی چەندین دۆسی و تەوەری گرنگ و گەرم و گوڕ پەیوەند بە پرۆسەی سیاسی عێراق، لەوانە مەسەلەی نووسینەوەی دەستووری هەمیشەی و چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ داڕشتنی، لە سەر بنەمای تەوافق و پێکەوەسازان و ڕێگرتن لە هەژموون و باڵا دەستی عەرەبی شیعە و ڕاکێشای عەرەبی سونە بۆ ناو پرۆسەکە خراونە بەر باس و لێکۆڵێنەوە هاوکات، هەردوو لا پشتگیری و پابەندبوونی خۆیان بۆ بنیادنانی عێراقێکی فیدراڵی، دیموکراسی، فرەیی، دووپات کردەوە.

ئەم سەردانەی رایس لە کاتێکدا بوو کە عێراق ڕووبەڕووی گەورەترین کێشەی مێژووی خۆی بووە، ئەویش داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی بوو، ئەو دەستوورەی هەر نەتەوە و، گروپێکی سیاسی، دینی، مەزهەبی، لە هەوڵی ئەو دا بوون کە پێکەو شوێن و ڕۆڵیان تێدا دەستنیشان بکرێت، هاوکات ئەم سەردانەی رایس، هێما و ئاماژە بەخش بووە بەوەی کورد فاکتەرێکی گرنگ و سەرەکییە لە هاوکێشە سیاسییەکانی عێراق و رولێکی کارای هەیە لە سەر ڕەوتی ڕووداوەکانی، ئاماژە بەخش بووە بەوەی تێڕوانین بۆ چوون و بینینەکی هاوبەش هەیە سەبارەت بە پرس و گرفتەکانی عێراق.

بە هەمان ئاراستە لە دوای هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم لە ٢٢ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥، (عمر و موسی) سەرۆکی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی، بە شێوەیەکی فەرمی سەردانی کوردستانی کرد، لەگەڵ بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کۆبووە، دواتریش لە پەرلەمانی کوردستاندا، وتارێکی پێشکەش کرد، ئەم سەردانەی سکرتێری کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی دان پێدانانێکی ئاشکرای سکرتێری کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بووە بە واقیع و بارودۆخی کوردستان و ئەو پێشهات و گۆڕانکارییە دیموکراسییانەی کە ڕووی داون، ئەمەش دەتوانین لە قسە و بۆچوونەکانی (عمر و موسی) دا ببیینین کە ئاماژەی بەوەی کرد : " ناکرێت نکۆڵی لە ڕۆڵی کورد و بەرژەوەندییەکانی بکرێت "لە لایەکی ترەوە دەکرێت ئەم سەردانەی سەرۆکی وڵاتانی کۆمکاری عەرەبی لە ڕوانگەی ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی زۆرینەی شیعە بێت و دەرخەری ترس و نیگەرانی دەوڵەتانی عەرەبی بێت، لە زیاد بوونی پێگە و نفووسی ئێران لە ناوەڕاست و خواروی عێراقدا، بە تایبەت ئەم سەرەدانەی (عمرو موسی) هاوکات بوو لەگەڵ بلند بوونی دەنگی ناڕەزایی دەوڵەتی عەرەبستانی سعودی دژی پێ چەقاندنی ئێران لە باشووری عێراقدا، هەروەها ئامانجێکی تری ئەم سەردانە بەهاناوە هاتنی عەرەبی سوونە بوو، بۆ ئەوەی زیاتر خۆیان گۆشەگیر نەکەن.

كە كورد بووتە فاكتەرێكی گرنگ و سەرەكی لە هاوكێشە سیاسییەكانی عێراق و ناوچەكەدا و ڕۆڵ و كاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ڕەوتی ڕووداوەكانی عێراق بـە شـێوەیەك پـەراوێزكردنی گەلیك زەحمەتە.

لە سەر ئاستی عێراقیش، هەر دوا بە دوای هەڵبژاردنی (مسعود بارزانی) بۆ سەرۆكایەتی هەرێم، سەردانێكی چڕ و پڕ و بەرنامە دارێژراوی لە حوزەیرانی٢٠٠٥ بـۆ بەغـدا ئـەنجام دا و وێرای دیدار و كۆبوونەوەی جۆراوجۆر لەگەڵ بەرپرس و لایەنە سیاسییەكانی عێراق، داوای لـە گشت لایەنەكان كرد كە بەشداری لە سەرسـەختی پرۆسـەی سیاسـی بكـەن، لـە ئەنجوومـەنی نیشتیمانی عێراقیدا وتارێكی مێژووی بە ناوی سەرۆكی هەرێمی كوردستان پێش كەش كرد و جەختی كردە سەر بنیاتنانەوەی عێراق لە سەر بنەمای تـەوافق و شـەراكەت [٧٤]، فاكتـەرێك بوو بە ئاراستەی خاوبوونەوەی گرژی و ئاڵۆزییەكانی پەیوەست بە پرۆسەی دارشتنی دەستووری هەمیشەیی و زاڵبوون بە سەر ناكۆكییەكاندا.

لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیش بێگومان هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی هەرێم، فاكتەرێكی گرنگ بووە، بۆ ئەوەی دەوڵەتە گەورەكان وەك ئەمەریكا و بەریتانیا و دەوڵەتانی ئەورووپی و یـەكێتی

لە هەمان چوارچێوەدا، لە ٦ ی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٦دا بۆ جاری دووەم (كۆندالیزا رایس) وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا سەردانی كوردستانی كرد، و لەگەڵ مسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان كۆبووە، و هەردولا زۆر بە وردی پرۆسەی سیاسی عێراق و مەسەلەی ئاشت بوونەوەی نیشتمانی و مەسـەلەی نـەوت و چـۆنیەتی دابەشكردنی بە سەر گشت پێكهاتەكانی عێراقدا، خرایە بـەر بـاس و لێكۆڵینـەوە، لـە لایـەكی تـرەوە ئـەم سەردانەی رایس هاوكات بوو لەگەڵ هەڕەشە و گوڕەشەكانی توركیـا بـۆ دەسـتوەردان لـە كاروبـاری نـاوخۆی هەرێمی كوردستان و سنوور بەزاندنی بۆیە هەردوولا جەختیان لە سەر چارەسـەركردنی كێـشەی (PKK) بـە ڕێگای سیاسی و دیپلۆماسی كـردەوە و لـەم ڕووەوە رایـس رایگەیانـد " هـەوڵ ئـەدەین لەگـەڵ حكوومـەتی كوردستان و عێراق و توركیا، چارەیەك بۆ ئەم پرسەیە بدۆزینەوە بڕوانە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمـارە (٥٣٢)، ٢٠٠٥/٤/١٤، ل ٤٢؛ هەفتەنامـەی گـوڵان، ژمـارە (٥٣٧)، ٢٠٠٥/٥/١٩، ل ١٢؛ هەفتەنامـەی گـوڵان، ژمـــارە (٥٦٠)، ٢٠٠٥/١٠/٢٧، ل ل ٨- ٩؛ ڕۆژنامـــەی خـــەبات، ژمـــارە (١٩٥٥)، ٢٠٠٥/١٠/٢٤؛ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٢٨٩)، ٢٠٠٦/١٠/٧.

(٧٤) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٤٢)، ٢٠٠٥/٦/٢٣ ل ل ٣ — ٥.



ئەورووپا، داوەتی فەرمی سەرۆكی كوردستان بكەن و لە نزیكەوە سەبارەت بـە پرسـی كـورد و ڕۆڵەكەی لە پێشهات و گۆڕانكارییە سیاسییەكانی عێراقدا، گفتوگۆ و ڕاوێژی لەگەڵدا بكەن.

هەر دوابە دوای هەڵبژاردنی سەرۆكی هەرێم لە ٢٣ی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٥دا، مـسعود بارزانی بە یاوەری شاندێك بە شێوەیەكی فەرمی بانگهێشتی ئەمـەریكا و چـەند دەوڵـەتێكی ئەورووپی كرا، لە سەرەتای سـەردانە فەرمییەكەیـدا لـە ٢٥ ی تـشرینی یەكـەم ٢٠٠٥دا لـە كۆشكی سپی لە لایەن (جۆرج دەبلیو بۆش)وە پێشوازی لێكرا، لە وتەیەكدا جۆرج بۆش ڕۆڵـی سەركردایەتی سیاسی كوردی لە پرۆسەی داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەییدا بە بەرز نرخانـد و ڕایگەیاند: " گفتوگۆ یەكی زۆر باشمـان لەگـەڵ سـەرۆكی كوردسـتان ئـەنجام داوە، جـەنابی سەرۆك لە پرۆسەی داڕشتنی دەستووری هەمیشەییدا زۆر یارمەتی ئێمـەی داوە، مـن دڵنیـام كردەوە كە ئەمـەریكا لەگـەڵ هـەموو ئـەو كەسـانەدایە كـە خوازیـاری عێراقێكـی ئـازاد و دیموكراسین دەربارەی ئایندەی عێراق جەنابی سەرۆك بۆچوونێكی زۆر ڕوون ئاشكرای هەیـە كـە لەوێ زۆر نەتەوە و و ئایین هەن و هەموویان دەتوانن پێكەوە لە ئاشتیدا بژین."[٧٥]

هەروەها لە چوارچێوەی سەردانەكەیدا سەرۆكی كوردستان و شاندە یاوەرەكەی لـە مـاوەی ٢٣ی تشرینی یەكەم تـا ١٥ی تـشرینی دووەمـی ٢٠٠٥ دا سـەردانی دەوڵـەتانی بـەریتانیا، ئەڵمانیا، نەمسا، فاتیكان، ئیتاڵیا كرد و سەبارەت ڕەوشـی عێـراق و كوردسـتان و پێـشهاتە سیاسییەكان لەگەڵ بەرپرسانی ئەم وڵاتانە گفتوگۆی كرد، ئـەم سـەردانەی سـەرۆكی هـەرێمی كوردستان بۆ ئەمەریكا و دەوڵەتانی ئەورووپی گرنگ و تایبەتمەند بوو لە سەر گشت ئاستەكان و بایەخێكی گەورەی هەبوو سەبارەت بە كوردەوە لە بەر كۆمەڵێك فاكتـەر كـە دەتـوانین بـەم شێوەی خوارەوە ئاماژەی پێ بكەین:

ئەم سەردانە فەرمییەی سەرۆكی هەرێمی كوردستان بۆ ئەمەریكا و دەوڵەتانی ئەورووپی و پێشوازی لێكردنی لەم ئاسـتە بـەرزەی نێودەوڵەتیـدا، دانپێـدانان بـووە بـە واقعـی هـەرێمی كوردسـتان و سـەرۆكایەتی هـەرێم و دام و دەزگـا شـەرعییەكان (پەرلـەمان، حكوومـەت، دەسـەڵاتی قـەزایی و لەشـكری پێـشمەرگەی كوردسـتان)[٧٦] هـەروەها دانپێـدانان بـووە بـە

(٧٥) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٦٠)، ٢٠٠٥/١٠/٢٧. ل ٣.

(٧٦) د. نـووری تالـەبانی، چـاوپێكەوتنێكی تایبـەت لەگـەڵ ڕۆژنامـەی خـەبات، ژمـارە، (١٩٥٩)، ٢٠٠٥/١٠/٣٠.

سیستەمی دیموکراسییانەی هەرێمی کوردستان و ڕێزگرتن بووە لە بڕیاری پەرلەمان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم.

ئەم سەردانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە کاتێکدا بووە کە ئەنجامەکانی ریفراندۆم بۆ پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی عێراق، ئاشکرا کرابوو کە تێیدا زۆربەی خەڵکی کوردستان بە بەڵێ دەستووریان پەسەند کرد، ئەمەش پەیامێك بوو سەرۆکی کوردستان توانی بیخاتە بەرچاوی ئەمەریکا و دەوڵەتە ئەوروپییەکان، بەوەی گەلی کورد دەخوازێت لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێی عێراقدا بژیت، دەوڵەتێك لە سەر بنەمای و ڕێزگرتن لە مافەکانی یەکتر بونیاد بنرێت، ئەم پەیامەش لە لایەن ئەمەریکا و دەوڵەتە ئەوروپییەکان قبووڵ کرا، ئەمەش بە ڕوونی لە قسەی (بۆش) دا بە دەردەکەوێ کاتێك ئاماژە بە ڕۆڵی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەکات لە سەرخستنی پرۆسەی نووسینی دەستووری هەمیشەیی. [٧٧]

لە رووی شێوازی ڕێوڕەسمی و خۆنەریتی پێشوازی و پرۆتۆکۆلی سەردەمیانە، ئەم سەردانە بەڵگەبوون لە سەر ئەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سیفەتێکی سەروەری هەیە و نوێنەرایەتی هەرێمێك دەکات بە ناوی هەرێمی کوردستان لە بەردەم جیهاندا [٧٨]، ئەمەش لە دەستووری هەمیشەییدا دەقنووس کراوە و زۆرینەی گەلانی عێراق دەنگیان بۆی داوە، هەروەها بەکارهێنانی دەستەواژەی (سەرۆك بارزانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان) بەمانای دانپێدانانی فەرمی بووە بە سازکردن پێوەندییە دەرەکییەکان لەگەڵ هەرێمی کوردستان.

ئەم بانگهێشت کردنە فەرمییە پەیامێکی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە کورد لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناڤێندا، دەتوانن ڕۆڵێکی کارا و پۆزەتیڤ لە گۆڕانکاری سیاسی ناوچەکەدا ببینن، توانایان هەیە ببنە هێزی سەرەکی لە پرۆسەی بەدیموکراتی کردنی ناوچەکەدا و ئەم هەڵوێستە، پۆزەتیڤانەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە هەمبەر سەرکردایەتی کورد دەرخەر و ڕەنگدانەوەی کاریگەری فاکتەری کوردی بووە لە بەرەو پێش بردنی پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا.

(٧٧) د. خالد سالح، سەردانێکی شایستە و قۆناغێکی نوێ، هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٥٦٠)، ٢٠٠٥/١٠/٢٧، ل ٧.

(٧٨) د. مونزر ئەلفەزل، پێشوازی سەرۆك بۆش لە سەرۆکی کوردستان نیشانەی گەورەی کەسایەتی سەرۆك بارزانییە، هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٥٦٢) ٢٠٠٥/١/١٧، ل ل ٧ — ٨.



ئەم بەیەك گەیشتنەی بەڕێزان (بارزانی — بۆش) لە ئاکامی زەنجیرەیەك بەرژەوەندی هاوبەشی لە نێوان کورد و ئەمەریکا بووە لە عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەها لە ئەنجامی بە هێزی فاکتەری کوردی و پێگە و شوێنی جیوپۆلیتیکی کوردستان و یەك ریزی و یەك هەڵوێستی سەرکردایەتی سیاسی کورد بووە[٧٩].

لە سەر ئاستی یەکێتی ئەورووپاش، سەرۆکی کوردستان بە داوەتێکی فەرمی لە ٨ی ئایاری ٢٠٠٧ دا سەردانی یەکێتی ئەورووپای کرد و لە لایەن(خافێر سۆلانا) بەرپرسی کاروباری دەرەوەی ئەورووپا و (هانز گارت) سەرۆکی پەرلەمانی یەکێتی ئەورووپا پێشوازی لێکرا، پاشان لە وتارێکدا لە ناو پەرلەمانی یەکێتی ئەورووپا، تێڕوانین و بۆچوون و دیدگای کورد سەبارەت بە ئایندەی عێراق و کوردستان، بە شێوەیەکی زۆر ریالیستانە و واقع بینانە شرۆڤەی کرد و ئاماژەی بە کۆمەڵێك خاڵی گرنگ کرد کە بریتی بوون لە [٨٠] :

١- سەبارەت بە یەك پارچەیی خاکی عێراق و مەسەلەی فیدراڵییەت، سەرۆکی هەرێمی کوردستان، یەکێتی خاکی عێراقی بەستەوە بە پراکتیزەکردنی دەستووری هەمیشەیی عێراق کە زۆرینەی گەلانی عێراق دەنگیان بۆی داوە، بەو مانایەی کە ئەگەر عێراق، عێراقێکی دیموکراسی، فیدراڵی، فرەیی بێت، ئەوا نەتەوەی کوردیش دەیەوێت و دەخوازێت بەشێك لەو کۆمەڵگە دیموکراسییە و ئەگەر عێراقەکەی سەدام حسێن و رژێمەکانی پێشوو تر بێت و ڕێز لە ئیرادە و خواستی نەتەوەی کورد نەگرێت، ئەوا گەلی کورد ئامادە نابێت داکۆکی لە یەك پارچەیی وڵاتێك بکات کە بە زەبری ئاگر و ئاسن پێکەوە بهێڵێتەوە.

٢- سەبارەت بەمەسەلەی کەرکوك ئاماژەی بەوەی کرد کە هەموو ئەو لایەن و هێزو دەوڵەتانەی مەبەستیان سەقامگیری و ئاسایشی عێراقە، پێویستە هەڵوێستی کورد لە سەر مەسەلەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان بە هەند وەربگرن بە پەرلەمانتارە

(٧٩) د. کرمانج گۆندی، سیاسەتی نوێ ئەمەریکا بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سەفەری فەرمی سەرۆکی کوردستان بۆ سەرای کۆشکی سپی، هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٥٦١)، ٢٠٠٥/١١/١٠، ل ل ١٩ — ٢٠.

(٨٠) بڕوانە: هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٦٣٤)، ٢٠٠٧/٥/١٤، ل ل ٨-١٠؛ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٥٠٢)، ٢٠٠٧/٥/٢٢؛ ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٢٤٨٨)، ٢٠٠٧/٥/٨؛ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٥٠٨)، ٢٠٠٧/٥/٢٨؛ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٥٠٥)، ٢٠٠٧/٥/٢٥؛ ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٤٩٨)، ٢٠٠٧/٥/١٨.

ئەورووپییەکانی راگەیاند یەك پارچەیی عێراق بەندە بە جێبەجێکردنی ئەو دەستوورەی کە نەخشە ڕێگەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك لە خۆ گرتووە.

٣- دەربارەی پرسی کورد وەك نەتەوە و چۆنیەتی چارەسەر کردنی ئەم پرسە لە ناوچەکەدا ڕایگەیاند "کورد یەك نەتەوەیە، لە مێژوودا غەدری زۆری لێکراوە و ئێمە دابەش کراوین، پرسمان پێ نەکراوە و بە بێ ویستی خۆمان دابەشکراوین، ئێمە ئەو راستییە دەزانین و ئەو دابەشکردنە تایبەتمەندی و ئالۆزی دروستکردووە، بۆیە لەگەڵ چارەسەری دیموکراتین لە هەر پارچەیەکی کوردستان و بە پێی تایبەتمەندی ئەو بارودۆخە، ئێمە دڵ و دەروونمان لەگەڵ هەموو کوردێکە لە هەر شوێنێك بن و خۆیان شێوەی خەبات و مافەکانی خۆیان دیاری دەکەن، بەڵام پشتگیری سیاسی و مەعنەویان دەکەین، پەیامی کورد ئەوەیە کە دەیەوێت کێشە سیاسییەکانی بە زمانی دیالۆگ و ئاشتییانە چارەسەر بکات نەك بە ڕێگەی توندوتیژی."[81]

ئەم وتارەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە ناو پەرلەمانی یەکێتی ئەوروپا، زۆر مێژوویی و بە بایەخ بووە، لە بەر ئەوەی لەو کاتەی کە کوردستان دابەش کراوە هەرگیز ڕێ بە کورد نە دراوە راستەوخۆ لە کێشەی خۆی بدوێ و بەرگری لە پرسی خۆی بکات، سەبارەت بەگرنگی و بایەخی ئەم وتارەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان (د. کارینا ویسترهام) یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە زانکۆی بیهرگرنی نەرویج و سەرۆکی لیژنەی مەدەنی یەکێتی ئەوروپا و تورکیا لە پەرلەمانی ئەوروپا وتی: " ئەم سەردانە زۆر گرنگ بووە بێگومان ئەمە یەکەم جارە ڕێبەرێکی یان پیاوێکی دەوڵەتی کورد بە فەرمی بانگهێشتی پەرلەمانی ئەوروپا دەکرێت بۆ ئەوەی بە نوێنەرایەتی نەتەوەکەی قسە بکات، بەدرێژایی مێژوو و تاکو ئێستا کورد بواری ئەوەی پێ نەدراوە لە سەر بەرنامەی سیاسی خۆی قسە بکات. هەر کاتێك مەسەلەی کورد خرابێتە ناو بەرنامەی سیاسی تەنانەت لە ئەوروپاش خەڵك و لایەنی دیکە لە بری کورد قسەیان کردووە و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پرسەکە بە گرنگی و سەنگینی سەیر نەکرێت و بۆشاییەك دروست بکات لە لایەن ئەو لایەنە دەسەڵاتدارانەی کە لە بری کورد قسەیان کردووە، هەر ئەوانیش دانووستاندنی سیاسییان لەگەڵ کردووە، بەڵام ئەمجارە پەرلەمانی یەکێتی ئەوروپا ئەو بوارەی رەخساند کە راستەوخۆ لەگەڵ نوێنەری نەتەوەی کورد کۆ ببێتەوە و گوێ لە قسەی بگرن."[82]

---

(٨١) بڕوانە : هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٣٤)، ٢٠٠٧/٥/١٤، ل ل ٨-١٠.

(٨٢) د. کارینا ویسترهام، چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٣٤)، ١٤، ٥، ٢٠٠٧، ل١٣-١٤



سەر ئاستی هەرێمیش قورسایی فاکتەری کوردی و کاریگەری لە سەر ڕەوتی ڕووداوەکانی عێراق و ناوچەکە، بووە هۆی ئەوەی دەوڵەتانی وەك(عەرەبستانی سعودی و کوێت و ئەردن) داوەتی فەرمییان بۆ سەرۆکی هەرێمی کوردستان بنێرن و لە نزیکەوە راوێژ و گفتوگۆ سەبارەت بە هاوکێشە سیاسییەکانی عێراق و ناوچەکە بکەن، چاودێرانی سیاسی، ئەم سەردانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیان بە وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکی زۆر خێرا لە پەیوەندییەکانی نێوان کورد و عەرەبیان لە قەڵەمدا، شایەنی باسە سەردانەکەی مەسعود بارزانی بۆ کوێت و عەرەبستانی سعودی و ئەردن لە ناوەندی سیاسی بەتایبەت ناوەندی ئەقلیمییەکان بە تایبەت ئێران، تورکیا، زۆر بە وردی و چاودێری کرا [83].

---

(٨٣) لە سەر بانگهێشتی فەرمی ئەمیری کوێت سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە ڕۆژانی ١٢-١٤ی ئایاریدا ٢٠٠٦ سەردانی کوێتی کرد و سەرۆکی کوردستان لەو سەردانەی خۆیدا وەك سەرۆکی کوردستان لەگەڵ (سەباح ئەحمەد ئەلسەباح) ئەمیری کوێت کردبووەوە، لەم سەردانەدا سەرۆکی کوردستان جەختی لە سەر مافەکانی گەلی کوردستان کردەوە و خواستی خۆیشی بۆ قوڵکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان هەر دوو گەلی کوردستان و کوێت و والای کردنی دەرگاکانی هەرێمی کوردستان لە بەردەم هەر هەنگاوێك کە خزمەتی برایەتی و دۆستایەتی دوو لا بکات دەربڕی، لەمیانەی ئەم سەردانەدا، هەنگاوە سەرەتاییەکانی گرێدانی پەیوەندییەکی قایمی سیاسی و ئابووری بڕیار درا لەم سەردانەیدا بڕیاردرا کۆمپانیایەکانی کوێت بەشداری لە پەرەپێدانی بواری گەشت و گوزاری کوردستان بکەن.

هەر لەم چوارچێوەیەدا سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە ١٢ ی ئاداری ٢٠٠٧دا بە داوەتێکی فەرمی بۆ شانشینی سعودییە گەیشتە ریاز و لەگەڵ (مەلیك عبداللّٰه) کۆبۆوە و لە کۆبوونەییەدا، هەردوولا زۆر بە وردی بارودۆخی عێراق و کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان باس کرد، و لە دوای سەردانەکەی سەرۆکی کوردستان لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا بە چەند خاڵێك ئاکامی سەردانەکەی خستەڕوو کە لەم خاڵانە پێك هاتبوون:

**یەکەم:** هەردوو لا ڕێککەوتن لە سەر درێژەدان بە وتووێژ و دانووستاندن لە نێوان سەرجەم هێز و لایەنە سیاسییە عێراقییەکان بۆ چارەکردنی کێشەکان بە شێوازی ئاشتییانە.

**دووەم:** زۆر بە فراوانی باسی بارودۆخ و ڕەوشتی عێراق کرا، هەروەها دۆزینەوەی میکانیزمەك بۆ دەرچوون لەو قیرانەی عێراق تێکەوتووە.

**سێیەم** : باوڕ هێنانی عەرەبستانی سعودییە بە ڕۆڵ و سەنگی کورد لە ئایندەی سیاسی عێراق و ڕۆڵی کورد بۆ هێشتنەوەی یەکپارچەیی عێراق.

٢- بایەخی پێکهێنانی حکوومەتی یەکگرتوو و نەمانی دیاردەی دوو ئیدارەیی:

بێگومان ڕێکخستنی ناو ماڵی کورد و یەکلا کردنەوەی کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو پارتی سەرەکی کوردستان (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان) لە ڕێگای دیالۆگ و گفتوگۆ و دانوستاندنەوە و گەیشتن بە ڕێککەوتننامەیەکی ستراتیژیکی لە ٢١ ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦دا و دواتریش کۆتایی هێنان بە دیاردەی دوو ئیدارەیی و دوو حکوومەتی کاریگەری مەزنی هەبووە لە سەر بەرەو پێش چوونی دۆزی کورد، کە لێرەدا دەکرێت ئاماژە بەم چەند خاڵانەی خوارەوە بکەین:

١- گەرچی سەرکردایەتی سیاسی کورد لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق ئاستێکی بەرزی هاوکاری و تەبایی پێوە دیار بوو، سەبارەت ئەو بڕیارانەی پەیوەندی بە پرۆسەی سیاسی و چۆنیەتی بەشداری کورد لە هەڵبژاردنەکانی عێراق و کوردستانەوە هەبوو، هەروەها هاوکاری و هەماهەنگی تەواوی هەبوو لە کاتی نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی و توانرا بەشێکی گرنگی مافەکانی گەلی کورد بچەسپێنرێن، بەڵام هەر لە سەرەتای لادانی ڕژێمی بەعس، بەردەوام پەیوەندی نێوان حکوومەتی مەرکەزی و هەردوو ئیدارەی کوردستان هەڵکێشان و داکێشان بە خۆیەوە دەبینێ، بە هۆی تێروانینی جیاواز سەبارەت مەسەلەی (داهات، نەوت، مەسەلەی پێشمەرگە..)لایەنی کوردیش بە هۆی بوونی دوو ئیدارەیی و دوو حکوومەتی نەیتوانی لە روانگەیەکی بەهێزەوە مامەڵە لەگەڵ بەغدا بکەن، تەنانەت زۆر جاریش بۆ چارەکردنی گرفتەکان لەگەڵ بەغدا لە جێگای بەرپرسانی حکوومەت بەرپرسانی حیزب بەم ئەرکە هەڵدەستان، بەڵام بە پێك هێنانی حکوومەتی یەکگرتووی کوردستان توانرا ڕوانگەیەکی بەهێزترەوە مامەڵە لەگەڵ بەغدا بکەن.

٢- لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق بەشێ هەر زۆری لایەنی عەرەب دژی فیدراڵیزمی جوگرافی مێژووی بوون بۆ هەرێمی کوردستان. و دابەشبوونی کوردستان بە سەر دوو ئیدارە و دوو حکوومەتدا ئەو دەرفەت و بیانویەیان دایە دەست بۆ ئەوەی گەمە و مانۆڕی

**چوارەم :** دامەزراندنی پەیوەندی دۆستانە لە نێوان حکوومەتی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی عەرەبستانی سعودییە. بڕوانە ڕۆژنامەی خەبات، ژمارەکانی (٢١٤٣)، ١٤ ئایاری ٢٠٠٦، (٢٤٣٩) ١٦ ئاداری ٢٠٠٧؛ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٢٧، ٢٠٠٧/٣/١٨، ل ١١. پانوڕامایی سەتەلایتی کوردسان تڤی(v.t) سەبارەت سالی ٢٠٠٧، لە (٣)کانوونی دووەمی ٢٠٠٧کاتژمێر (٩)بەیانی.



سیاسی لە سەر ماف داخوازییەکانی گەلی کوردستان بکەن.[٨٤] بەردەوام دەیانگوت ئێوە دوو ئیدارەتان هەیە با کەرکوکیش هەرێمەکی سەربەخۆبێت. [٨٥] بەڵام پێکهێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو و نەمانی دوو ئیدارە، تا رادەیەکی زۆر بازنەی ئەم گەمە و مانۆرە سیاسییانەی کە دژ بەمافە کانی کورد دەکرا بەرتەسك کردەوە.

٣- حکوومەتی یەکگرتووی کوردستان زۆر جیاواز بوو لە حکوومەتەکانی پێش خۆی، چونکە بەرەگەزی پێش خستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی تایبەتمەند بووە، ئەم حکوومەتە بە پێچەوانەی جارانی پێشوو لە سەر بنەمای وتاری هاوبەش دامەزرابوو [٨٦]و یەکەمین جار بۆ حکوومەتی ئاشتبوونەوەی نیشتیمان رابگەیەنرێت.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکرێت کە پێکهێنانی حکوومەتی یەکگرتوی کوردستان هەنگاوێکی زور گرنگ بووە بە ئاراستەی زیاتر چەسپاندن و بەرەو پێشچوونی پرۆسەی بەدیموکراتیزەکردنی کوردستان، لەم رووەوە هەنگاوی زۆر گرنگی هاوێشترا. هەروەها یەکبوون و یەکخستنی ئیرادەی گەلی کوردستان و پێکهێنانی حکوومەتی یەکگرتوو دەکرێت بەدەسکەوتێکی بەرز هەڵسەنگێنین، چونکە توانی بەپلان و ستراتیژییەکی نوێیەوە لەگەڵ تەوژم و رەوتی خێرای گۆڕانکاییەکان خۆی بگونجێنی. بوون پێگەی خۆی بسەپێنێ و سوود لە رووداوە و وەرچەرخانەکانی ناوچەکە وەربگرێت.

(٨٤) د. خالد صالح، ڕێکەوتن، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ٥٧٠، ١٩ ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦، ل ٤١..

(٨٥) د. فواد حسين، چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە، ٥٧٠، ١٩کانوونی دووەمی ٢٠٠٦، ل ١٠.

(٨٦) د. خالد صالح، هاوبەشی لە کوردستان، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە(٥٧١)، ١٦ کانوونی دووەمی ٢٠٠٦، ل ٤١.

## باسی سێیەم
## دەستووری[٨٧] هەمیشەیی عێراق و مافەکانی گەلی کوردستان

یەکێك لە گیروگرفتەکانی عێراق تاکو رووخانی رژێمی دیکتاتۆری بەعس بریتی بووە لە قەیرانی دەستوور؛ واتە نەبوونی دەستوورێك کە رەنگدانەوەی ماف و داخوازییەکانی پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق بێت. زۆربەی دەستوورەکانی عێراق بە تایبەت لە سەردەمی کۆمارییەوە، لە لایەن دەستە و گروپێکی دیاری کراوەوە دانراون کە بە شێوەیەکی دیموکراسی و لە رێگای گەلانی عێراقەوە، دەسەڵاتیان وەرنەگرتبوو، بەڵکو زۆربەیان بە پاڵپشتی هێزی دەرەکی یاخود لە رێگەی کودەتای سەربازییەوە هاتوونەتە سەر دەسەڵات، و فەرمانڕەواییان

(٨٧) دەستوور بریتییە لە کۆمەڵە ڕێسایەك یان دارشتنێك کە چۆنییەتی پەیڕەوکردن و گواستنەوەی دەسەڵات دیاری دەکەت یان روونده‌کات. ئەمەش مانای ئەوە دەگەینێت کە هەموو دەسەڵاتە گشتییەکان لە دەوڵەت؛ دەکەوێتە ژێر فەرمانەکانی ئەو دەستورەوە وەڵاتدا. فەقهی فەرەنسی، ئوستاد( georges ved) وای بۆی دەچێ کە دەستوور بریتییە لە کۆمەڵێك بنەما کە چونییەتی رێکخستن و بەرێوەبردنی دەسەڵاتی سیاسی دیاری دەکەن. بە واتایەکی تر کۆمەڵێك بنەمان کە دەوڵەت رێکدەخەت، ئوستاد laferrier پێیوایە دەستوور کۆمەڵێك بنەما لە خۆدەگرێت کە سروشت و شێوەی دەوڵەت دیاری دەکەن؛ واتە دیاری دەکەت کە دەوڵەتێکی سادەیە یان فیدراڵی و شێوەکەی دیاری دەکەت کە پادشایەتییە یان کومارییە . هەروەها کۆمەڵێك پرەنسیپی گشتی و بنەرەتە دەگریتەخو کە پێوەندن بە هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان ودەسەڵاتی جیبەجیکردنەوە و پسپورییان دیاری دەکەت و چۆنیەتی ممارسەکردنی. بەڵام ئاراسەیەکی تر هەیە کە پییوایە کە دەستوور ئاراستەی ئایدولوژی یا فەلسەفی دیاری دەکەت کە سیستەمی سیاسی دەوڵەت لەسەر رادەوەستی. فەقهی فەرەنسی (michel henry) پێی وایە لە رووی بابەتی و ماددییەوە(وشەی دەستوور واتای کۆمەڵێك بنەما و قەواعدی تایبەت دەگەینی بۆ رێکخستنی دەوڵەت لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە.ˇ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بروانە: د. شیرزاد احمد نجار، چەند تێبینییەکی بەرایی دەربارەی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق، بەشی یەکەم، هەفتەنامەی گولان، ژمار(٥٥٣)، ٨/٩/ ٢٠٠٥ل ل ل ، ٢٩؛ د. ابراهيم عبدالعزيز شيخا، النظم السياسية و القانون الدستوري: تحليل النظام الدستوری المصری، منشاة المعارف بالاسكندرية، المكتب القانونية (دت) (د م)، ص.



کردووە. هەر بۆیەش زۆربەی ئەو دەستوورانەی کە دانرابوون گوزارش لە حەز و ویست و تێڕوانینی دەسەڵاتدارەکانی عێراق دەکەرد و دەرهاوێشتەی ویست و بەرژەوەندی دەسەڵاتدارەکان بووە نەك ویست و بەرژەوەندی گەل و نەتەوەکانی عێراق بێت. [٨٨]

(٨٨) یاسای سەرەکی عێراق ساڵی دا ١٩٢٥ بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ناوی کورد وەك نەتەوە ئاماژەی پێ نەکردووە. بە هیچ شێوەیەکیش ئەم یاسایە باسی مافە نەتەوەییەکانی کوردی نەکردووە.
لە ساڵی ١٩٥٨دا لە رووی دەستوورییەوە گۆڕانکاری بنەڕەتی بە سەر مێژووی دەستوور لە عێراقدا هات و بۆ یەکەمین جار لە دوای لکاندنی کوردستان بە عێراقەوە ئاماژە بەوە کرا کە کورد و عەرەب هاوبەشن لە عێراقدا و ئەمەش لە بەندی (٣) دەستووری کاتیدا ئاماژەی پێ کرابوو کە تێدا هاتبوو " کیانی عێراقی دروست دەبێ لە سەر بنەمای هاوکاری کردن لە نێوان گشت هاوڵاتیاندا و بە رێز گرتن لە مافەکانیان و پاراستنی ئازادییەکانیان و عەرەب و کورد، هاوبەشن لەم نیشتیمانە دا و ئەم دەستوورە دان دەنێ بە مافە نەتەوەییەکانی لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا ".
لە دەستووری کاتی ٢٩/ی نیسانی ١٩٦٤دا هیچ بەندێکی تایبەت بە کوردی تێدا نەبووە، بەڵکو پاشگەز بوونەوەی تەواوی کردبوو لەوەی کە کورد لە دەستووری کاتی ١٩٥٨دا بە دەستی هێنابوو و بە شێوەیەکی زۆر لێڵی مژاوی لە بەندی (١٩) دا ناوی کوردی هێنابوو. لەوەش زیاتر ئەم دەستوورە جەختی کردبووە سەر یەکگرتنەوەی نێوان هەردوو کۆماری عێراق و کۆماری یەکگرتووی عەرەب و بە سەر نەتەوە و گەلانی نا عەرەب دا سەپاندبوو کە دەبێ کار بکەن بۆ بەدیهێنانی ئەم یەکگرتنە و بیری نەتەوە پەرەستی عەرەب بە سەریاندا سەپاندبوو و تەواوی پێکهاتەکانی عێراق وەك بەشێك لە نەتەوەی عەرەب لە قەڵەمدرا بوون.
هەروەها لە دەستووری کاتی ٢١ ئەیلولی ١٩٩٨ بە هەمان شیوەی دەستووری کاتی ١٩٦٤ زیاتر گرنگی بە بەعروبەی عێراقی دابوو. زیاتر جەختی کرد بۆ سەر قووڵبونەوەی فکری نەتوەپەرستی عەرەبی بە تایبەت لە بەندی (١)ی ئەم دەستوورەدا ئاماژە بە وە دەکەت کە دەوڵەتی عێراق دەوڵەتێکی عەرەبی رەسەنە(خالص). بە بێ ئاماژەکردن بە پێکهاتەی نەتەوەی و ئەتنی، هەروەها بەندی(٤) زمانی عەرەبی بە زمانی فەرمی عێراق دادەنی. ئەم دەستوورە تەنیا لە بەندی (٢١)دا کە لە بنەڕەتدا لە ناوەرۆکەکەی بەندی (١٩) دەستووری کاتی ٢٩/ی نیسانی ١٩٦٤دا وەرگرتبوو بە شێوەیەکی زۆر لێڵی مژاوی ناوی کوردی هێنابوو.
لە ژێر گوشاری شۆڕشی ئەیلول و بزاڤی رزگاری خوازی کورد لە دەستووری ١٦ی تەمووزی ١٩٧٠دا دا ئاماژە بەوەی کرد کە عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێك دێت و هەروەها ئیعترافی کردبوو بە فەرمی بوونی زمانی کوردی لەو شوێنانەی کە کورد تێیدا زۆرینەن. بڕوانە: دستور العراق الملكي القانون الاساسي سنة ١٩٢٥، اعداد،

پشتگوێ خستن و بەشداری پێ نەکردن و پەراوێزکردنی کورد لە پرۆسەی دارشتن و پەسەندکردنی دەستوورەکانی عێراق بە درێژایی سەدەیەك و پشتگوێ خستنی کردنی مافەکانی، لە زۆربەی ئەو دەستوورانەدا، فاکتەری سەرەکی سەرهەڵدانی شەڕ و ململانێ بوون لە نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و حکوومەتەکانی عێراق.

لە دووای گۆڕانکارییەکانی (٩)ی نیسانی ٢٠٠٣ و رووخانی رژێمی دیکتاتۆری بەعس لە عێراق، گۆڕانکارییەکی گەورە لە گۆڕەپانی سیاسی عێراقدا هاتەکایەوە، و هەلومەلوجەکی نوێ و لە بار هاتە پێش، بۆ سەرلەنوێ دامەزراندن و بنیادنانەوەی دەوڵەتی عێراق، لە سەر بنەما و شێوازێکی نوێ، هەروەها دانانی دەستوورێکی هەمیشەیی، کە گوزارشت لە ماف و داخوازییەکانی گشت پێکهاتەکانی عێراق بکات. بۆ یەکەمین جار پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق لە مێژووی دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە دەرفەتیان بۆ رەخسا کە رۆڵێکی کارا و بنەڕەتی بگێڕن، لە پرۆسەی سیاسی و دارشتنی دەستووری هەمیشەییدا.

یەکەم هەنگاوی خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم مەبەستە و بەرەو پێش بردنی پرۆسەی سیاسی عێراق و نووسینەوەی دەستووری کاتی و دواتریش دەستووری هەمیشەیی، لە (١٣)ی تەمووزی ٢٠٠٣دا ئەنجوومەنی فەرمانڕەوایی(مجلس حكم) دامەزرا[٨٩] کە ئەندامەکانی زۆرینەی پێکهاتەکاتی عێراقیان لە خۆ گرتبوو.[٩٠]

---

القاضي نبيل عبدالرحمن حياوي، مكتبة القانونية، (د.ت) بغداد؛ دساتير العراق الجمهوري، إعداد القاضى نبيل عبد الرحمان حياوى، مكتبة قانونية (د.ت) —بغداد؛ شورش حسن عمر، ص ص ١٣٥ +(٢٥٥-٢٥٦.

بەڵام لە ڕاستیدا هەمووی ئەم دانپێدانانە و بڕیارانە مەسەلەی زۆر رووکاری و بێ بنەما بوون و لە سەر ئاستی پراکتیکی هەرگیز نەخراونە بواری جێبەجێکردنەوە و زۆربەی ئەم دان پیادانانە لە ژێر گوشار و خەباتی چەکداری بزاڤی رزگاری خوازی کورد دا بووە، نەك لە روانگەی بڕوای تەواو و قەناعەتەوە، هەر بۆیەش کاتێك دەرفەتیان بۆ رەخساوە و هاوکێشە سیاسییەکان بە ئاراستەی بەرژەوەندی دەسەڵاتدارەکانی عێراق گۆڕانکاری بە سەر دا هات، ئەوا تەواو بە پێچەوانەی بەندەکانی دەستوورە وە بە توندترین شێوە پێشێلی مافەکانی کوردیان کردووە و خەڵکی سیڤیلی کوردستان بە شێوەیەکی بەرفراوان کەوتبوونە بەردەم شاڵاوی سەرکوتکردن و لەناو بردن و کۆمەڵکوژ کردن و ڕاگواستنەوە.

(٨٩) ئەنجوومەنی حوکم کە لە ١٣ی تەمووزی ٢٠٠٣دا دامەزرا، ئەندامەکانی (٢٥)کەس بوون. هەموو پێکهاتەکانی گەلی عێراقی لە خۆگرتبوو. پێکهاتەی ئەم ئەنجوومەنە بەم شێوەیە بوو: کورد (٥)، عەرەبی



لە (١٥)ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣دا رێککەوتن نامەیەکی سیاسی لە نێوان ئەنجوومەنی حوکم و (پۆل بریمەر) فەرمانداری ئەمەریکی لە عێراق ئیمزا کرا [٩١]. شایانی باسە ئەم رێککەوتنە نەخشە رێگایەك بووە بۆ بەرەو پێش بردنی پرۆسەی سیاسی، و کۆمەڵێك خاڵی گرنگی لە خۆ گرتبوو لەوانە[٩٢]:

---

شيعه (١٣)، عەرەبی سونه (٥)، تورکمان (١)، مەسیحی (١). هەروەها ئەنجوومەنی حوکم لە ٢٩ی تەمووزی (٧)ی ٢٠٠٣ دا ئەنجوومەنی سەرکردایەتی پێك هێنا کە لە (٩)کەس پێکهاتبوون و بە شێوەیەکی دەوری دەسەڵاتیان وەردەگرت، ناوەکانیش بەم شێوەی خوارەوە بوون : ١- د. ابراهيم الجعفرى - ٢ — د. احمد الچلبی -٣- د. ئەیاد عەلاوی -٤- جلال تالەبانی -٥- عبدالعزيز الحكيم -٦- د. عدنان الپاچەچی -٧- د. محسن عبدالحميد -٨- د. محمد بحرالعلوم -٩- مسعود بارزانی. بڕوانە : لقمان عمر حسن، المبدأ المشاركة في الدولة الفدرالية دراسة التحليلية المقارنة، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، اربيل، كلية القانون و السياسة، ٢٠٠٦، ص ١٤٦؛ صيف الخياط، كيف حكموا العراق، (اوراق من دهاليز مجلس الحكم) (دت) (دم)، ص ص ٤٨ — ٤٩.

(٩٠) بڕوانە: د. حميد حنون خالد، قراءة في قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، في: د. محمود شريف بسيوني و آخرون، دراسات دستورية عراقية حول موضوعات اساسية لدستور العراق الجديد، الطبعة الاولى، المعهد الدولي لقانون حقوق الانسان، كلية الحقوق بجامعة دي بول الامريكي، ٢٠٠٥ ص ٤٢٦.

(٩١) لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٩ی نیسان ٢٠٠٣ لە عێراقدا، ئەمەریکا (جەی گارنەر) ژەنڕاڵی خانەنشین کراو وەك فەرمانڕەوای ئیداری لە چوارچێوەی نووسینگەی ئاوەدانکردنەوە و هاوکاری مرۆڤی بۆ عێراق دەست نیشان کرد ئەمەش یەکەم هەوڵی ئەمەریکا بوو لە دوای رووخانی رژێمی سەدام بۆ بە دیموکراسی کردنی ئەم وڵاتە، جەی گارنەر لەگەڵ سەدان پسپۆڕ و شارەزای ئەمەریکی روویان لە عێراق کرد، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت لە ١٢ی ئایاری (مایو) ٢٠٠٣دا پۆل بریمەر جێگای گرتەوە وەك حاکمی مەدەنی عێراق و دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانانی دامەزراند (Coalition Provisional Authority) لە سەردەمی پۆل بریمەر کۆمەڵێك بڕیاری گرنگ دەرکرا لەوانە، هەڵوەشانی سوپای کۆنی عێراق، دام و دەزگا ئەمنییەکان و هەروەها راگەیاندنی سوپای نوێی عێراق، گۆڕینی دراوی عێراقی و دەرکردنی یاسای ڕیشە کێش کردنی بەعس، دامەزراندنی ئەنجوومەنی حوکم، هەروەها دەرچوونی یاسای کاتی، شایانی باسە ئەمەریکا و بەریتانیا بە پێی بڕیاری ١٤٨٣ کە لە ٢٢ی ئایاری ٢٠٠٣دا دەرچوو خۆیان وەك دەوڵەتی داگیرکەر لە قەڵەمدا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: صيف الخياط، مصدر سابق، ص ص ١٦ — ١٨ و (١٧٠ — ١٨١)؛ التقرير الاستراتيجي العربي (٢٠٠٣ — ٢٠٠٤)، مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية، القاهرة، ٢٠٠٤، ص ص ٣٢ — ٤٣.

١- جەختکردن لەسەر دانانی دەستوورێکی کاتی بۆ قۆناغی ڤەگوهێزەر کە دەبوو بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتی هاوپەیمانان تا (٢٨) ی شوباتی ٢٠٠٤ دابڕێژرێت.

٢- گەڕانەوەی سەروەری و دەسەڵات بۆ عێراقییەکان، لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤دا.

٣- بدرێت بۆ دانانی دەستوورێکی هەمیشەیی.

بەستنی کۆمەڵێك ڕێکەوتننامە لە نێوان ئەنجومەنی فەرمانڕەوای و دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان.

ئەوەی کە لەم ڕێککەوتن نامەیەدا جێگای سەرنج و نیگەرانی و کاردانەوەی سەرکردایەتی سیاسی و خەڵکی کوردستان بووە، ناڤەڕۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە هاودژ بووە لەگەڵ ماف و داخوازییەکانی گەلی کورد، ڕێککەوتننامەکە جەختی لە سەر جێبەجێکردنی فیدراڵییەتی پارێزگاکان (ئیداری) لە عێراقدا کردبوو ئەمەش لە لایەن کوردەوە، بە مانای خۆ دزینەوە بوو لە چارەکردنی دۆزەکەی و پاشگەزبوونەوە بووە لەو بەڵێنانەی کە پێش گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق پێی درابوون، لەم ڕێککەوتننامەیە دا بە هیچ شێوەیەك ناو یاخود وشەی کورد و کوردستانی تێدا بەدی نەدەکرا.[٩٣]

هەر بۆیەش هەر بە دوا بە دوای مۆر کردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە، مسعود بارزانی رای گشتی کوردی لە مەترسی بە لاریدا بردن و پوچەڵکردنی فیدراڵیزم لە ناوەڕۆکەکەی ئاگادار کردەوە و لە گوتارێکدا کە لە هەفتەنامەی گوڵاندا بڵاوکرایەوە جەختی لە سەر ئەوەی کرد کە : " هەر لایەنێك کە ئامانجی یەکخستنی عێراق بێ دەبێ تایبەت مەندی هەرێمی کوردستان وەك خاك و نەتەوە و گەل بێتە پاراستن، هەروەها ئاماژەی بەوە کرد کە : " ئەوانەی بایەخ بە مەسەلەی عێراقی یەکگرتوو دەدەن دەبێ بزانن کە زۆر زەحمەت بوو گەلێکی وەك کورد پاش ئەو هەموو ماڵوێرانی و کارەساتە قەناعەت بەوە بێنێ هەمدیسان لە چوارچێوەی عێراقدا بمێنێتەوە، ئێستا چەند لایەنێکی عێراقی و تارادەیەکیش بیانی باس لە فیدراڵییەتی

(٩٢) فراس عبدالرزاق السوداني، العراق، مستقبل بدستور غامض، نقد قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، تقديم د. عداب محمود الحمش، د. نبيل عبدالرحمان حياوي، مكتبة مدبولي، الطبعة الثانية، القاهرة، ٢٠٠٥، ص ١٢٠.

(٩٣) جەوهەر نامق سالم، ئایا فیدراڵییەت وەك خیارەکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت؟ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە؟ چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، ل ل ٢٢- ٢٣.



پارێزگاکان دەکەن کە ئەمەش لە لایەن گەلی کوردەوە رەتکراوەیە. کورد بە درێژایی مێژووی خەباتی بۆ ئەوە کردووە کە سنوورە مێژووییەکەی کوردستان بێتە پاراستن نەك هەڵوەشاندنەوەی."[٩٤]

لە لایەکی ترەوە لە میانەی گەرم بوونەوە و چڕبوونەوەی گفتوگۆ و دانوستاندنەکان بۆ دانانی یاسای کاتی یاخود یاسای بە ڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ڤەگوهێزەر(ئینتقالی) و نزیك بوونەوەی لە وادەی دیاری کرابوو بۆ دەرچوونی یاسایەکە چەندین پرۆژە و رەشنووسی دەستووری لە لایەنی جیاجیاوە خراونەڕوو لەوانە ئەو رەشنووسەی کە (د. عدنان پاچەچی) خستییەڕوو کە رەشنووسەکەی درێژەپێدەری هەمان ڕێککەوتننامە سیاسییەکەی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ی بووە و زۆر دوور بوو لە خواست و داواکارییەکانی گەلی کوردستان، ئەگەرچی رەشنووسەکە ئاماژەی سەر زارەکی

بە فیدراڵییەت کردبوو، بەڵام فیدراڵییەتێکی بێ ناوەڕۆك و زۆربەی بەندەکانی لە خزمەتی هێنانە ئارای دەسەڵاتێکی سەنتراڵیزمی توند بوو لە عێراقدا.[٩٥]

لە بەرامبەر ئەمەدا سەرکردایەتی سیاسی کورد، بۆ چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی و پاراستنی تایبەتمەندی هەرێمی کوردستان، پرۆژەیەك، یاخود رەشنووسەکی دەستووری پێشکەش بە لیژنەی داڕشتنەوەی دەستووری کاتی کرد، [٩٦] و لە ئەنجامی پێداگرتنی گرووپی کوردی لە ئەنجومەنی حوکم[٩٧] لە سەر مافە نەتەوەییەکانی، و یەك دەنگی و یەك هەڵوێستی

(٩٤) مسعود بارزانی، یەکگرتنی ئارەزوومەندانە لە عێراقێکی فیدراڵی یەکگرتوودا چارەسەر نەك تەنها بۆ کێشەی کورد، بەڵکو بۆ کێشەی عێراقیش، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٧٤)، ٢٠٠٤/٣/٤، ل ل ١٥-١٦.

(٩٥) بریندیر ئولیری، سەپاندنی دەستوورێکی سەنتراڵیزم ئەزموونی کوردستان ژێر پێ دەنێت، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٧٤)، ٢٠٠٤/٣/٤، ل ل ١٦-١٦.

(٩٦) فراس عبدالرزاق السوداني، مصدر سابق، ص ١٢٣.

(٩٧) نوێنەرەکانی کورد لە ئەنجومەنی حوکم پێك هاتبوون لە : ١- مسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان -٢- جلال تالەبانی، سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان -٣- د. محمود عوسمان، سیاسەتمەداری بێلایەنی کورد -٤- صلاح الدین بهائەدین، سکرتێری یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان -٥- حاکم دارا نورالدین. بڕوانە: صیف الخیاط، مصدر سابق، ص ص ٢٤ — ٣١.

سەرکردایەتی سیاسی کورد، لە ئەنجامدا لە بەرواری ٢٠٠٤/٣/٨دا یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی ڤەگوهێزەر بە شێوەیەکی تەوافقی ڕاگەیەنرا.[٩٨]

لەگەڵ ئەوەی دا کە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق، بۆ قۆناغی ڤەگوهێزەر، تەواوی خواستەکانی کوردی لە خۆ نەگرتبوو، لە وانەش مافی چارەی خۆنووسین، بەڵام لە هەمانکاتدا لەو قۆناغەدا گرنگی و تایبەتمەندێتی خۆی هەبوو، بە تایبەت گرنتی وای تێدا بوو کە دەبێ دەستووری هەمیشەیی بە پێی ڕێسای تەوافق و پێکەوە سازان و بە رەزامەندی پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق دابنرێت.

هەروەها کۆمەڵێك بنەما و پرەنسیبی یاسایی و سیاسی نوێی لە خۆگرتبوو کە بێگومان جیاوازییەکی گەورەی هەبوو لەگەڵ عێراقی پێش ٢٠٠٣دا و هەنگاوەکی گرنگ و پڕ بایەخ بووە بە ئاراستەی چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لە دەستووری هەمیشەییدا، خاڵە گرنگ و پۆزەتیڤەکانی ئەم یاسایە بریی بوون لە:

١- داننان بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان وەك حکوومەتێکی فەرمی و شەرعی لە هەرێمی کوردستان، بە هەموو پێکهاتەو دەسەڵاتەکانییەوە، کە ئەمەش لە بەندی (٥٣)ی بڕگەی (أ) دا ئاماژەی پێکراوە و تێیدا هاتووە: " داندەنرێ بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان کە حکوومەتیی فەرمییە لەو خاکەی تا (١٩ ی ئاداری ٢٠٠٣) پارێزگاکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك و دیالە و نەینەوا لە لایەن ئەو حکوومەتەوە بەڕێوە دەبرا، دەستەواژەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان کە لەم یاسایە دا هاتووە، واتە ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان و ئەنجوومەنی وەزیرانی کوردستان و دەسەڵاتی قەزایی هەرێمی لە هەرێمی کوردستان." [٩٩]

٢- یاساکە جەختیشی لە سەر ئەوەی کردبوو کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بە درێژایی قۆناغی ڤەگوهێزەر (انتقالی) کاروباری خۆی بەڕێوە دەبات، ئەمەش لە بەندی (٥٤)ی بڕگەی (أ) دا هاتووە :

"حکوومەتی هەرێمی کوردستان بە درێژایی قۆناغی ڤەگوهێزەر کاروبارەکانی خۆی بەڕێوە دەبات تەنها ئەو مەسەلانە نەبێت کە بە پێی ئەم یاسایە دەکەونە چوارچێوەی دەسەڵاتە

(٩٨) بول بريمر، عام قضيتة في العراق، ترجمة عمرالايوبي، دارالكتاب العربي، بيروت، ٢٠٠٦، ص ٣٨٧.

(٩٩) قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.



دیاری کراوەکانی حکوومەتی فیدراڵییەوە، خەرجی ئەم وەزیفانەش لە لایەن حکوومەتی فیدراڵییەوە دابین دەکرێ بە گوێرەی ئەو ڕێو شوێنانەی تا ئێستا کاری پێ کراوە بە پێی بەندی (٢٥-بڕگەی هـ)ی ئەم یاسایە، هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیی و هێزەکانی پۆلیس سەر بە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان دەبن، هەروەها حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەسەڵاتی دانانی ڕەسم و باجی هەیە لە ناو هەرێمی کوردستان."[١٠٠]

٣- ئەم یاسایە سیستەمی فەرمانڕەوایی عێراقی دیاری کردبوو کە دەبێ سیستەمی فیدراڵی – دیموکراسی و فرە بێت، شێوازی فیدراڵییەتیش بۆ هەرێمی کوردستان لە سەر بنەما و فاکتەرە جوگرافی مێژووی، دیاری کردبوو.

٤- زمانی کوردی هاوشان لەگەڵ زمانی عەرەبی بە زمانەکی فەرمی ناساند لە سەرتاسەری عێراقدا. ٥- سەبارەت بە دۆزی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان بۆ یەکەمین جار لە دوای پەیمانی جەزائیر میکانیزمێکی دەستووری بۆی دیاری کرا بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکە بە شێوازێکی دیموکراسی و ئاشتییانە[١٠١]، لە بەشی سێیەمدا باسی ئەم بابەتە دەکەین:

لە لایەکی ترەوە ئەم یاسایە کۆمەڵێك خاڵ و بەند و بڕگەی نیگەتیڤی لە خۆی گرتبوو لەوانە :

١- ئاماژەی بەوە کردبوو نابێ فیدراڵییەت لە سەر بنەمای نەتەوەیی بێت، بە واتایەکی تر ئەو یاسایە دژی فیدراڵی نەتەوەیی بوو، بۆ هەرێمی کوردستان. [١٠٢]

٢- هەروەها جەخت کرابوو سەر ئەوەی سنووری هەر (١٨) پارێزگا لە قۆناغی ئینتیقالیدا وەك خۆی دەمێنێ[١٠٣] لێرەدا زۆر روون و ئاشکرا بوو مەبەستی ڕێگرتن و تەگەرەخستنە بەردەم ئاسایی کردنەوەی ڕەوشی کەرکوك و ناوچەکانی دیکەی کوردستان بووە.

٣- هەروەها ئەگەرچی ئەم یاسایە دانی نابوو بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بەڵام بەشێکی زۆر گرنگ و ستراتیژی خاکی لە دەرەوەی سنووری هەرێمی کوردستان بە جێ

(١٠٠) قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

(١٠١) بڕوانە: بەندەکانی (١، ٤، ٩، ٥٨)، قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

(١٠٢) بڕوانە: بەندی(١)، قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

(١٠٣) بڕوانە: بەندەکانی(٥٣)، قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

هێلرابوو (لە دوای ٢٠٠٣ پی دەوترێت (المنطقة المتنازع عليها) و دانی پیادانەنرا بوو وەك بەشێك لە خاکی کوردستان.[١٠٤]

٤- هەروەها ئەم یاسایە لە ئاست دیاریکردنی سنووری جوگرافی کوردستان و مافی چارەی خۆنووسینی کورد بێ دەنگ بوو و زۆربەی دەسەڵاتەکانیش درابوونە، حکوومەتی ناوەندی و کێشەی هێزی پێشمەرگەش بێ چارەسەر مابوو و هیچ ئاماژە یەکیشی پێ نەکرابوو.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین گرنگی ئەم یاسایە لەوەدا بوو کە جەختی کردبوو لە سەر ئەوەی کە دەبێ دەستووری هەمیشەیی عێراق لە سەر بنەمای تەوافق و دابڕێژرێت و رێگر بوو لە بەردەم هەژموونی زۆرینە، هەر بۆیەش لە بەندی (٦١)ی بڕگەی (ج)دا ئەو مافە بە هەرسێ پارێزگای هەڤسووی یەك دابوو کە ئەگەر هاتوو دەستووری هەمیشەیی دژی خواست و مافەکانیان بوو رەتی بکەنەوە، بێگومان ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە واتای ئەوە بوو کە نابێ هیچ تایفە یاخود نەتەوەیەك بە ناوی زۆرینە پێشیلی مافەکانی تایفە یاخود نەتەوەکانی دیکە بکاتەوە، یاخود بە ناوی زۆرینە خۆی بە سەریاندا بسەپێنێ.[١٠٥]

شایانی باسە یاسای کاتی و بەندی (٦١ بڕگە ج) هێز و لایەنە عەرەبەکان بە گشتی و شیعەکانی بە تایبەت هەراسان و تەنگە تاو کردبوو، لە بەر ئەوەی لەگەڵ مەرام و ئامانجەکەیان کە بریتی بوو لە باڵا دەستی هێزی زۆرینە نەدەگونجا و رێگر بوو لە بەردەم هەژموونی زۆرینە کە عەرەبە شیعەکانی عێراق کردبوویانە ستراتیژی سەرەکی خۆیان. هەر بۆیەش لە سەروبەندی راگەیاندنی یاسای کاتی رووبەرووی کاردانەوە و هەڵوێستی توند و و رەتکەرەوەی سەرکردایەتی سیاسی و ئایینی و لایەنە سیاسییەکانی عەرەبە شیعەکان بووەوە و رێورەسمی ئیمزاکردنی یاساکەیان دواخست [١٠٦]. لە لایەکی ترەوە دوای راگەیاندنی یاساکە

(١٠٤) بڕوانە، بەندی(٥٣ و٥٨)، قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

(١٠٥) دەقی بەندی (٦١)ی بڕگەی (ج) جەخت لە سەر ئەم خاڵە کردبوو و تێیدا هاتبوو: " راپرسییەکە بە سەرکەوتوو لە قەڵەم دەدرێ و رەشنووسی دەستوورەکە بە پەسەند کراو دادەنرێت ئەگەر زۆربەی دوو لە سەر سێ دەنگ دەرانی سێ پارێزگا یان زیاتر رەتیان نەکردەوە، قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية.

(١٠٦) فالح عبدالجبار، متضادات الدستور الدائم فى: بدورزكى احمد وأخرون، مأزق الدستور، الطبعة الاولى، الفرات للنشروالتوزيع، بغداد، ٢٠٠٦، ص٦٨.



شەپۆلێکی فراوانی خۆپیشان دان بە غدا و باشووری عێراقی گرتەوە و داوای هەڵوەشاندنەوەی بڕگەی (ج) بەندی (٦١)ی دەستووری کاتی یان دەکرد. [١٠٧]

لە لایەکی ترەوە و لە هەمان چوارچێوەدا پێش گواستنەوەی دەسەڵات و سەروەری بۆ عێراقییەکان، (علی سیستانی) گەورە مەرجەعی شیعە هەڵوێستی فەرمی خۆی سەبارەت بە یاسای کاتی ئاشکرای کرد و بە یاسایەکی نا شەرعی ناساند. لەو نامەیەی کە ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکانی کرد داوای لێ کرد کە دان نەنێت بەم یاسایە و لە نامەکەدا بۆ (UN) هاتبوو : " هەندێك لایەن هەوڵ ئەدەن لەو بڕیارەی سەبارەت بە گواستنەوەی دەسەڵات بۆ عێراقییەکان دەردەچێت ناوی یاسای کاتی بهێنرێت بە مەبەستی ڕەوایی (شەرعیەت) پێدانی، ئەم یاسایە لە لایەن ئەنجوومەنی ناهەڵبژێردراو دەرچووە و لە ژێر سایەی داگیرکاریدا، و بە کاریگەری راستەوخۆی داگیرکەران، ئەنجوومەنی نیشتیمانی کە بڕیار بوو لە دوای هەڵبژاردنەکان بێتەکایەوە دەسەڵاتی سنووردارکراوە بۆ داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی، ئەمەش ناکۆك و هاودژە لەگەڵ یاسا و ئیرادەی زۆرینەی گەلی عێراق و رەتی دەکەنەوە، لە بەر ئەمە هەر هەوڵ دانێك بە مەبەستی ڕەواییدان بەم یاسایە یان ناو هێنانی ئەنجامی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە."[١٠٨]

لەم روانگەیەوە دەردەکەوێ کە عەرەبە شیعەکان بەو پێیەی کە زۆرینە عەرەبی عێراقی پێك دەهێنن، دەیانویست بە هێزی زۆرینەی تایفی خۆیان بە سەر نەتەوە و پێکهاتەکانی دیکەی عێراقدا بسەپێنن، لە دوای دەرچوونی یاسای کاتی و گەڕانەوەی سەروەری بۆ عێراقییەکان لە ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ دا [١٠٩] و کۆتایی هاتن بە دەسەلاتی کاتی هاوپەیمانان و هەڵوەشانی ئەنجوومەنی حوکمسەرکردە سیاسی و ئایینییەکانی عەرەبی شیعە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان لە رێگای گەمەکردن بە کارتی زۆرینە جەختیان لە سەر چەند خاڵێکی گرنگ دەکرد، و کردوویانە بەرنامەی داهاتووی سیاسی خۆیان لەوانە[١١٠]:

(١٠٧) مصدر نفسه، ص ٦٥.

(١٠٨) الملف العراقي، مجلة شهرية سياسية و وثائقية يصدرها المعهد العراقي لتنمية و الديموقراطية، العدد (١٤٠)، أيار ٢٠٠٥، بغداد، ص ٣١.

(١٠٩) بول بريمر، مصدر سابق، ص ص٤٩١-٤٩٦.

(١١٠) عبدالحسين شعبان، دستور و نظام الحكم في : احمد يوسف احمد و آخرون، مصدر سابق، ص ٥٠٢.

پێداگرتن لە سەر ئەنجام دانی پرۆسەی هەڵبژاردن بە زووترین کات.

نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی لە لایەن خودی عێراقییەکانەوە، و لە ڕێگای نوێنەرانی گەلەوە.

هەروەها هەوڵ دان بۆ کۆتایی هێنان بە هێزی داگیرکاری.

پشتگوێ خستن و پەراوێزکردنی یاسای کاتی.

دیار بوو مەبەستی سەرەکی هێز و لایەنە عەرەبە شیعەکان لە ئەنجام دانی پرۆسەی هەڵبژاردن بریتی بووە لە پشت بەستن بە کارتی زۆرینە بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی کارا و بنەڕەتی بگرن لە پرۆسەی دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی بە شێوەیەك دەستووری هەمیشەیی و ئەو حکوومەتەی کە لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دێتە کایەوە ڕەنگدانەوەی هێزی زۆرینەی ئەوان بێت، و مەرام و خواستەکانیان دەستەبەر بکات.

بە ئاراستەیەکی پێچەوانەوە عەرەبە سوننەکان دژایەتی سەر لە بەری پرۆسەی سیاسی عێراقیان دەکرد، لە بەر ئەوەی دڵنیا بوون لەوەی هاوکێشە سیاسییەکانی دوای گۆڕانکارییەکانی (٩) نیسانی ٢٠٠٣ لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە و نەیان دەتوانی بارودۆخ و واقعی نوێ پەسەندی بکەن، لە بەرامبەر ئەم دوو حاڵەتەدا سەرکردایەتی سیاسی کورد هەوڵی سەرخستنی پرۆسەی سیاسی عێراقی دەدا بەڵام لە هەمانکاتدا ترس و نیگەرانییەتی گەورەی هەبوو لە هەمبەر هەژموونی زۆرینەی شیعە و ئەو هەوڵانەی کە بۆ لە کارخستنی یاسای کاتی دەدران.

لە هەلومەرجێکی وەها دژوار و پڕ ململانێ و ناکۆکی و نەبوونی بڕواو متمانە بە یەکتری لە ٣٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ [١١١] بۆ یەکەمین جار لە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا، هەڵبژاردنەکی گشتی و سەرتاسەری بەڕێوە چوو.

ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکە لە بەرژەوەندی لیستی ئیتلافی یەکگرتوو (لیستی شیعەکان) و لیستی هاوپەیمانی کوردستان شکایەوە (بڕوانە، خشتەی ژمارە(١٣))، و خاڵی زۆر گرنگ و وەرچەرخان لەم هەڵبژاردنەدا بریتی بووە لەوەی کە لیستی هاوبەندی عێراقی ناسراو بە لیستی شیعە نەیانتوانی بە تەنها حکوومەت پێك بهێنن و یەك لایەنە حکوومەت دروست بکەن، ئەمەش بووە خاڵی وەرچەرخان لە پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی سیاسی کورد و عەرەبە

(١١١) کۆمیسیۆنی باڵای سەربخۆی هەڵبژاردنەکان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.



شیعەکان بە ئاراستەی لێك نزیك بوون و سەرەتایی دروستبوونی هاوپەیمانی لە نێوان کورد و عەرەبی شیعەدا.

| ناوی لیست | کۆی دەنگ | ڕێژەی دەنگ | ژماری کورسی |
|---|---|---|---|
| لیستی هاوپەیمانیەتی یەکگرتووی عێراق | ٤٠٧٥٢٩٥ | ٪ ٤٨,١٨ | ١٤٠ |
| لیستی هاوپەیمانی کوردستان | ٢١٧٥٥٥١ | ٪ ٢٥ ,٧٢ | ٧٥ |
| لیستی(العراقیه) | ١١٦٨٩٤٣ | ٪١٣, ٨٣٪ | ٤٠ |
| لیستی العراقیون | ١٥٠٦٨٠ | ٪١ ,٧٨ | ٥ |
| لیستی بەرەی تورکمانی | ٩٣٤٨٠ | ٪١ ,١٠ | ٣ |
| کادرو هەڵبژاردە نیشتیمانییە بێلایەنەکان | ٦٩٩٣٨ | ٪٠ ,٨٢ | ٣ |
| یەکێتی گەل (حزبی شیوعی) | ٦٩٩٢٠ | ٪٠ ,٧١ | ٢ |
| کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان | ٦٠٥٩٢ | ٪٠ ,٥١ | ٢ |
| لیستی ڕێکخراوی کاری ئسلامی لە عێراق | ٤٣٢٠٥ | ٪٠ ,٤٣ | ٢ |
| هاوپەیمانێتی نیشتیمانی دیموکراتی | ٣٦٧٥٩ | ٪٠ ,٣٦ | ١ |
| کوتلەی(المصالحه والتحریر) | ٣٠٧٩٦ | | ١ |
| لیستی ڕافیدەینی نیشتیمانی مەسیحی | ٣٦٢٥٥ | | ١ |
| کۆی هەمووی | ٨٤٥٦٢٦٦ | ٪١٠٠ | ٢٧٥ |

**خشتەی ژمارە (١٣) ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی٣٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥.**[١١٢]

لە ١٣ ی نیسانی ٢٠٠٥دا ڕێککەوتننامەیەکی سیاسی لە نێوان هەر دوو لیستی هاوبەندی عێراقی و لیستی هاوپەیمانی کوردستان ئیمزا کرا، لەم ڕێککەوتننامەیەدا جەخت

(١١٢) بڕوانە: ماڵپەری کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان : www.ieciraq.org.

کرایه سەر پابەندبوون بە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، بە هەموو بەندەکانییەوە، هەروەها کارکردن بە هاوبەشی و لە سەر بنەمای تەوافق و لێك تێگەیشتن بۆ نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی بە پێی ئەو راسپاردانەی کە لە یاسای کاتی دا هاتوون.[١١٣]

لە دوای ئەم رێککەوتننامەیە لە ٢٨ ی نیسانی ٢٠٠٥دا حکوومەتی کاتی پێك هێنرا و لە ١٠ ی ئایاری ٢٠٠٥دا لیژنەی دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی دروست کرا [١١٤] و پاش گفتوگۆ و دانووستاندنی زۆر لە نێوان هێز و لایەنە سیاسییەکانی عێراق و کوردستان و سەرەڕای بوونی خاڵی جیاوازی و تێڕوانینی جۆراوجۆر لە سەر مەسەلە و بابەتە جیاوازەکان[١١٥] لە ٢٨ ی ئابی ٢٠٠٥ دا ؛ پرۆژەی دەستووری هەمیشەیی بە شێوەیەکی

(١١٣) بۆ بینینی دەقی رێککەوتننامەکە بروانە: الملف العراقی، العدد(١٤٠)، مصدر سابق، ٦-٨.

(١١٤) شایانی باسە لە سەرەتادا لیژنەی دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەی لە (٥٥) ئەندام پێك هاتبوو سەرۆکی لیژنەکە سەر بە لیستی هاوبەندی عێراقی بوو بە ناوی همام حمودی و جێگری لیژنەکەش سەر بە لیستی هاوپەیمانی کوردستان د. فواد معصوم بووە و لە لیژنەکەدا لیستی هاوبەندی عێراق بە (٢٨) ئەندام و لیستی هاوپەیمانی کوردستان بە (١٥) ئەندام و لیستی العراقیە بە سەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی بە (٨) ئەندام بەشداربوون و (٤) نوێنەریش بۆ هەر یەك لە تورکمانەکان و ئاشوورییەکان و کریستیانەکان و یەزیدییەکان تەرخانکرابوو، و لە دوایشدا (١٥) نوێنەری عەرەبە سوونەکان بوونە ئەندام لەم لیژنەیەدا. بڕوانە: فالح عبدالجبار، متضادات الدستور الدائم...، ص ص ٧١-٧٣.

(١١٥) خاڵە ناکۆکەکانی لە کاتی دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەی بریتی بوون لە مەسەلەی فیدراڵییەت و شێوازەکەی، ناسنامەی عێراق، مەسەلەی ئایین، مەسەلەی زمان، بابەتی مافی چارەی خۆنووسین، دۆزی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان، ناوی عێراق، مەسەلەی مەرجەعییەت، سنووری هەرێمی کوردستان، چۆنیەتی دابەشکردنی داهات و چۆنیەتی دابەش کردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی فیدراڵی و حکوومەتە هەرێمییەکان، بڕوانە: فالح عبدالجبار، التوافقیة والدین و الدولة و هویة العراق فی: بدور زکی احمد وأخرون مصدر سابق، ص ص٧٤-٨١؛ خەبات ژمارە (١٩٠٠)، ٢٠٠٥/٨/٢٩؛ هەفتەنامەی گوڵان، دیدارێکی تایبەت لە گەڵ سەعدی بەرزنجی، ژمارە (٥٤٦)، ٢٠٠٥/٧/٢١، ل ل ١٦-١٧،؛ هەفتەنامەی گوڵان، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ مونزول ئەلفەزل، ژمارە (٥٤٩)، ٢٠٠٥/٨/١١، ل ل ٧-٨.



فەرمی راگەیەندرا[١١٦] و لە ١٥ ی تشرینی یەکەم و لە ریفراندۆمێکی سەرتاسەری و گشتی دا بە رێژەی ٥٩ ,٧٨٪ دەستوورەکە پەسندکرا [١١٧] (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٤)، کە خاڵە گرنگەکانی بریتین لە:

لە بەندی (١)ی دەستووری هەمیشەییدا سیستەمی فەرمانڕەوایی لە عێراق بە سیستەمێکی کۆماری، دیموکراسی و فیدراڵی پێناسەی کردووە و لەم بەندەدا هاتووە " کۆماری عێراق دەوڵەتێکی سەربەخۆ و خاوەن سەروەرییە، سیستەمی فەرمانڕەوایی تێدا کۆماری، پەرلەمانی، دیموکراسی، فیدراڵییە ". [١١٨]

بێگومان ئەمە خاڵێکی گرنگ و چارەنووس سازە بە نسبەت گەلی کوردستان، دان پێدانان بە سیستەمی فیدراڵی و دیموکراسی وەك دوو چەمکی تەواوکەری یەکتر دەتوانرێ تا رادەیەکی زۆر کێشەی دەسەڵات و فرەنەتەوەیی چارە بکات، لە بەشی سێیەمی توێژینەوەکەماندا بە درێژیی باسی ئەم بابەتە دەکەین.

٢- بەندی سێیەم لە دەستووری هەمیشەیی عێراق تایبەتە بە ناسنامەی عێراق و جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە لە عێراقدا یەك نەتەوە و یەك گەل ناژیت، بەڵکو وەڵاتێکی فرەنەتەوەیە لەم بەندەدا هاتووە " عێراق وڵاتێکی فرە نەتەوە و فرە ئایین و ئایینزایە و بەشێکە لە جیهانی ئیسلامی و ئەندامێکی کارا و دامەزرێنەری کۆمکاری عەرەبییە و پابەندی بەڵێنامەکەیەتی "[١١٩] ئەم بەندە بە تایبەتی پاراگرافی یەکەم رەنگدانەوەی بارودۆخ و واقیعی راستەقینەی عێراقە، چونکە عێراق وڵاتێکی فرەنەتەوە و فرەئایین و ئایینزایە "[١٢٠]، لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێك دێت، کورد و عەرەب و لە دوو خاك پێك دێت، هەرێمی کوردستان و هەرێمی عەرەبی بۆیە ناسنامەی عێراق، ناسنامەیەکی کوردی عەرەبییە، "بێگومان ئەمەش لەگەڵ پەراگرافی کۆتایی بەندەکە ناگونجێت کە دەڵێت عێراق ئەندامی

(١١٦) د. شێرزاد احمد النجار، حول قضیة الهویة العربیة فی العراق و اشكالیة الهویة الوطنیة فی الواقع الجدید للعراق، في موقع الالكتروني:
http://www.aljazeera.net/NR/exteres/B7ASBOOC...

(١١٧) کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤.

(١١٨) دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(١١٩) دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(١٢٠) بڕوانە: د. شیرزاد احمد النجار، حول قضیة الهویة العربیة فی العراق...، سەرچاوەی پیشوو.

دامەزرێنەری کۆمکاری عەرەبییە و پابەندی بە بەڵێننامەکەیەتی، چونکە بەم رستەیە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ عێراق دەگەڕێنێتەوە باوەشی نیشتیمانی عەرەب، لەبەر ئەوەی لە بەندی (١) بەڵگەنامەی کۆمکاری عەرەبیدا جەختی کردۆتە سەر ئەوەی کە ئەم کۆمکارە لە دەوڵەتە عەرەبییە سەربەخۆکان پێك دێت".[١٢١]

٣ - لە بەندی (٤)ی دەستووری هەمیشەیی ئاماژە بە خاڵێکی تری گرنگ دەکات، کە ئەویش هاوبەشی و یەکسانییە لە رووی زمانەوە و زمانی کوردی و زمانی عەرەبی بە دوو زمانی فەرمی دەناسێنێ لە سەرتاسەری عێراقدا و چوارچێوەی بەکارهێنانی دیاری کردووە، لەم بەندەدا هاتووە " هەردوو زمانی عەرەبی و زمانی کوردی، هەر دوو زمانی فەرمین لە عێراقدا، مافی عێراقییەکانیش بەفێرکردنی رۆڵەکانیان بە زمانی دایك وەك تورکمانی و سریانی و ئەرمەنی لە دامەزراوە حکومییەکانی فێرکردن دا مسۆگەر دەکات بە پێی رێو شوێنەکانی پەروەردەیی یان بە هەر زمانێکی دیکە لە دامەزراوە تایبەتەکانی فێرکردندا.

هەروەهاچوارچێوەی زاراوەی زمانی فەرمی و چۆنیەتی پیادە کردنی حوکمەکانی بە پێی بڕگەی دووەم بەم شێوەی خوارەوە بوو:

أ-دەرچواندنی رۆژنامەی فەرمی بە هەردوو زمان.

ب - پەیڤین و گوتار دەربڕین لە بوارە فەرمییەکاندا وەك ئەنجوومەنی نوێنەران دادگاکان و کۆنگرە فەرمییەکان بە هەر یەك لەم دوو زمانە دەبێت.

ج - دانپێدانان بە دیکۆمێنتی فەرمی و نووسراوەکان بە هەردوو زمان و دەرچواندنی دیکۆمێنتە فەرمیەکان بە هەردووکیان.

د- کردنەوەی خوێندنگاکان بە هەردوو زمان بە پێی رێوشوێنە پەروەردەییەکان.

هـ- هەر بوارێکی دیکە کە سەرەتای یەکسانی پێویستی دەکات وەك دراوی کاغەز، پاسپۆرت، پول."[١٢٢]

بێگومان دانپێدانان بە زمانی کوردی هاوشانی زمانی عەرەبەی وەك دوو زمانی فەرمی و چەسپاندنی ئەم خاڵە لە دەستووری کاتیدا و دواتریش گواستنەوەی بۆ ناو دەستووری

(١٢١) هەمان سەرچاوە.

(١٢٢) دەستووری هەمیشەیی عێراق.



هەمیشەیی هەنگاوێکی پڕ بایەخە بووە بە ئاراستەی زیاتر بەرجەستەبوونی ناسنامەی نەتەوەی کورد لە عێراقدا.

٤- هەروەها لەم دەستوورەدا کۆمەڵێك دەسەڵاتی هاوبەش نێوان حکوومەتی فیدراڵی و هەرێمەکان دیاریکردووە کە بریتین لە بەڕێوەبردنی و رێکخستنی گومرگەکان و رێکخستنی سەرچاوە سەرەکییەکانی وزەی کارەبا و دابەشکردن و نەخشەکێشانی سیاسەتی ژینگە، نەخشەکێشانی سیاسەتی گەشەسەندن و پلاندانانی گشتی، نەخشەکێشانی سیاسەتی تەندروستی، نەخشەکێشانی سیاسەتی فێرکردن و پەروەردەی گشتی و نەخشەکێشانی سیاسەتی پەیوەست بە سەرچاوەکانی ئاوییە ناوخۆییەکان.[١٢٣]

٥-- لە بەشی پێنجەمی دەستووری هەمیشەیدا کە تەرخان کراوە بۆ دەسەڵاتی هەرێمە فیدراڵییەکان چەند خاڵێکی گرنگی لە خۆگرتووە سەبارەت بە ماف و داخوازییەکانی گەلی کوردستان لە بەندی (١١٧)ی بڕگەی یەکەمدا هەرێمی کوردستان بە هەرێمێکی یاسایی دەناسێنێ و داندەنێ بەم هەرێمە و دەسەڵاتەکانی وەك هەرێمێکی فیدراڵی تێدا هاتووە" ئەم دەستوورە لە کاتی جێبەجێکردنییەوە هەرێمی کوردستان بە دەسەڵاتەکانی ئێستاشەوە بە هەرێمێکی فیدراڵی دادەنرێت."[١٢٤]

بێگومان هەرێمی کوردستان لە دوای راپەڕینی خەڵکی کوردستان لە ساڵی ١٩٩١، تاکو لادانی رژێمی بەعس لە عێراق وەك دیفاکتۆیەك سەیر کراوە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا نەوەك هەرێمێکی فیدراڵی چ لە سەر ئاستی ناوخۆ یان دەرەوە، بۆیە دانپێدانان یەکەم جار لە دەستووری کاتیدا و دواتریش لە دەستووری هەمیشەیدا، ئەم کیانە دیفاکتۆیە رەوایی و شەرعیەتێکی یاسایی تەواوی ناخۆی و هەرێمی و نێودەوڵەتی وەرگرت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا کاریگەری زۆری هەبووە لە سەر بەرەوپێش چوونی دۆزی کورد بە ئاراستەی زیاتر ناساندنی لە سەر ئاستی ناوخۆیی عێراق و نێودەوڵەتیدا.

هەروەها ئەم دەستوورە مافی ئەوەی بە هەموو هەرێمەکانداوە کە دەستووری تایبەت بە خۆیان هەبێ، کە دەسەڵات و ئەرکەکانی و شێوازەکانی کار پێ کردنیان دیاری بکات بە

(١٢٣) بڕوانە: بەندی (١١٤)، دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(١٢٤) بڕوانە: دەستووری هەمیشەیی عێراق.

جۆرێك ناکۆك و هاودژ نەبێت لەگەڵ دەستووری هەمیشەییدا، [١٢٥] هەر بە پشت بەستن بەم خاڵەوە، هەرێمی کوردستان پرۆژەیەکی دەستووری ئاماژەی کردووە بۆ هەرێمی کوردستان.

لە لایەکی ترەوە ئەو مافەی بە هەرێمەکانداوە کە یاسای دەوڵەتی فیدراڵی هەموار بکات لە کاتی پراکتیزەکردنی لە هەرێمەکاندا ئەگەر هاتوو ناکۆك بوون لەگەڵ یاساکانی هەرێم سەبارەت بەم پرسانەی کە ناچێتە ناو تایبەتمەندی دیاری کراوەکانی دەوڵەتی فیدراڵییەوە. هەروەها لە بەندی (١٢٠)ی بڕگەی (٤)دا ئاماژە بەوە دەکات کە " حکوومەتەکانی هەرێم لە باڵوێزخانە و نێردە دیپلۆماسییەکاندا نووسینگە بۆ هەرێمەکان و پارێزگاکان دەگرێتەوە و دادەمەزرێت بۆ بەدواداچوونی کاروباری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بوژانەوەی ناوچەیی" لە هەمان بەند و بڕگەی (٥) دا ئاماژە دەکات بەوەی حکوومەتی هەرێم تایبەتمەندە بە هەموو پێداویستییەکانی بەڕێوەبردنی هەرێم بە تایبەتیش دروستکردن و ڕێکخستنی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیی هەرێم وەك پۆلیس و ئاسایش و پاسەوانی هەرێم.[١٢٦]

بێگومان ئەمە سەبارەت بە گەلی کوردستان مەسەلەیەکی زۆر گرنگ و چارەنووسازە، بە یاسایی بوونی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە لە دەستوورەکەدا بە ناوی پاسەوانەکانی هەرێم هاتووە، خۆی لە خۆیدا، دانپێیانانە بە خەباتی هێزی پێشمەرگە بە درێژایی سەدەیەك دژی حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکان، لە لایەکی ترەوە گرنتییەکە بۆ بەرگیری کردن و پاراستنی هەرێمی کوردستان لە هەر دەستێوەردانێکی ناوخۆیی یاخود دەرەکی، هەر بە پشت بەستن بەم بەندە یە دۆسیەی ئاسایش لە هەرێمی کوردستان درایە دەستی پێشمەرگەی کوردستان.

لە لایەکی ترەوە بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوك و ناوچە تازە رزگارکراوەکان کە دوو چاری سیاسەتی تەعریب و پاکتاوی رەگەزی هاتوونە، بەندێکی تایبەتی بۆ تەرخان کردووە کە بریتییە لە بەندی (١٤٠) کە بە شێوەیەکی روونتر و بە میکانیزمێکی دیاری کراوتر لە بەندی (٥٨)ی یاسای کاتی، جەختی لە سەر یەکلاکردنەوەی ئەم کێشەیە دەکات.[١٢٧] لە بەشی سێیەمدا باسی ئەم بابەتە دەکەین.

بە شێوەیەکی گشتی، زۆربەی بەندەکانی ئەم دەستووورە رەنگدانەوەی بارودۆخی راستەقینەی عێراقە و تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ راستییە مێژووی جوگرافییەکانی عێراق دەگونجێ، لە رووی بنەما

---

(١٢٥) بڕوانە: بەندی (١٢٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(١٢٦) بڕوانە: بەندی (١٢٠) بڕگەی(٤)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(١٢٧) بروانە: بڕوانە: بەندی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەی عێراق.



و پڕەنسیپی دیموکراسییەوە جەختی کردووە سەر ئاڵوگۆڕی ئاشتییانەی دەسەڵات و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی مافەکانی ئافرەت و دژایەتی کردنی تیرۆر، هەروەها دابەشکردنی دەسەڵات و ڕێگرتن لە سەرهەڵدانی سیستەمی تاکە حیزبی و دابەشکردنی سامان و داهاتەکانی عێراق بە شێوەیەکی یەکسان بە سەر گشت پێکهاتەکانی عێراقدا.

بەڵام لەگەڵ هەمووی ئەمانەشدا، لە جێگای ئەوەی ئەم دەستووورە ببێتە چەترێك بۆ کۆکردنەوەی لایەنە ناکۆکەکانی عێراق و قوڵکردنەوەی پرۆسەی بە دیموکراسی کردنی ئەم وڵاتە ئەوا تەواو بە پێچەوانەوە بۆتە فاکتەری توندبوونی ململانێ و ناکۆکی لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراقدا.

عەرەبە سوونەکان چ لە کاتی داڕشتنەوەی دەستوور و چ لە کاتی پەسەندکردنی بە پاڵپشتی دەوڵەتانی هەرێمی و عەرەبی هەوڵیاندا لە ڕێگەی چەند مانۆڕێکی سیاسی و دیپلۆماسییەوە خۆیان لە هەر پابەند بوونێك بەو بەند و مادانەی دەستوور بدزنەوە کە لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە، بۆ ئەم مەبەستەش لە لایەك تەنها رۆژێك پێش پرۆسەی ریفراندۆم لە سەر دەستوور، بەندێکیان خستە ناو دەستوور کە ئەوەیش بەندی (١٤٢) بووە لە پێناوی هەمواركردنی دەستوور.[١٢٨] لە لایەکی تریشەوە لە رۆژی ریفراندۆمدا کەوتنە رەتکردنەوەی دەستوور و دژی دەنگیاندا، بەڵام بە هۆی ئەوەی نەیانتوانی لە ڕێگەی ریفراندۆمەوە شکست بە دەستووری هەمیشەیی بهێنن، ئەوا تەواوی سەنگ و قورسایی خۆیان خستە سەر مادەی (١٤٢) بۆ گۆران و لابردنی زۆربەی بەندەکانی دەستوور نەك پێداچوونە و هەمواركردنی، ماف و داخوازییەکانی گەلی کوردستان بوونە ئامانج و سەنتەری ئەم گۆرانە[١٢٩]، لە١١ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦ توانیان لیژنەیەك بۆ پێداچوونەوەی

---

(١٢٨) بڕوانە: د. ئازاد عوسمان، مادەی ١٤٢ و توانا هەڵکەوتییەکان بۆ هەمواركردنی دەستووری هەمیشەیی، رۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٢٧٧)، ٢٠٠٦/١٩/٢٥.

(١٢٩) لە دە رۆژی کۆتاییەکانی مانگی ئایاری٢٠٠٧ لیستی تەوافقی عێراق کە بە لیستی سوونەکان ناسراوە لەگەڵ لیستی (العراقیە) بە سەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی، سووربوونی خۆیان لە سەر دەستکاری کردنی دەستوور راگەیاند و ماف و دواخوازییەکانی گەلی کوردستان بوونە ئامانج و سەنتەری ئەم گۆڕانە، لەوانەش جەختکردن لە سەر دواخستنی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) تایبەت بە کەرکوك و پێداچوونەوەی شوناسی عێراق بە شێوەیەك عێراق بە خاك و نەتەوە بە بەشێك لە نەتەوە و نیشتیمانی عەرەب لە قەڵەم بدرێ، هەروەها کەمکردنەوە لە دەسەڵاتی هەرێمەکان و کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکانی لە ناوەند، پێداچوونەوە بە شێوازی و جۆری فیدراڵییەت بڕوانە: رۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٥٠٥)، ٢٠٠٧/٥/٢٥.

دەستوور پێك بهێنن [١٣٠] هەروەها بە پاڵپشتی دەوڵەتانی عەرەبی و هەرێمی وەك (سوریا، عەرەبستان سعودی و ترکیا) کاریگەری گەورەیان کردبووەو سەر راپۆرتی (بیکەر- هاملتۆن) بە شێوەیەك خودی ئەم راپۆرتە دوای پێداچوونەوە و دەستکاری کردنی دەستووری کرد بێ لەبەر چاوگرتنی ئەم میکانیزمەی بۆ دیاری کردووە.[١٣١]

بە شیوەیەکی گشتی دەکرێت بڵێین دەستووری هەمیشەی هەنگاوێکی گرنگ و گەورە بوو بە ئاراستەی سەلماندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد، تا رادەیەکی زۆر هەرێمی کوردستان رەوای خۆی وەرگرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم دەستوورە نەیتوانییە چارەسەرێکی کۆتایی و بنەبرانە بۆ چارەسەری دۆزی کورد بدۆزێتەوە، ئەم دەستوورە دانی نەناوە ە مافی چارەی خۆ نووسین بۆ کورد هەر وەها بێ دەنگە لە دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان و تەنانەت زۆربەی بەندەکانی ئەم دەستوورە لە چوارچێوەی تیۆریدا ماونەتەوە.

---

(١٣٠) جەوهەر نامق سالم، لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق و مافەکانی خەڵکی کوردستان، بەشی یەکەم، ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٣١٦)، ٦/١١/٢٠٠٦.

(١٣١) لە دوای ئالۆزبوونی بارودۆخی عێراق بە تایبەت لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ شەرێکی تایفی توند لە نێوان عەرەبی شیعە و سوونەدا بەرپابو بارو دوخی عیراق بەرەو ئالۆزیەکی زۆری چوو سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ رزگارکردنی عێراق لەو قەیرانە و گرتنە بەری ستراتژییەکی نوێ، لە ناوەڕاستی مانگی ئاداری ٢٠٠٦ لیژنەیەکی تایبەت بەسەرۆکایەتی (جیمس بیکر) لە پارتی کۆماری و (لی هاملتون) لە پارتی دیمکراتی پێك هێنا، لە ٦ ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦ دا راسپادەکانی خویان پێشکەش کرد سەبارەت دۆزینەوەی رێگە چارەیەك بو کێشە کانی عێراق، لە خاڵی(٢٦)دا داوای پیداچوونە وەی دەستووری هەمیشەیی یان دەکرد بی لەبەرچاڤ گرتنی ئەو میکانیزمەی کە لە دەسووردا هاتووە و لەم خاڵەدا هاتبوو "پێداچوونەوەی دەستوور کارێکی زۆر پێویستە بو ئاشت بوونەوەی نیشتیمانی و پێویستە زۆر بە پەلە پێداچوونەوەی تێدا بکریت, نەتەوە یەکگرتوەکان لەم کارەدا ئەزموونیان هەیە و پێویستە لەم رووەوە رۆڵ بگێریت" بروانە راسپاردەکانی ئەم راپورتە:

تقرير بيكر هاملتون بين الواقعية ودعم العراق:

www.alsabaah.com/paper.php/ 200712/13

تقديم تقرير بيكر هاملتون:

www.alarabiya.net/programs/2006/12/11

واجة تقريربيكر هاملتون (مجموعة دراسة العراق) الرفض الشديد:

www.elaph.com/elaphweb/elaphwriter/2006/12/12



| پارێزگا | بەڵێ: کۆی دەنگدەران بە (بەڵێ) | بەڵێ: ڕێژەی دەنگدەران بە (بەڵێ)٪ | نە: کۆی دەنگدەران بە(نەخێر) | نە: ڕێژەی دەنگدەران بە(نەخێر)٪ | کۆی دەنگدەران لە پارێزگا |
|---|---|---|---|---|---|
| بەغدا | ١٦٤٧٧٦٣ | ٧٧, ٧ | ٤٧٢٨٥٣ | ٢٢, ٣ | ٢١٢٠٦١٥ |
| سلێمانی | ٧١٦٢١٠ | ٩٨, ٩٦ | ٧٥١٣ | ١ , ٠٤ | ٧٢٣٧٢٣ |
| اربيل | ٨٢٥٢٥١ | ٩٩, ٣٦ | ٥٣١٩ | ٠ , ٦٤ | ٨٣٠٥٧٠ |
| کرکوك | ٣٤١٤٢٦ | ٦٢ ،٩١ | ٢٠١٢٦٢ | ٣٧, ٠٩ | ٥٤٢٦٨٨ |
| دهۆك | ٣٨٥٨٠٨ | ٩٩, ١٣ | ٣٣٩٠ | ٠ , ٨٧ | ٣٨٩١٩٨ |
| نەینەوا | ٣٢٢٨٦٩ | ٤٤, ٩٢ | ٣٩٥٨٨٩ | ٥٥ , ٠٨ | ٧١٨٧٥٨ |
| ئەنبار | ٧٩٠٨ | ٣, ٠٤ | ٢٥٢٠١١ | ٩٦, ٩٦ | ٢٩٥٩١٩ |
| سەڵاحەدین | ٩٣٠٨٦ | ١٨, ٢٥ | ٤١٧٠٦٦ | ٨١ , ٧٥ | ٥١٠١٥٢ |
| دیالی | ٢٤٤٥٣٧ | ٥١, ٢٧ | ٢٣٢٤٤٣ | ٤٨ , ٧٣ | ٤٧٦٩٨٠ |
| نەجەف | ٢٨٦٨٩٨ | ٩٥, ٨٢ | ١٢٥٢٢ | ٤ , ١٨ | ٢٩٩٣٢٠ |
| کربلا | ٢٥٥٦١١ | ٩٦, ٥٨ | ٩٠٦٣ | ٣ , ٤٢ | ٢٦٤٦٧٤ |
| واسط | ٢٦٨٠٨١ | ٩٥, ٧٠ | ١٢٠٤٧ | ٤ , ٣٠ | ٢٨٠١٢٨ |
| ذي قار | ٤٥٠٥٠٩ | ٩٧, ١٥ | ١٣٢٠١ | ٢, ٨٥ | ٤٦٣٧١٠ |
| قادسية | ٢٨٧٤٧٨ | ٩٦ , ٧٤ | ٩٦٩٨ | ٣, ٢٦ | ٢٩٧١٧٦ |
| بەسرا | ٦٦٣٥٠٠ | ٩٦ , ٠٢ | ٢٧٥٢٤ | ٣ , ٩٨ | ٦٩١٠٢٤ |
| بابل | ٥١٤٢٠٧ | ٩٤ , ٥٦ | ٢٩٥٧٢ | ٥, ٤٤ | ٥٤٣٧٧٩ |
| ميسان | ٢٤٨٤٥٢ | ٩٧, ٧٩ | ٥٦١٥ | ٢, ٢١ | ٢٥٤٠٦٧ |
| المثنى | ١٨٣٢٠٢ | ٩٨, ٦٥ | ٢٥٠٨ | ١, ٣٥ | ١٨٥٧١٠ |
| کۆ | ٧٧٤٢٧٩٦ | ٪٧٨, ٥٩ | ٢١٠٩٤٩٥ | ٪٢١, ٤١ | ٩٨٥٢٢٩١ |

**خشتەی ژمارە (١٤) ئەنجامی ریفراندۆمی دەستوور لە١٥ /١٠/٢٠٠٥** [١٣٢]

---

(١٣٢) کۆمیسیۆنی باڵای سەربخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراق، راپورتێك بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران، سێ پرۆسەی هەڵبژاردنی مێژوویی لە ساڵێك کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراق، ل، ٥٠-٥١

# بەشی سێیەم

# فاکتەر و میکانیزمەکانی کاریگەر بۆ چارەسەری دۆزی کورد لە عێراقدا

## باسی یەکەم
## دانپێدانان بە مافی چارەی خۆ نووسین

کاتێك باس دێتە سەر مەسەلە و پرسی نەتەوەکان بە نەتەوەی کوردیشەوە، پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەر، و شێواز و ڕێگەکانی چارەسەرکردنی، ئەوا لە مێژوودا چارەسەری جۆراوجۆر خراونەتەڕوو، کە دیارترین و بەرجەستەترینیان دانپێدانانە بە مافی نەتەوە و گەلان، و ڕێگا کردنەوەیە لە بەردەمیاندا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئازادانە و دڵخوازانە، لە گور حەز و ویست و بەرژەوەندییەکانی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدات، و ستاتوی سیاسی خۆی لە سەر ئاستی ناوخۆی وڵات و دەرەوە دیاری بکات.

پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین ئەگەرچی لە ڕوانگە و دیدگای جیاوازەوە، لێکدانەوە و شیکردنەوەی بۆ دەکرێت، و توێژەرانی بواری سیاسی و یاسایی لە سەر ناوەڕۆك و ڕەهەند و مەرج و پێوەرەکانی ئەم پرەنسیپە تێڕوانین و بۆچوونی جۆراوجۆریان هەیە، بەڵام تا رادەیەك هاودەنگی و لێك چوونێك هەیە بەوەی ئەم پرەنسیپە بە واتای ئازادی و دەرفەت رەخساندن دێت، بۆ ئەوەی گەلان بە باشترین شێوە و میکانیزم و ستراتیژی پێگەی سیاسی خۆیان دیاری بکەن.

زانا و یاساناسی نەرویجی (ئاید) پێیوایە مافی چارەی خۆنووسین بریتییە لەوەی: " هەموو گەل و نەتەوەیەك بە بێ هەڕەشە و دەستتێوەردانی دەرەکی و بە شێوەیەکی ئازادانە ستاتۆی سیاسی خۆی دیاری بکات و دەوڵەتانیش لە سەریانە بە گوێرەی یاسای نێودەوڵەتی و بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێز لەم مافە بگرن". [1]

هەر لەم ڕوانگەیەوە یاساناسی رووسی (کۆڤالێت) سەبارەت بە ئەم پرەنسیپە دەڵێت: " بە گوێرەی مافی چارەی خۆنووسین، هەر نەتەوەیەك خۆی بڕیار لە سەر چارەنووسی خۆی ئەدات، چ بە لکاندن یان جیابوونەوە بێت، و لە ڕوانگەی یاسای تازەی نێودەوڵەتی مافی چارەی خۆنووسینی گەلان دەبێت دور بن لە هەموو جۆرە لکاندنێکی نەخوازراو یاخود بە کار

(١) وەرگێڕاوە لە د. مارف عومەر گول، کێشەی کەسایەتی نێو نەتەوەیی گەلی کورد، چاپی دووەم، لە بڵاو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٣٤.



هێنانی هێز بە مەبەستی هێشتنەوەی گەلان لە چوارچێوەی وڵاتێکی بیانی دا، یەکێتی خاکی هەر وڵاتیك دەبێ پشت بە ئازادی نەتەوە و گەلانی چوارچێوەی ئەو وڵاتە ببەستێ ". [2]

بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بڵێین پرەنسیپی مافی چارەی خۆونووسین بەواتای دەرفەت رەخساندنە بۆ گەل و نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی پێگە و بارودۆخ و ستاتۆی سیاسی، دەستووری خۆیان بە شێوەیەك خزمەت بە بەرژەوەندی نەتەوەییان بکات و بتوانن بە شێوەیەکی ئازادانە گەشە بە بواری ئابووری، کۆمەڵایەتی و کلتووری خۆیان بدەن.

شایانی باسە ئەم پرەنسیپە بە شێوەیەکی توند پەیوەستە بە پرەنسیپی نەتەوەکانەوە، و بەشێکی زۆر لە سەرچاوەکان بنەماکەی دەگەڕێنەوە بۆ دەسپێکی شۆڕشی فەرەنسا کە بۆ یەکەمین جار ئاماژەی بەم پرەنسیپە کرد. [3] لەمیانەی شەڕی یەکەمی جیهانی دەستەواژەی مافی چارەی خۆنووسین زیاتر بە کارهات. لەم ڕووەوە (لینین) سەرکردەی شۆڕشی بەلشەفی لە رووسیا لە ساڵی ١٩١٧ [4] و (ولسن) سەرۆکی ئەمەریکا بە راگەیاندنی چواردە پرەنسیپە بە ناوبانگەکەی رۆڵیکی گرنگ و کاریگەریان بینی لە پێشخستن و جێگیرکردنی بیرۆکەی مافی

(٢) وەرگێڕاوە لە: کارزان عزت حسن، الأساس القانوني الدولي لحق الشعب الكوردي في تقرير المصير، رسالة ماجستيَر غير منشورة، جامعة السليمانية، كلية القانون، ٢٠٠٧،ص١٠٧.

(٣) د. السيد مصطفى احمد،المبادي العامة في القانون الدولي المعاصر، الطبعة الاولى، ايتراك للنشروالتوزيع، القاهرة، ٢٠٠٦، ص ٣٥٣.

(٤) سەرکردەی شۆڕشی بەلشەڤی لینین ١٩١٧، رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە پێش خستن و جێگیرکردنی بیرۆکەی مافی چارەی خۆنووسین. و لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبری ١٩١٧ پرەنسیپی مافی چارەی خۆ نووسین لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەکیدا رەنگیداوەتەوە و لە سەر ئاستی ناوخۆیی لە راگەیەندراوێکدا لە ٢تشرینی دووەمی١٩١٧ ئاماژەی بە کۆمەڵێك پرەنسیپ کرد، کە گەلانی ڕووسیا مافیان هەیە پڕاکتیزی بکەن و بریتی بوون لە :

١. مافی گەلانی روسیا لە دیاریکردنی چارەنووسیاندا تا دەگاتە رادەی جیابوونەوە پێك هێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.
٢. یەکسانی و سەروەری بۆ هەموو گەلانی رووسیا.
٣. ڕێگەدان بە پێش کەوتنی ئازادانەی کەمینە نەتەوەکان لە چوارچێوەی خاکی ڕووسیا دا، بڕوانە: عبدالمجید اسماعیل حقی، الوضع القانونی لاقلیم عربستان فی ظل القواعد الدولیة، ١٩٧٤، القاهرة، ص٣١٦.

چارەی خۆنووسین [٥]؛ بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم گۆڕانکارییانەدا، پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی ڕۆخسارێکی یاسایی وەرنەگرت، بەڵکو لە چوارچێوەیەکی سیاسیدا مایەوە.

کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی بە قۆناغی بە یاسایی کردنی ئەم پرەنسیپە دادەنرێت.[٦] کە ئیتر لەو ساتەوە ئەم پرسە بووە تەوەرێکی گرنگ لە سیستەمی یاسایی نێودەوڵەتیدا، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان زۆر بە ڕاشکاوی لە ناو بەڵگەنامەی خۆیدا دەقنووس کردووە و دانییپێدا ناوە و پراکتیزەکردنی ئەم مافە یاخود ئەم پرەنسیپە بە فاکتەری ئاشتی و تەبایی و سەقامگیری لە جیهان دایە قەڵەم. لە برگەی (٢)ی بەندی (١)ی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا کە تایبەتە بە ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە تیادا هاتووە: "گەشە پێدانی پەیوەندی دۆستانەی نێوان نەتەوەکاندا، دەبێت لە سەر بناغەی ڕێزگرتن لەو پرنسیپانە بێت کە دوای یەکسانی تەواو لە نێوان گەلاندا دەکات بەوەی کە هەر یەکەیان مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان دەبێت".[٧] هەروەها بەندی (٥٥)ی کە تایبەتە بە بنەماکانی هاوکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی سەبارەت ئەم پرەنسیپە، ئاماژە بەوە دەکات کە: "خواستێکە لە ئامادەکردنی سەقامگیری و خۆشگوزەرانی کە پێویستن بۆ بەرپا کردن و دروستکردنی پەیوەندی دروست و تەبا لە نێوان نەتەوەکاندا، لە سەر بنەمای ڕێزگرتن لەو پرەنسیپە ی کە داوای یەکسانی دەکات لە نێوان گەلاندا، بە وەی هەر یەکیان مافی بڕیار دانی لە سەر چارەنووسی خۆی هەبێت ".[٨]

(٥) بۆ بینینی دەقی ئەم چوارده پرەنسیپە بڕوانە، ابراهیم علی کرو، مبدأحق تقریر مصیر الشعوب والاستفتاء علیه، کوردستان العراق نموذجا، رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة العلوم السیاسیة، جامعة صلاح الدین، اربیل، ٢٠٠٦، ص ٣٤.

(٦) عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، الاعلان عن الدولة، دراسة تحلیلیة في قانونین الدولي العام و الدستوري، اطروحة دكتورا غیر منشورة، في جامعة صلاح الدین، اربیل، ٢٠٠٧، ص ٢٠١.

بڕوانە: بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە سایتی ئەلکترۆنی خوارەوە:

(7).http://www.un.org/arabic/aboutun/charter/chapter9.htm.

بڕوانە: بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە سایتی ئەلکترۆنی خوارەوە:

(8) http://www.un.org/arabic/aboutun/charter/chapter9.htm.



لەم ڕوانگەیەوە دەردەکەوێ کە نەتەوە یەکگرتووەکان پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی کردۆتە بناغەی بەدیهێنانی هاوکاری و تەبایی لە نێوان دەوڵەتەکاندا و پێویستە پێوەی پابەند بن، تەنانەت خودی دیباجەیی ئەم ڕێکخراوەش هەر بە ناوی گەلانەوە دەستی پێکردووە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە گەلان لە ڕووی مافەوە یەکسانن [٩] ئەمەش؛ واتە گەلانی چەوساوە لە ڕووی نەتەوەییە وە وەك هەموو گەلان مافی چارەی خۆنووسینیان هەیە.

هەر لەم چوارچێوەیەدا و بە مەبەستی زیاتر چەسپاندنی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین و جێگیرکردن لە یاسای نێودەوڵەتی و چڕکردنەوەی هەوڵەکان لە پێناوی بەدی هێنانی وەك هەڤی و یەکسانی لە نێوان هەموو گەلان دا، کۆمەڵێك دیکیۆمێنت و بەڵگەنامە و ڕاگەیەندراوی جیهانی و هەرێمی دەرچوون، کە هەر هەموویان جەخت دەکەنە سەر پێویستی ڕێز گرتنی ئیرادەی گەلان و خولْقاندن و دروستکردنی کەش و هەوایەکی لەبار بۆیان بۆ ئەوەی ئازادانە بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، لێرەدا ئاماژە بە هەندێك لەم دیکیۆمێنتانە دەکەین:

**١- هەر دوو پەیمانی جیهانی دەربارەی مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی کلتوورییەکان و پەیمانی جیهانی سەبارەت بە مافی مەدەنی و سیاسی لە نیسانی ١٩٦٦، لە بەندی یەکەمی هەر دوو پەیمانەکە دا هاتووە [١٠]:**

أ-:" هەموو گەلێك مافی بڕیاردانی چارەنووسیان هەیە، بە پشت بەستن بەم مافە بە شێوەیەکی ئازادانە قەوارەی سیاسی خۆی دیاری دەکات و شێوەیەکی ئازادانە بەردەوام بێت لە سەر گەشەپێدانی بواری ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی خۆیان.

ب – هەموو گەلان بۆیان هەیە بە شێوەیەکی ئازادانە هەڵسوکەوت بە سامان و داهاتی سروشتیان بکەن، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بە بێ پێشێل کردنی ئەو ئەرکانەی (التزامات) کە بە هۆی هاوکاری ئابووری نێودەوڵەتی لە سەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش و یاسای نێو

(٩) وەرگیراوەلە : د. محمد یوسف علوان ود. محمد خلیل الموسی، القانون الدولي لحقوق الإنسان، الجزء الأول، الطبعة الاولی، دار الثقافة للنشر والتوزیع، عمان، ٢٠٠٥، ص٤٩.

(١٠) د. الشافعي محمد بشیر، قانون حقوق الإنسان، مصادره تطبیقاته الوطنیة والدولیة، الطبعة الرابعة، منشاة المعارف بالاسکندریة، ٢٠٠٧، ص٣٧٠ +(٣٤٤-٣٤٥)؛ عبدالرحمن سلێمان الزیباری، مصدر سابق، ص ص ٣٢٩-٣٤٠

دەوڵەتی دەكەوێتە سەر شانی و نابێت بە هێچ شێوەیەك لە شێوەكان لە بژێوی تایبەت بێ بەش بكرێت.

ج – پێویستە هەموو دەوڵەتانەی كە لەم رێككەوتن نامەیەدا ئەندامن بە وانەشەوە كە بەرپرسن لە بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانەی كە لە ژێر چاودێری دان و خۆیان حوكمی خۆیان ناكەن، رێگە بدەن لە پێناوی بەدیهێنانی مافی چارەنووس بۆ گەلان و رێز لەم مافە بگرن. بە پێی دەقەكانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەكگرتووەكان.

### ٢- بەیاننامەی پرەنسیپە كانی یاسای نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٧٠ :

جاڕنامەی پرەنسیپە كانی یاسای نێودەوڵەتی، یەكسانی و وەكهەڤی بە دیاریكردنی چارەنووس بۆ هەموو گەلان كردۆتە بناغە و بنەمای پەیوەندی لە نێوان گەلاندا، تێیدا هاتووە:

أ - " هەموو گەلێك بە بێ هیچ جۆرە دەستێوەردانێكی دەرەكی مافی بە ئازادی هەڵبژاردنی ستاتو و پێگەی سیاسی خۆی هەیە و دەبێ بە شێوەیەكی ئازادانە پەرە بە پێشكەوتنی ئابووری و كۆمەڵایەتی و كلتووری خۆیان بدەن.

ب – هەموو گەلان مافی بە ئازادی دیاریكردنی شێوەی چارەنووسیان هەیە، بە دروست كردنی دەوڵەتێكی خاوەن سەروەری و سەربەخۆیی و یاخود چوونە پاڵ دەوڵەتێكی دیكەی خاوەن سەروەری یاخود یەكگرتن لەگەڵیدا و یاخود دەستەبەركردنی هەر ستاتویەكی دیكە.

ج – هەموو گەلان لە بەجێگەیاندنی دیاریكردنی چارەنووسدا، مافی پشتگیری لێ كردنیان هەیە، بە گوێرەی مەبەست و پرەنسیپە كانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەكگرتووەكان، لە دژی هەر نارەوایەك یاخود گوشارێك كە مافی دیاریكردنی چارەنووس و ئازادی و سەربەخۆیان لێ زەوت بكات.

د- هەموو گەلان مافی ڕزگاربوونیان هەیە لە ژێر دەستی بێگانە". [١١]

هەر لە بەرامبەر ئەم مافانەی كە گەلان هەیانە بەڵگەنامەكە كۆمەڵێك ئەرك دەخاتە سەر شانی دەوڵەتان كە بریتین لە :

أ–" وڵاتان لە سەریانە چ بە تەنیا و سەربەخۆ یان بە یەكەوە كار بكەن بۆ بە جێ گەیاندنی پرەنسیپی یەكسانی و دیاریكردنی چارەنووسی گەلان بە گوێرەی بەڵگەنامەی (UN).

(١١) د. مارف عومەر گوڵ، كێشەی كەسایەتی یاسایی...، ل ٤٤.



ب – پێویستە دەوڵەتان خۆیان بە دوور بگرن لە هەموو جۆرە گوشار یاخود زۆردارییەك كە ببێتە هۆی بێ بەش كردنی گەلان لە مافی دیاریكردنی چارەنووس و ئازادی و سەربەخۆیی.

ج – پێویستە دەوڵەتان خۆیان دوور بگرن لە ئەنجام دانی هەر كارێك كە ببێتە هۆی دابەشبوونی بەشێك یان سەرجەمی یەكێتی خاكی وڵاتان یان، یەكێتی سیاسی وڵاتێكی سەربەخۆ و خاوەن سەروەری، لەگەڵ رەچاوكردنی پرەنسیپی یەكسانی و دیاریكردنی چارەنووسی گەلان". [١٢]

### ٣- بەڵگەنامەی هلسنكی ١٩٧٥ :

ڕاگەیەنراوی هلسنگی كە لە لایەن كۆمەڵی دەوڵەتە دیار و زلهێزی ئەوروپییەوە دەرچووە لە رووی سیاسییەوە گرنگی و تایبەتی خۆی هەیە، لە بەندی ٨ی ڕاگەیەنراوەكەدا، دووبارە جەخت دەكاتە سەر مافی چارەی خۆنووسین بۆ هەموو گەلان و تێیدا هاتووە " هەموو گەلێك مافێكی هەمیشەیی و نەگۆڕی هەیە ئەویش ئەوەیە بە شێوەیەكی ئازاد و دڵخوازانە بارودۆخ و ستاتوی سیاسی خۆی بە بێ گوشار و دەستتێوەردانی دەرەكی دیاری بكات و بەردەوام بێ بەو جۆرەی كە خۆی دەیەوێ لە گەشەپێدانی بواری رامیاری و ئابووری و رۆشنبیری خۆی ".[١٣]

### ٤- ڕاگەیەنراوی جیهانی بۆ مافی مرۆڤ كە بە ڕاگەیەنراوی جەزائیر ناسراوە لە تەمووزی ١٩٧٦:

ئەم جار نامەیەش جەخت لە سەر مافی چارەنووسی بۆ هەموو گەلان دەكات، وەك مافێكی بنەڕەتی و هەمیشەیی دەناسێنێ و داوا دەكات كە رێگە بدرێت بەوەی گەلان بە شێوەیەكی ئازاد و دیموكراسییانە بارودۆخ و پێگەی سیاسی خۆیان دوور لە هەر جۆرە هەڕەشە و دەستێوەردانێكی دەرەكییەوە دیاری بكەن.[١٤]

(١٢) هەمان سەرچاو، ل ل ٤٤ – ٤٥.

(١٣) عبدالرحمن سلێمان الزێباری، مصدر سابق، ص ٣٤٣.

(١٤) مصدر نفسه، ص ٣٤٣.

### ٥- بەڵگەنامەی بانجۆڵ ١٩٨١:

وەك پاڵپشتێك لە لایەن ڕێكخراوی یەكێتی ئەفریقیاوە بۆ خەباتی گەلان لە پێناوی گەیشتن بە مافی چارەی خۆنووسین و مافی مرۆڤ، بە شێوەیەكی زۆر ئاشكرا و بە راشكاوی جەخت دەكاتە سەر مافی چارەی خۆ نووسین و لەگەڵ مافی هەبوون پێكەوە دەبەستێتەوە و ئەو پرەنسیپە دەباتە ڕیزی مافە بنەڕەتییەكانی مرۆڤ، لە بەندی ٢٠ ی ئەم بەڵگەنامەیەدا هاتووە.

أ - " هەموو گەلێك مافی هەبوونی هەیە كە ئەمەش مافێكی نەگۆڕ و رەهایە بۆ دیاری كردنی چارەنووسی خۆی، و مافی تەواوی خۆیەتی كە بە شێوەیەكی ئازادانە بارودۆخی سیاسی خۆی دیاری بكات بە شێوەیەك گرنتی بێ بۆ گەشەپێدانی بواری ئابووری و كۆمەڵایەتی وەك كە خۆی دەیەوێ.

ب - هەموو گەلێكی چەوساوە و كۆلونێكراو، مافی خۆ ئازادكردنیان هەیە لە ڕێگای پەنا بردنی بۆ هەموو هۆكار و ئامرازێك كە لە لایەن كۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە دانی پێدانراوە.

ج - هەموو گەلێك مافی وەرگرتنی یارمەتی و پشتگیری لێكردنیان هەیە لە لایەن ئەو دەوڵەتانەی كە بەشداری ئەم كۆنگرەیە بوون، بۆ خەبات كردن دژی داگیركاری بە هەموو شێوەیەكی سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی ".[١٥]

### ٦- كۆنگرەی ڤییەنا ١٩٩٣ :

جاڕنامەی ڤییەنا كە لە لایەن كۆنگرەی جیهانی مافی مرۆڤەوە لە (١٤-٢٥ یونیۆ)ی ١٩٩٣ دا لە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەكگرتووەكان بەسترا لە بەڵگەنامە كۆتاییەكەیدا هاتبوو: "هەموو گەلێك مافی چارەی خۆنووسینی هەیە، بە پێی ئەم مافە بە ڕەنگێكی ئازادانە گەشە بە بواری ئابووری، كۆمەڵایەتی، رۆشنبیری و كلتووری خۆی ئەدات، جاڕنامەكە بارودۆخی تایبەتی ئەو گەلانەی كە لە ژێر دەستی كۆلۆنیالیزم و داگیركاری دەرەكی دان لە بەر چاو دەگرێ و ماف دەداتە هەموو ئەم گەلانە بۆ گرتنەبەری هەموو رێوشوێنێكی پێویست و ڕەوا كە گونجاو بێ لەگەڵ پرەنسیپە كانی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ گەیشتن بە مافەكانی و نابێ

(١٥) ئاسۆ كەریم، مافی چارەی خۆنووسین، دەستور و ریفراندۆم، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە (٢)، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٥٥.



گەمە یاخود مانۆر بە مافی چارەنووسین بكرێت، كۆنگرەكە جەختی كردە سەر ئەوەی كە دان نەنان بە مافی چارەی خۆنووسین بە پێشێل كردن و سەر پێچی كردنی ئاشكرای مافی مرۆڤ دادەنرێ و جەخت لە سەر دەستەبەركردنی پراكتیكی ئەم مافە دەكات". [١٦]

لە لایەكی ترەوە و هەر پەیوەند بەم مەسەلەیەوە كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان كۆمەڵێك بڕیاری زۆر گرنگی دەركردووە بۆ بەرگری كردن لە مافی رەوای گەلان و ناوەڕۆكی ئەم بڕیارانە ئاماژە بە مافی چارەی خۆنووسین بۆ هەموو گەلان دەكات و سوور بوون و مكور بوونی خۆی بۆ پەلەكردن لە پراكتیزەكردنی ئەم مافە دووپات كردەوە، و پێشێل كردنیشی بە پێشێل كردنی مافی مرۆڤ دەزانێ.[١٧]

(١٦) د. سامي جاد عبدالرحمن واصل، ارهاب الدولة في اطار القانون الدولي العام، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠٦، ص ٣١٣.

(١٧) كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكانیش بە دەركردنی چەندین بڕیار جەخت لە سەر مافی چارەی خۆ نووسینی گەلان كردووە، لەوانە :

١- بڕیاری (١٥١٤) لە ١٩٦٠/١٢/١٤، سەبارەت بە بەخشینی سەربەخۆیی بۆ گەلْ و ناوچە كۆلۆنی كراوەكان كە ئاماژە بەوە دەكات پێویستە سنوورێك بۆ هەموو كارێكی چەكدارانە دابنرێ دژی گەلان و ناوچە كۆلۆن كراوەكان، چونكە پێشێل كردنی ئاشكرای مافی مرۆڤە و دژی بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكانە و پێویستە پەلە بكرێت بۆ سەربەخۆیی ئەو گەلانەی كە سەربەخۆیان بە دەست نەهێناوە.

٢- بڕیاری (٢١٣١) لە ١٩٦٥/١٢/٢١، كە جەخت لە سەر دانپێنان بە مافی چارەی خۆنووسین دەكات و دەڵێت، " ئەم مافە بناغەی سەربەستی و داد و ئاشتییە لە جیهاندا.

٣- بڕیاری (٢٧٨٧) لە ١٩٧١/١٢/٦، ئاماژە بە پراكتیزەكردنی كاریگەر بۆ مافی چارەی خۆ نووسین دەكات، كە دەبێتە هۆی پتەوكردنی پەیوەندی دۆستانە لە نێوان گەلاندا و دڵنیایی دەبەخشێت بە مسۆگەركردنی پاراستنی مافەكانی مرۆڤ و پاراستنی ئاشتی جیهان.

٤- بڕیاری (٢١٨٩) لە ١٩٦٦/١٢/١٣، جەخت لە سەر ئەوە دەكات كە هەر دواكەوتنێك لە نەهێشتنی كۆلۆنیالیزم دەبێتە ڕێگر لە بەردەم پراكتیزەكردنی مافی چارەی خۆنووسین و كۆسپێكی راستەقینە دەبێت لە بەردەم هاوكاری نێودەوڵەتی و ئاشتی و ئاسایشی جیهان دەخاتە بەر مەترسییەوە.

به شێوەیەکی گشتی رووخسار و تایبەتمەندییەکانی مافی چارەی خۆنووسین لە گور بەڵگەنامە و رێکەوتننامەی نێودەوڵەتییەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکرێتەوە :[١٨]

١- مافی چارەی خۆنووسین پرەنسیپێکی یاساییە و یەکێکە لەو پرەنسیپە سەرەکییانەی کە رێکخستنی نێودەوڵەتی هاوچەرخ پشتی پێ دەبەستێ، و یەکێکە لە مافە بنەڕەتییەکانی گەلان، یەکەم مەرجی بنەڕەتییە بۆ هەموو مافەکانی دیکەی مرۆڤ.

٢- مافی چارەی خۆنووسین لە رەوابوونیدا پشت بە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان دەبەستێت.

٣- ملکەچ کردنی گەلان بۆ کۆیلایەتی یان دەسەڵاتی بیانی بە پێشێل کردنی مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دادەنرێت و بە پێچەوانەی بنەماو پرەنسیپە کانی یاسای نێودەوڵەتییە، بە هەڕەشە و مەترسی دادەنرێت بۆ سەر ئاشتی و تەبایی و سەقامگیری جیهانی، و گەلانی ژێردەستی دەسەڵاتی دەرەکی و داگیرکەر مافی دیاریکردنی چارەنووسی دەرەکیان هەیە واتا پێك هێنانی دەوڵەت یاخود هەر بارودۆخێکی دیکە کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانیان بکات.

٤- پراکتیزەکردنی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین لە چوارچێوەی رێکخستنی هاوچەرخ دا بە دوو رێگە و شێواز بە ڕێوە دەچێت کە هەردووکیان رەواو یاساین، یەکەم رێگە چارەی

٥- بڕیاری (٢٩٠٨) لە بەرواری ١٩٧٢/١١/٢٠، جەخت لە سەر ئەوە دەکات بەردەوام بوون لە سەر سیاسەتی رەگەزپەرستی و جیاوازکردن لە نێوان گەلاندا دژی بەڵێنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە و دژی جاردانی مافی مرۆڤە و هەروەها دژی راگەیاندنی پێ بەخشینی سەربەخۆیی گەلان و هەرێمە داگیرکراوەکانە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : سەیران تەها ئەحمەد، کورد و مافی چارەی خونوسین، لە بەڵاوکراوەکانی راگەیاندنی روناکبیری مەڵبەندی رێکخستنی (ی ن ك)، ٢٠٠٠، ل ل ٦٠ -٦٢؛ د. ئەحمەد محمد رفعەت و د. صالح بەکر ئەلتەیار، تیرۆری نێودەوڵەتی، وەرگێڕان کوێستان جەمال، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ، ل ل ١٣٩ — ١٤٨؛ ابراهیم علی کرو، مصدر سابق، ص ٤٠.

(١٨) لیلاڤ حمد امین عزیز، الحقوق السیاسیة للکورد في الدول التي تضم کوردستان، دراسة تحلیلیة مقارنة، رسالة ماجستیَر غیر منشورة، الجامعة العالمیة للعلوم الاسلامیة — لندن، ٢٠٠٥ ٢٩-٢٨،.



ئاشتییانە وەك پەنا بردن بۆ پرەنسیپی ریفراندۆم بۆ ئەوەی گەلان لەم رێگەیەکی دیموکراسییانەی بڕیار لە سەر چارەنووسی خۆیان بدەن. رێگەی دووەم گرتنە بەر خەباتی چەکداریە لە لایەن بزووتنەوەی رزگاریخوازەکانەوە.

٥- ئەو گەل و نەتەوانەی بە دەست رژێمە توندڕەو و ڕەگەزپەرەستەکانەوە دەناڵێنن مافی دیاریکردنی چارەنووسی ناوخۆی و دەرەکیان هەیە، پێویستە دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان رێز لەم مافە بگرن و خۆیان بە دوور بگرن لە بە کار هێنانی هێز بۆ بێ بەش کردنی نەتەوەکان لە مافی چارەی خۆنووسین یاخود دەستتێوەردان لە کاروبوارییاندا.

٦- پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بە بنەمای دیموکراسی دادەنرێت لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا، لە بەر ئەوەی پشت دەبەستێ بە وەی کە دەبێ دەوڵەت و سنووری قەڵەمڕۆکەی، سیستەمی سیاسی و دەستوورییەکەی بە پێی حەزو ویستی سەربەستی گەلەکەی دا بڕێژێت.

سەبارەت بە مەرج و رەگەز و پێوەرەکانی مافی چارەی خۆنووسین بۆ ئەو گەل و نەتەوانەی داوای ئەو مافە دەکەن، تێڕوانین وڕا و بۆچوونەکانیان جۆراو جۆرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەتەوە یەکگرتووەکان بە پیێ ئەو راپورتەی کە لە سالی ١٩٨١دا بڵاویکردەوە بەناوی راپۆرتی(کریستکو) کۆمەڵێك پێوەر و مەرجی دیاری کرد بۆ ئەو گەلانەی دەیانەوێت مارەسەی مافی چارەی خۆنووسین بکەن کە بریتین لە:

١- "پێویستە ئەو نەتەوەیە زمان و رۆشنبیری یان ئایینی هاوبەشیان هەبێ.

٢- پێویستە هەست کردن بە مێژووی هاوبەش لە نێوان تاکەکانی ئەو نەتەوەیەدا هەبێت.

٣- پێویستە تاکەکانی ئەو نەتەوەیە یان ئەو گەلە بەڵێنی پاراستنی بنەما نەتەوەیی و خودییەکانی خۆیان بدەن و دەست بگرن بە بنەما نەتەوەییەکانی خۆیانەوە.

٤- پێویستە ئەو نەتەوەیە خاوەن هەرێمێکی دیاری کراو، ناسراو، زانراو بێت".[١٩]

هەر پەیوەند بەو مەسەلەیەوە، دادگای دادی نێودەوڵەتیش هەندێك پێوەری دیکەی بۆ مافی چارەی خۆنووسین زیاد کرد:

١- "ئەو قەوارەی کە دانیشتوان لە سەری دەژین ئارەزوو و ویستی بە دەوڵەت بوونی هەبێت.

٢- ئاشتیخواز و ئاشتی دۆست بێ.

(١٩) عبدالفتاح عبدالرزاق محمود، مصدر سابق، ص٢٠٣.

٣- ئەرکەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پەسەند بکات و پابەند بێ بە بەڵێن نامەکەی.
٤- توانای پراکتیزەکردنی ئەو پابەندبوونانەی هەبێت.
٥- ئارەزووی پراکتیزەکردنی ئەو پابەندبوونانەی هەبێ". [٢٠]

لەم چوارچێوەیەدا و بە پشت بەستن بەوەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کردن لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتوەکان و بڕیار و یاسا نێودەوڵەتییەکان و ئەو مەرج و رەگەز و پێوەرانەی کە دەستنیشانکراون، بە شێوەیەکی زۆر دیار و بەرچاو لە نەتەوەی کورد دا بەدی دەکرێت، گەلی کوردستان هەمووی ئەو مەرج و رەگەز و پێوەرانەی تێدایە کە پێویستن بۆ بڕیاردانی مافی چارەنووس، نەتەوەی کورد یەکێکە لە گەلە هەرە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە خاوەن مێژوو و کلتوور و زمانی هاوبەش و ناسنامە و شوناسی تایبەت بە خۆیەتی، و هەرێمی دیاریکراوی خۆی هەیە و سنووری جوگرافیشی دیارو ناسراوە [٢١]، ولاتەکەشی بە هۆی چەند رێکەوتننامەی کۆلۆنیالیستی کە لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ کردوون، بە شێوەیەکی زۆرەملێ و دوور لە حەز و ویست و خواست و بەرژەوەندی خۆی، دابەشی سەر دەوڵەتانی دەوروبەر کراوە و بە درێژایی سەدەیەکە سیاسەتی رەگەزپەرەستی و چەوساندن، قڕکردن و تواندنەوەی شوناسی نەتەوەی لە هەمبەری پەیڕەو دەکرێت، لە هەموو مافێکی سیاسی، ئابووری، کلتووری، رۆشنبیری بێ بەش کراوە و گەورەترین نەتەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانە کە دەوڵەتی سەر بە خۆی نییە.

بۆیە بە گوێرەی بڕیار و یاسا و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان پێویستە لە سەر ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشی کراوە، رێز لە مافە نەتەوەییەکانی بگرن و دانی پێدا بنێن، چونکە هەمووی ئەم دەوڵەتانە ئەندامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانن و بەڵێنامەکەیان مۆرکردووە، بۆیە پێویستە پابەند بن بە پابەندبوون و بەڵێنامەکانی خۆیان، هەروەك یاسا ناسی رووسی (ستار وشینکەر) دەڵێت: " دەبێ دەوڵەتان بە گوێرەی پابەندبوونی نێودەوڵەتی دان بە مافی چارەی خۆنووسینی ئەو گەلانەدا بنێن کە لە چوارچێوەی جوگرافیەکەیدان، و چارەسەری لە بار و گونجاو بۆ پێشکەوتنیاندا بنێت، و

(٢٠) ئاسۆ کەریم، سەرچاوەی پێشوو،٢٤.

(٢١) د. منذر الفضل، من الانفال الى الاستقلال، الطبعه الاولى، مطبعه وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥، ص ٢٦.



بڕیاری تەواو لە بارەی چارەسەری سیاسی بدات، دەربارەی جۆر و ماوەی بە جیهێنانی مافی چارەی خۆنووسین و بە هیچ جۆرێکیش دەوڵەت نابێ نکۆڵی لە مافی چارەنووسی گەلان بکات ". [٢٢]

کاتێکیش باس لە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان دەکرێت، مەبەستی هەر دوو رووەکەیەتی کە ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتە خۆ [٢٣]:
١- دامەزراندنی ولاتێکی سەربەخۆ لە سەر خاکی خۆی.
٢- بڕیاردان لە سەر سیستەمی ئۆتۆنۆمی – فیدراڵی – کۆنفیدراڵی لە چوارچێوەیی ولاتێکی دیاری کراو دا.
٣- بڕیاردان لە سەر هەر سیستەمێکی سیاسی دیکە لە ولاتدا.
٤- کۆتایی هێنان بە دەسەلاتی کۆلۆنیالیزم و داگیرکەر.

ئەم خاڵانەی سەرەوەش، بە واتای ئەوەیە کە نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێراق لە سەر ئاستی ناوخۆی عێراق مافی خۆیەتی، بە شێوەیەکی تەواو ئازادانە و دڵخوازانە، دوور لە هەر جۆرە هەڕەشە و گوشار و خۆ سەپاندنێك، شێوەی ژیان و پەیوەندی خۆی لەگەڵ بەشە عەرەبییەکەی عێراق لە چوارچێوەیی سیستەمێکی سیاسی دا کە " ئۆتۆنۆمی – فیدراڵی – کۆنفیدراڵی " دەگرێتەوە، دیاری بکات.

رووە دەرەکییەکەش واتا گەلی بەجیا هەڵکەوتوی ناو دەوڵەتە فرەنەتەوەکان مافی جیا بوونەوە و، پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆیان هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەنێ کە گەلی کورد مافی خۆیەتی بە شێوەیەکی ئازادانە بڕیاری سەربەخۆیی خۆی بدات و خۆی نەبەستێتەوە بە دەوڵەتی عێراقەوە و پێیان بڵێ من بەرژەوەندی خۆم لەوە دا دەبینم کە دەوڵەتی خۆم هەبێ.

بۆیە ئەو گەلانەی لە بەر کۆمەڵێك فاکتەر و هاوکێشەی سیاسی ناوخۆیی، هەرێمی و نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی ئاشتییانە بڕیاری پێکەوە ژیان لەگەڵ گەلێکی تر هەڵدەبژێرێ بەمانای دەستبەرداربوون لە مافەکانی تر، لەوانەش پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ ناگەینێ، بۆیە زۆربەی کات ئەو گەلانەی رازی دەبن بە پێکەوە ژیانێکی دڵخوازانە لە

(٢٢) مارف عومەر گوڵ، بە جیهانی کردنی مەسەلەی کورد لە بەر رۆشنایی یاسای تازە ی نێو دەوڵەتاندا، گوڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (١٢) سلێمانی، کانوونی دووەمی ١٩٩٥، ل ٢٤.

(٢٣) عبد المجيد اسماعيل حقى، مصدر سابق، ص٣١٤.

چوارچێوەی وڵاتیکدا  بە چەسپاندنی دەقێکی دەستووری هەر دوو لایەنی ناوخۆ و دەرەوەی مافی چارەنووس بۆ خۆی دەستەبەر دەکات، بۆ ئەوەی لە کاتی گونجاودا بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی پراکتیزەی بکات.

ئەمەش پێشینەی دەستووری هەیە و لە دەستووری چەندین وڵاتدا چەسپاوە و پراکتیزەش کراوە و چەندین گەل و نەتەوەش وەك تەیموری رۆژهەڵات و مۆنتنگرو توانیان لە رێگەی ئەم میکانیزمە دیموکراسییەوە سەربەخۆیی خۆیان وەربگرن[٢٤]، هەروەها کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیاری (٦٣٧) لە ١٦/١٢/ دیسامبری ١٩٥٢دا جەختی لە سەر میکانیزمی ریفراندۆم کردووە کە لەو رێگەیەوە ویست و ئارەزووی گەلان لە هەمبەری چارەنووسی خۆی رەچاو بکات. [٢٥]

لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئایا لە دوای لادانی رژێمی بەعس، کورد لە عیراق، توانیویەتی بەو شێوەیەی کە یاساکانی نێو دەوڵەتی ئاماژەیان پێ کردووە کە مافی چارەی خۆنووسین لە عێراق دا دەستەبەر بکات؟ ئایا عەرەبی عێراقی ئامادە بوون بە بێ هیچ جۆرە هەڕەشە و چاو سوورکردنەوەیەك رێز لەو مافە بگرن؟ ئایا کورد لە عێراقدا لە هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی خۆی لەگەڵ بەشە عەرەبییەکەی عێراق بە بێ هیچ جۆرە گوشار و مەرجێك ئازاد بووە؟ لە هەموویان گرنگتر چ مکانیزمێك لە دەستووری هەمیشەییدا هەیە، کە کورد بتوانێ پشتی پێ ببەستێ بۆ پراکتیزەکردنی هەر دوو ڕووی مافی چارەنووس؟

بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارانە نگەتیڤە، سەرەرای بە جیهانی بوونی مافی چارەی خۆنووسین و بوونی بە خاوەن هێزێکی یاسایی سەپێنەر دەستووری هەمیشەیی عێراق، ئاماژەی پێ نەکردووە، بەندێکی دەستوورە بەدی ناکرێت کە جەخت لە سەر ئەم مافە بکات، هۆیەکەش دەگەرێتەوە بۆ هەڵوێست و تێڕوانینی و بۆچوونی لایەنە عەرەبەکان کە دژی ئەم مافەی کورد بوون و بە داخوازییەکی نارەوا جودا خواز لە قەڵەمیاندا.

تێڕوانین و هەڵوێستی زۆرینەی عەرەبەکانی ناوخۆ و دەرەوەی عێراق بە دەوڵەت و رۆشەنبیرەکانییانەوە لە هەمبەر مافی چارەی خۆنووسینی کورد و هەموو نەتەوە

(٢٤) بڕوانە : اندریە ریپتیل، مافی دەستووری مێژوویی جوێبوونەوە، وەرگێڕان؛ گوڤاری توێژینەوە، ژمارە (٧)، حوزەیرانی ٢٠٠٧، هەولێر، ل ل ٢١ — ٢٤.

(٢٥) عبدالمجيد اسماعيل حقى، مصدر سابق، ص ٣٢٢.



کەمینەکانی تری نا عەرەب زۆر توندڕەوانە و شۆڤینیانە و نایاسایانەیە، لە لایە زۆربەیان دانپێنان بەم پرەنسیپە  بۆ ئەو گەلانەی کە بە شێوەیەکی زۆرەملی خراونەتە چوارچێوەی دەوڵەتەکانیان، هێڵی سوورە و نابێ ببەزێنرێ، دژی هەر جۆرە ئاراستەیەکی لەو جۆرەن و لەوەش سەیرتر و خراپتر، بەردەوام بە چاوی گومانەوە دەڕواننە نەتەوە کەمینەکانی نا عەرەب، بە هەڕەشە و مەترسی دەزانن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەی خۆیان و بە دوژمن و بە کرێ گیراوی دەرەکی حسابیان بۆی دەکەن.[٢٦]

گوشار و هەڵوێستە توند و نیگەتیڤەکانی هێز و لایەنە سیاسی و ئایینییەکانی عەرەبی عێراق، بوونەتە هۆی ئەوەی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بەو شێوەیەی کە هەیە و یاساکانی نێودەوڵەتی دانیپێداناوە لە دەستووری هەمیشەییدا نەچەسپێ و جێگای بۆ نەکرێتەوە.

ئەگەر چی سەرکردایەتی سیاسی کورد ئاماژە بەوە دەکات کە دەکرێ پەرەگرافی کۆتایی دەستوورەکە کە دەڵێت " پابەندبوون بەم دەستوورە یەکێتی سەربەستانەی گەل و خاك و سەروەری عێراق دەپارێزێ: "[٢٧] وا لێك بدرێت و شیبکرێتەوە کە بە رامان و واتای مافی چارەنووس دێت، بەڵام زۆربەی پسپۆران و شارەزایانی بواری یاسایی و سیاسی لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نین، لەم چوارچێوەیەدا د.منذر الفضل، ئەندامی لیژنەی دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی لە سەر لیستی هاوپەیمانی کوردستان دەڵێت، سەرەڕای ئەوەی گەلی کورد مافی خۆیەتی چارەنووس و شێوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ لایەنی عەرەبی عێراقی بە هەڵبژاردنی (فیدراڵی، کۆنفیدراڵی یان ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆ لە سەر خاکی خۆی دیاری بکات، بەڵام پرۆژەی دەستووری هەمیشەی هیچ بەندێك کە جەخت لە سەر ئەو خاڵە بکاتەوە بەدی ناکرێت. [٢٨]

(٢٦) بڕوانە: د. دهام محمد العزاوی، الاقليات و الأمن القومي العربي، دراسة في البعد الداخلي و الاقليمي و الدولي، الطبعة الاولى، دار وائل للنشر، عمان، ٢٠٠٣، ص ٢٧١.

(٢٧) بروانە دیباجەی دەستووری هەمیشەیی عێراق.

(٢٨) وەرگیڕاوە لە: جوهر نامق سالم، کورد لە گەمەی دەقە یاساییەکاندا، وردبوونەوە لە دەستووری هەمیشەیی"العراق"، چاپی یەکەم، بەڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٦٧.

هەروەها جەوهەر نامیق سالم رۆشنبیر و کەسایەتی سیاسی کورد دەڵێت:" جێگیر کردنی پرەنسیپی مافی چارەی خۆ نووسین وەك خۆی و دیاریکردنی تا دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ لە سەر دەستووری هەمیشەییدا مافێکی رەوا بووە، هەروەها ئاماژە بووە لە خودی ناوەرۆکی ئەم پرەنسیپە  کە یەکێك بووە لە بنەما سەرەکییەکانی ئامانج و ویستی خەڵکی کوردستان، کە لە پێناویدا رووباری خوێنی داوە تاکو جینۆسایدکردن و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی، نەبوونی دەقێکی وەها روون و زەق لە دەستوور دا گومان دەخاتە سەر هەموو بەند و دەقەکانی دیکە کە باس لە مافەکانی گەلەکەمان دەکەن ".[٢٩]

لە کۆتایی ئەم باسەماندا دەکرێت بڵێین چەسپاندنی بەندێك لە دەستووری هەمیشەیی دا کە زۆر بە راشکاوی و بێ پێچ و پەنا ئاماژە بە مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد بکات، کارێکی زۆر یاسایی و سروشتی بوو، چونکە وەك ئاماژەمان بۆ کرد گەلی کورد وەك هەموو گەل و نەتەوەکانی جیهان مافی خۆیەتی بە بێ جیاوازی قەبارەو ژمارەی هاوڵاتیان، رەگەز و ئایین و ئایینزا، بە شێوەیەکی ئازادانە و دڵخوازانە، دور لە هەر جۆرە هەڕەشە و خۆ سەپاندنێك، پێگەی سیاسی خۆی لە سەر ئاستی ناوخۆیی عێراق و دەرەوە دا دیاری بکات و دەقنووس کردنی بەندێك بۆ ئەوەی گەلی کورد دوای چەند ساڵێك ریفراندۆمێك ساز بکات سەبارەت پێداچوونەوە بە پێکەوە ژیانی خۆی لەگەڵ بەشە عەرەبییەکەی عێراق، مافەکی زۆر یاسایی بووە و پێشینەی دەستووری هەیە و لە چەندین وڵاتدا ئاماژەی بۆ کراوە، و توانراوە لەم رێگەیەوە چارەسەری زۆر کێشەی نەتەوەیی بکرێت.

(٢٩) هەمان سەرچاوە، ل ل ٦٩ – ٧٠.



## باسی دووەم
## بە فیدراڵی کردنی عێراق

### لقی یەکەم : چەمك و تایبەتمەندییەکانی سیستەمی فیدراڵی

زاراوەی فیدراڵیزم (Federalism) لە وشەی لاتینی (Foedus) وەرگیراوە، کە بە واتای پەیماننامە، رێکەوتن نامە دێت.[٣٠] بۆچوونێکی تر ئاماژە بەوە دەکات کە مانای فیدراڵیزم لە گور قاموسی (لویسی لاتینی) بە واتای، کۆمەڵە (League)، رێکەوتن لە نێوان دوو لایەن یان زیاتر (Treaty)، بەڵگەنامە (Compact)، هاوپەیمانی (Alliance)، وگرێ بەست (contract) دێت.[٣١]

ئەنسکلۆپیدیای زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش پێی وایە وشەی (Federation) چوار مانای تەمومژاوی هەیە، کە بریتین لە، هاوپەیمانی Alliance))، کۆمەڵە (League) کۆنفیدراڵیزم (Confederation) و یەکێتی یان یەکگرتن.[٣٢]

سەبارەت بە دەوڵەتی فیدراڵی یاخود فیدراڵی، یاسا ناسان و زانایان هەر یەك لە روانگەیەکی تایبەتەوە پێناسەی کردووە و شیکردنەوەی بۆ کردووە؛ یاساناسی ئەڵمانی (جیلینك (Jillink) وای بۆ دەچێ کە فیدراڵی بریتییە لە: " دەوڵەتێکی سەروەر کە لە چەند دەوڵەتی تری بچووك و لاوەکی پێکهاتووە، و دەسەڵاتەکانی لەو دەوڵەتانە سەرچاوە دەگرێت و

(٣٠) بڕوانە: د. محمد هماوه ند، الفیدرالیة و الحکم الذاتي، اللامرکزیة الاداریة الاقلیمة، دراسة نظریة مقارنة، الطبعة الثانیة، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠١، ص ١٨١؛ دیلمان محمد، فیدراڵیزم و ئۆتۆنۆمی، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکار، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی ن ك) سلێمانی، ژمارە ٢، ئایاری ٢٠٠٢، ل ٧.

(٣١) وەرگێڕاوە لە: د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص ٢٣٣ – ٢٣٤؛ سەیوان کاکە رەش، بەراورد لە نێوان رژێمە فیدراڵییەکاندا، مەکتەبی بیر و هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٥.

(٣٢) وەرگێڕاوە لە: د. محمد هماوەند، مصدر سابق، ص ص ١٨١ – ١٨٢.

هەڵدەوقوڵێت کە پێکی دەهێنن، بە جۆرێك پێکەوە بەستراون کە وەك یەکەیەکی سیاسی بەدیار دەکەون". [٣٣]

یاساناس ویلیام ریکەر (William Riker) دەڵێت " فیدراڵییەت رێکخستنێکی سیاسییە کە تێدا کارەکانی حکوومەت لە نێوان حکوومەتی ناوەندی و حکوومەتە هەرێمییەکان دابەش دەکرێت بەم شێوەیە کە هەر یەك لەم حکوومەتانە بەشێك لە کارەکان بەڕێوە دەبات و دەتوانێت بڕیاری یەکلاکەرەوە لەو بارەیەوە بدات؛ [٣٤].

هەروەها د. محمد عمر مەولودیش پێناسەی سیستەمی فیدراڵی دەکات بەوەی کە: "رێکخستنێکی سیاسی دەستووری ناوخۆی ئاوێتەیە، بەو پێیە چەند دەوڵەتێکی ئەندام یان، چەند ولایەتێك و هەرێم دەچنە ژێر باری دەوڵەتی فیدراڵی لە خۆیان بەرز تر ئەم رێکخستنە دوو رووی هەیە، یەکێکیان دەرەکییە کە کە وەك یەك دەوڵەت لە گۆڕەپانی دەرەکیدا دەردەکەوێت، ئەوی تر رووێکی ناوخۆییە کە بریتییە لە چەند کییان و قەوارەی دەستووری کە بەشداری دەکەن لە ممارەسەکردنی سەروەری ناوخۆیدا". [٣٥]

بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بڵێین فیدراڵییەت گرێبەست یاخود رێکەوتنێکی سیاسی و دەستوورییە، لە نێوان چەند دەوڵەت یاخود هەرێم و ویلایەت کە بە ئارەزووی خۆیان دەوڵەتی فیدرالی پێك دەهێنن و دەست بەرداری بەشێك لە دەسەڵاتەکانی خۆیان دەبن بۆ دەوڵەتی فیدراڵی، بەڵام لە هەمانکاتدا بڕێکی زۆر سەربەخۆیی ناوخۆییان هەیە. دەوڵەتی فیدراڵی بە کۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە دەناسرێت، کە دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕ بکرێتەوە:

١- فرەقەوارەیی سیاسی : دەوڵەتی فیدراڵی بەوە جیا دەکرێتەوە کە چەند قەوارەیەکی سیاسی لە خۆ دەگرێت، واتا لە ئەنجامی چەند قەوارەیەکی سیاسییەوە لە دایك دەبێ، ئەم قەوارانە یاخود کیانانە بریتین لە هەرێمەکان یاخود حکوومەتە هەرێمییەکان و ویلایەتەکان. [٣٦]

(٣٣) وەرگێڕاوە: لە د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ٢٣٥.

(٣٤) وەرگێڕاوە لە: سولاف محمد امین، تحدید الصلاحیات في الدولة الفیدرالیة، دراسة تحلیلیة مقارنة في طبیعة الدستور الفیدرالي، رسالة ما جستیر غیر منشورة، جامعە صلاح الدین، اربیل، ٢٠٠٦، ص ٢١.

(٣٥) د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ٢٣٦.

(٣٦) مصدر نفسه، ص٢٣٦.



٢- یەکگرتنەوەی ئارەزومەندانە: فیدراڵییەت بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی بە یەك گرتنەوەی ئازادانەی هەرێمەکانەوە هەیە و گروپە جیاوازەکان بە شێوەیەکی دڵخوازانە بڕیاری بەشداری کردن لە پێکهێنانی دەوڵەتی فیدراڵیدا دەدەن، و هەر یەك لەم گروپانە لە ژێر سایەی ئەم یەکگرتنەدا تایبەتمەندییەکانی خۆیان دەپارێزن، بەڵام ئەوەی گرنگە، نابێ ئەم جۆرە یەکگرتنە بە زۆرەملێ بێت. [٣٧]

٣- دابەشکردنی دەسەڵات : یەکێك لە گرنگترین تایبەتمەنییەکانی دەوڵەتی فیدراڵی بریتییە لە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان حکوومەتی فیدراڵی و حکوومەتە هەرێمییەکان و ویلایەتەکان، لەم پەیوەندیەدا ئەوەی گرنگ و جێگای باسە سنووری دەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵی و حکوومەتە هەرێمییەکانە لە بڕیاردان‌دا، ئەم سنوورە لە وڵاتانی خاوەن سیستەمی فیدراڵیدا لێك جیاوازە، ئەم دەوڵەتانەی فرەنەتەوە و مەزهەب و تایفەن، بێ گومان سنووردارکردن و بەر تەسك کردنی سنووری دەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵی گرنگی زۆری هەیە.

٤- بوونی دادگای باڵای دەستووری: ئەم دادگایە دوو ئەرکی سەرەکی لە ئەستۆ دایە، یەکەمیان یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە لە نێوان حکوومەتە هەرێمەکان و حکوومەتی فیدراڵی دێتە ئاراوە سەبارەت بە دەسەڵاتەکان، دووەمیان رێگرتن لە حکوومەتی فیدراڵی و هەرێمەکان لە بەزاندنی سنووری دەسەڵاتی خۆیان. [٣٨]

٥- دەسەڵاتی دوو لایەنەی یاسادانان: دەسەڵاتی یاسا دانانی یەکێتی فیدراڵی لە دوو ئەنجوومەن پێك دێت، یەکەمیان ئەنجوومەنی نوێنەرانە کە ئەندامەکانی راستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێت، دووەمیان ئەنجوومەنی هەرێمەکانە کە جیاوازی تەواوی هەیە لەگەڵ ئەنجوومەنی پێشوو، ئەندامەکانی لە سەر بنەماو بناغەی نوێنەرایەتی،

(٣٧) ئورسولا مونخ و کرستین میرڤالد، فیدراڵیزم و ئەزموونە جیاوازەکانی، وەرگێڕان لە ئەڵمانییەوە، ئیسماعیل حەمە ئەمین، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ل ١٦ – ١٧.

(٣٨) د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص ٢٤٧ – ٢٥٢.

یەکسانی لە رووی ژمارەوە لە نێوان هەرێمەکان دیاری دەکرێت و پەیوەندی بە رێژەی دانیشتووانەوە نییە. [٣٩]

سەبارەت بە رێگەکانی دروستبوونی دەوڵەتی فیدراڵی بە دوو رێگە دێتە کایەوە: یەکەمیان یەکگرتنی فیدراڵی بە کۆبوونەوە یاخود پەیوەندی کردن، بە گوێرەی ئەم رێگەیە کۆمەڵێك دەوڵەتی سەربەخۆ یەکتر دەگرن و دەوڵەتی فیدراڵی پێك دەهێنن. نموونەی ئەم شێوازە دەکرێت ئاماژە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سویسراو و کەنەدا بکەین. شێوازی دووەم لێك هەڵوەشانەوەیە، بە گوێرەی ئەم رێگەیە دەوڵەتێکی ساکار و سادە دەگۆڕدرێت بۆ دەوڵەتێکی ئاوێتە و دابەشی سەر چەند هەرێم و ویلایەت دەبێت و پاشان بە گوێرەی دەستووری فیدراڵی یەك دەگرن و دەوڵەتێکی فیدراڵی پێك دەهێنن. نموونەی ئەم شێوازە وەك، بەلجیکا، عێراق. [٤٠]

## لقی دووەم : فیدراڵیزم وەك میکانیزمێك بۆ چارەسەری پرسی نەتەوەیی و تایفی لە عێراقدا.

سیستەمی فیدراڵی یەکێکە لەو فاکتەر و میکانیزمە کاریگەرانە، کە دەوڵەتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان لە پێناوی چارەسەری کێشەو گیروگرفتە جۆراوجۆرەکانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری هانایان بۆی بردووە. هەر ئەمەش وای کردووە کە ئەم سیستەمە رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو پێشەوە بچێت و لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە زیاتر گرنگی پێ بدرێت[٤١]، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی پراکتیزەی سیستەمی فیدراڵی دەکەن دەگاتە (٢٤) دەوڵەت و نزیکەی (٤٠٪)ی سەرجەم دانیشتووانی جیهان لە ژێر سایەی ئەم سیستەمەدا ژیان بەسەر دەبەن.[٤٢]

(٣٩) د. محمد هماوەند، مصدر سابق، ص ص ١٩١ — ٢٠٥.

(٤٠) بڕوانە: د. محمد هماوەند، مصدر سابق، ص ص ١٨٥ — ١٨٦؛ د. محمد عمر مولود، مصدر سابق، ص ص ٢٣٦ - ٢٣٧.

(٤١) د. جبار قادر، الفیدرالیة : تجسید لتعایش مفهومي الوحدة و التنوع علی سطح واحد، مجلة سردم العربي، دارسردم للطباعة و النشر، العدد (١٣)، ٢٠٠٦، السلیمانیة، ص ٣١.

(٤٢) د شێرزاد احمد نجار، لە میانەی تاوتێکردنی ئەم ماستەر نامەیە (١٢/٦/٢٠٠٨)گەل توێژەر، ئاماژەی بەم زانیارانەی کردووە.



بەڵام دەکرێت تێبینی ئەم خاڵەش بکەین کە لە بەر ئەوەی فیدراڵییەت بەرهەم و پاشخانی مێژووە نەك ئایدۆلۆجیایەکی دیاری کراو، بۆیە شێواز و فۆرم و شێوەکانی پراکتیزە کردنی فرە جۆرن و هەر شێوازێك رەنگدانەوەی هەلومەرج و بارودۆخی ناوخۆی ئەم وڵاتەیە کە هەوڵی پەیڕەوکردنی ئەدات، لەبەر ئەمە هیچ شێوازێکی فیدراڵی ئامادەکراو لە بەردەستدا نییە کە پێویست بێ لە سەر هەموو دەوڵەتەکان پراکتیزەی بکرێت، بەڵکو مۆدیلەکانی جۆراوجۆرن لە جیهاندا و هەر وڵاتێك و کۆمەڵگایەك شێوەی تایبەتی خۆی هەیە کە گونجاوە لەگەڵ بارودۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی، کلتووری، ئیداری و ئابوورییەکەی.[٤٣]

لەم سۆنگەیەوە یەکێك لە گرنگترین پاڵنەر و هاندەرەکانی پەیڕەوکردنی سیستەمی فیدراڵی لە وڵاتانی فرە ئەتنی، کلتووری، مەزهەبی، ئایینی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکی و ململانێیەکانی ناو وڵاتەکانیان دا، کە نەیانتوانیوە لە رێگەی سیستەمێکی سەنتراڵیزمییەوە چارەسەری بکان. [٤٤]

بە واتایەکی تر فیدراڵیزم یەکێك لەو ئامرازە کاریگەرانە بووە کە گەلان، وڵاتان، بیرمەندان بیریان لێ کردۆتەوە، بۆ رووبەڕووبوونەوەی ململانێ و ناکۆکییەکانی ئەتنی، کلتووری، زمانەوانی ناو چوارچێوەیەکی یەك دەوڵەت دا، کە لە بەر هەندێك هۆکار و هاوکێشەی سیاسی ناوخۆیی، هەرێمی و نێودەوڵەتی، نەیانتوانییەوە لێك جیا ببنەوە. لەم رووەوە توانیویەتی رێگەچارەیەك بێت بۆ پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانەی گروپ و نەتەوە لێك نەچووەکان لە نێو چوارچێوەی یەك دەوڵەتدا و لە هەندێك وڵاتی وەك سویسرا، هیند، بەلجیکیا، کەنەدا، توانیویەتی سەرکەوتنی گەورە بە دەست بهێنێ و پێکەوە ژیانێکی ئاشتیانە و دیموکراسیانە لە نێوان گشت پێکهاتە لێك جیاوازەکاندا بهێنێتە ئاراوە.[٤٥]

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر بێینە سەر بارودۆخی عێراق و وردبینەوە لەتەنگژە و قەیرانەکانی ئەم وڵاتە و بەردەوامی هۆکارەکانی ململانێ و ناکۆکییەکانی ئەتنی، مەزهەبی، تایفی

(٤٣) د. جبار قادر، الفیدرالیة : تجسید لتعایش...، ص ٣٣.

(٤٤) ئەحمەد عزیزی، فیدراڵیزم و سیستەمی فیدراڵی، گۆڤاری نوێن، ژمارە (١)،گۆڤارێکی فیکری روناکبیرییە، مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك) دەری دەکات، سلێمانی، ساڵی یەکەم ئایاری ٢٠٠٤، ل ٧٢.

(٤٥) د. جبار قادر، **الفیدرالیة** تجسید لتعایش....، ص ٣١؛ هاشم صالح، **الفیدرالیة** في العراق، ارقی نظام سیاسي في العالم، مجلة سردم العربیة، العدد (١٣)، مصدر سابق، ص ٦٨.

بەدرێژای سەدەیەك، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە عێراق لە سەرەتای دامەزرانییەوە لە گور حەز و ویست و خواستی پێکهاتەکانی نەبووە بە تایبەت کورد و شیعە، بەڵکو لە لایەن دەوڵەتی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیاوە دروست کراوە.

ئەم دەوڵەتە فرەڕەنگ و فرە پێکهاتەیە پڕاو پڕ بووە لە کێشەی ئەتنی، مەزهەبی، کلتووری، حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق (١٩٢١-٢٠٠٣) لە جیگای دابینکردن و فەراهەم کردنی کەش و هەوایەکی دیموکراسیانە و بوادران و دەلیڤە رەخساندن بۆ گروپە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەوەی مارەسەی مافەکانیان بکەن؛ ئەوا تەواو بە پێچەوانەوە هەوڵیان داوە بە زەبر و رەنگ و ئامرازی توندوتیژی و سەرکوت کاری، ئەم فرە پێکهاتەیە بسرنەوە.[٤٦] هەموو ئەمانەش بوونە هۆی ئەوەی عێراق بە درێژای سەدەیەك سەقامگیری بە خۆیەوە نەبینێ. و بارودۆخێکی وای هێنایە پێشەوە کە لە دوای دارمانی رژێمی بەعس لە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، نەك هەر کۆتایی بە ململانێ و توندوتیژی تایفی نە هێنیت، بەڵکو سەر لە نوێ کێشەکان تەقینەوە، عێراق پەلکێشی ناو ململانێکی ناوخۆیی توند کردەوە و بۆتە مەیدانێك بۆ یەکلاکردنەوەی حیساباتی دەوڵەتانی هەرێمی.

بە شێوەیەکی گشتی ئەستەم بوونی پێکەوە ژیان لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەنترالیزم و خاوەن دەسەڵاتێکی رەها، وای کردووە کە تێڕوانین و بۆچوونی جۆراو جۆر بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ تەنگەژە و قەیرانەکانی عێراق بێتە ئاراوە. بۆتە بابەتێکی گەرم و گوڕ لە نێوان سیاسەت زانان و پسپۆڕان و چاودێرانی سیاسییەوە لە سەر ئاستی ناوخۆیی عێراق و هەرێمی و نێودەوڵەتی و ئەمەریکی بۆ تێپەڕاندنی لەم تەنگەژیە.

زۆربەی پسپۆڕان و شارەزایانی بواری سیاسی لەوانە (جۆزێف بایدن، پیتر گالبریت، هنری کسینجر، رالف پیتر) هەروەها ناوەندەکانی فیکری وەك (سەنتەری سابان بۆ سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە پەیمانگەی بروکینگز لە واشنتون، سەندووقی ئاشتی جیهانی) کە بە شێوەیەکی پراگماتیانە دەڕواننە کێشەکانی عێراق گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی فیدراڵیزم تاکە رێگەیەکە دەتوانێ عێراق بە یەکەوە بهێڵێتەوە جەخت دەکەنە سەر ئەوەی هەر جۆرە پاشگەز بوونەوە یاخود شکست لەم رووەوە ئەو وڵاتە بە ئاراستەی شەڕێکی ناوخۆی دەچێت. لە

---

(٤٦) فازل کەریم ئەحمەد، چەمکی فیدراڵیزم، گۆڤاری نوڤین، ژمارە ١، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٣٣ — ٣٥.



ئەنجامدا چارەنووسەکەی بە شەڕێکی ناوخۆی بە دابەشبوون دەگات بۆیە وای بۆ دەچن گشتاندنی فیدراڵیزم بە سەر عێراقدا بارودۆخێکی لە بار بۆ هەر سێ پێکهاتەی شیعە و سوونە و کورد دەهێنێتە پێشەوە بۆ ئەوەی هەر پێکهاتەیەك بە دوای بەرژەوەندییەکانی خۆی بکەوێت، هەوڵ بدات گەشە بە هەرێمەکەی بدات و بەرەو پێشەوەی ببات.[٤٧]

(جۆزێف بایدن) سیناتۆری دیموکرات لە کۆنگرێسی ئەمەریکی یەکێکە لەو کەسانەی کە پێ دادەگرێت لە سەر دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی فیدراڵی. لەم رووەوە پڕۆژەیەکی خستە بەردەم کۆنگرێسی ئەمەریکی و بە زۆرینەی دەنگ پەسندکراوە.[٤٨]، لەم پڕۆژەیەدا جۆزێف بایدن جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە " بۆ نەهێشتنی شەڕ و ئاژاوەی عێراق و کۆتایی هێنان بە کێشەو ململانێیەکان، تەنانەت بە دانانی دیکتاتۆرێکی دیکە کۆتایی نایەت، بەڵکو دەشێت شەڕێکی ناوخۆیی و هەرێمی گەورەی لێ بکەوێتەوە، بەڵام رێگەیەك هەیە کە بەو هۆیەوە دەکرێت سەقامگیری لە عێراق بەدی بهێنرێت و هەم هێزەکانی ئەمەریکا لە عێراق پاشە کشەی پێ بکات، ئەویش بریتییە لە فیدراڵیزەکردنی عێراق و دابینکردنی فەزایەکی سەربەست بۆ کورد و شیعە و سوونە لە هەرێمەکانیاندا، حکوومەتی ناوەندیش بەرپرس دەبێت: لە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان وەکو ئاسایش، سنوور، دابەشکردنی داهاتی نەوت" هەروەها دەڵێت: " تاکە رێگەی براندنەوەی سنووری توندوتیژی و هێنانە دی هەلومەرجی لەبار بۆ ئەوەی هێزەکانی ئەمەریکا بە شێوەیەکی بەرپرسانە پاشەکشەی بکات بریتییە لە

---

(٤٧) بڕوانە: ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

http://www.planforiraq.com/plan. Iraq: A way forward
F:\Biden supports three-part Iraq split delawareonline The News Journal.htm.
F:\Joseph R_ Biden Jr_ and Leslie H_ Gelb - Federalism, Not Partition - washingtonpost_com.htm.

هەروەها رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٤٣٨٦)، ٢٠٠٧/٩/٣٠، ل ٥.

(٤٨) جۆزیف بایدن سیناتۆری دیموکرات و سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس و پرۆفیسۆر لیسی گلپ سەرۆکی فەخری دیراساتی ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە، لە ٢٠٠٧/٩/٢٦، پڕۆژە بڕیارێکی نامولزەمیان سەبارەت بە دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی فیدراڵی کوردی و شیعی و سوونی خستە دەنگدان لە کۆنگرێسی ئەمەریکا و بە رێژەی ٧٥ دەنگ بەرامبەر ٢٣ پەسەند کرا. بڕوانە: پلانی کۆنگریسی ئەمریکی لە سایتی ئەلیکترونی:

Iraq: A way forward. http://www.planforiraq.com/plan.

هاندانی کورد و شیعە و سوونە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاشتییانە دوای بەرژەوەندییەکانیان بکەون، کە ئەمەش ڕێکخستنێکی بە جێ دابەشکردنی دەسەڵاتی پێویستە، ڕەنگە ئەمە تاکە ڕێگە بێت بۆ ڕێگرتن لە دابەشبوونی توند و تیژ، و پاراستنی عێراقێکی یەکگرتوو. "(٤٩)

لەم چوارچێوەیەدا جۆزێف بایدن پلانێکی پێنج خاڵی سەبارەت بە ئایندەی عێراق خستۆتە ڕوو پێیوایە ئەم پلانە تاکە ڕێگایە کە بتوانێت عێراق بە یەکگرتووی بهێڵێت و سەقامگیری لەم وڵاتەدا بهێنێتە دی و چی تر ناوچەکەش تووشی قەیرانێکی گەورە نەکات، ئەم پلانەش کە جەخت لە سەر ئەم (٥)خاڵە دەکات :(٥٠)

١- عێراقێکی سێ هەرێمی پێك بهێنرێت، بە گوێرەی دەستوورەکەی عێراق ئەم وڵاتە فیدراڵیزە بکرێت، بە دامەزراندنی سێ هەرێمی تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆ و خۆ بە ڕێوەبەری شیعە و سوونە و کورد، هاوشانی حکومەتێکی ناوەندی بە هێز، بەڵام سنوور دار لە بەغدا، ئەم حکومەتە بخرێتە ئاستی بەرپرسیارەتییەوە لە بەرامبەر بەرژەوەندی هاوبەش و ڕاستەقینە ئەویش بەرگری، سنوور، سیاسەتی دەرەوە، بەرهەم هێنانی نەوت، و حکومەتە هەرێمییەکانیش لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکانیان بەرپرس بن.

٢- دابەشکردنی داهاتەکانی نەوت: دەستەبەرکردنی ڕێکەوتن نامەیەك سەبارەت بە ڕێگە چارەی فیدراڵی بۆ عەرەبە سوونەکان، ئەویش بە خستنەڕووی پێشنیارێکی ئەوتۆ کە نەتوانن ڕەتی بکەنەوە، بەو مانایەی پێویستە خۆیان ناوچەی خۆیان بەڕێوە ببەن، ئەمەش زیاتر لە بەرژەوەندییان دایە وەك کەمینەیەکی هەمیشەیی بن لە عێراقدا، پێویستە عێراقییەکان هانبدرێن بۆ دەستکاری کردنی دەستوور کە تێیدا (٢٠٪)ی داهاتی نەوت بە عەرەبە سوونەکان بدرێت، ئەمەش شایستەی قەوارەی خۆیانە لە کاتێکدا نەوت تەنها

(49 (F:\Joseph R_ Biden Jr_ and Leslie H_ Gelb - Federalism, Not Partition - washingtonpost_com.htm .

(٥٠) بڕوانە: ئەم سەرچاوانەی خوارەوە: http://www.planforiraq.com/plan

F:\Joseph R_ Biden Jr_ and Leslie H_ Gelb - Federalism, Not Partition - washingtonpost_com.htm.

ttp:// delawareonline.com/apps/pbcs.dll/article/2007/3/4.

http://www3.brookings.edu/fp/saban/analysis/june2007iraq_partition.pdf

ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٤٣٨٦)، ٢٠٠٧/٩/٣٠، ل ٥.

هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٥٤) ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧، ل ١٦.



لە باکوور و باشوور دا هەیە و لە ناوەڕاستی سوونەدا نییە، ئەم داهاتەش تاکە ڕێگایە بۆ کاراکردنی ئابووری ناوچەی عەرەبەسوونەنشینەکان هەروەها ڕێگە خۆش بکرێت تا حکوومەتی ناوەندی سیاسەتی نەوتی نیشتیمانیدا بڕێژێت، داهاتەکەی دابەش بکرێت بە شێوەیەکی کە بەرژەوەندی هەموو لایەنەکان گرتنی بکات، ئەمەش دەبێتە هاندەرێك بۆ ڕاکێشانی سەرمایە گوزاری بیانی پێویست بۆ بەرژەوەندی هەر یەك لە کۆمەڵەکان.

٣- کۆنفرانسێکی ئاسایشی هەرێمایەتی بە هاوکاری لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان ببەسترێت کە تێیدا دراوسێیەکانی عێراق بە ئێرانیشەوە، بەڵێن بدەن کە پشتگیری ڕێکەوتن لە سەر دابەشکردنی دەسەڵات لە عێراقدا بکەن و ڕێز لە سنوورەکانی ئەم وڵاتە بگرن.

٤- بە شێوەیەکی لێ پرسراوانە هێزەکانی ئەمەریکا پەیتا پەیتا کەم بکرێنەوە ئەویش لە ڕێگەی گەڵاڵەکردنی پلانێك بۆ کشانەوە و گواستنەوەی نزیکەی هەموو هێزەکانی ئەمەریکا لە عێراق تا هاوینی ٢٠٠٨ و هێزێکی بچووك بهێڵێتەوە لە عێراق یاخود لە نزیك عێراق بۆ ئەوەی هەموو تەرکیزەکی تیرۆرستان بشێوێنێت، ئەمە یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی دراوسێکانی دەست لە کاروباری ناوخۆیی عێراق وەرنەدەن.

٥- زیادکردنی کۆمەکی بنیات نانەوە، بە مەرجی پاراستنی مافەکانی کەمینە و ژنان، چێکردنی پرۆگرامی کارا بۆ بەخشینی ئەلتەرناتیڤێك بەگەنجانی عێراق و دوور خستنەوەیان لە میلیشیا و تاقمە تاوانکارەکان، پێویستە پێ دا بگرێ لە سەر ئەوەی کە وڵاتانی تری کۆمەك بەخش هەمان شت پەیڕەو بکەن، بە تایبەت وڵاتانی کەنداوی عەرەبی دەوڵەمەند بە نەوت.

هەروەها پیتر کالبرێت گەورە نووسەری ئەمەریکی پێیوایە پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی عێراق تاکە داوە بتوانرێت ئەم وڵاتە بەیەکەوە بهێڵرێت، لەم ڕووەوە دەڵێت: لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ عێراق دابەشی سەر سێ هەرێم و قەوارەی لێك جیاواز بووە، کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٩١ لە عێراق بووەتەوە و ناشگەڕێتەوە، شیعە و سوونەی عەرەبیش ململانێیەکی توند لە نێوانیان دەستی پێ کردووە، لە ئەنجامی ئەم ململانێیە ڕەنگە ئەم پێکهاتانە زیاتر لە یەك بترازێن، بۆیە پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی کورد، شیعە، سوونە، تاکە داو و ئامرازە کە بتوانێ ئەم وڵاتە بە یەکگرتوویی بهێڵێتەوە.

لەم ڕووەوە دەستووری عێراقی دوو تایبەتمەندی گەورەی تێدایە: یەکەم نەخشە ڕێگەیەکە بۆ عەرەبی شیعە و سوونە بۆ ئەوەی بتوانن دامەزراوە تایبەتەکانی بەڕێوەبردنی پێك بهێنن،

ئەمە ڕێگە بۆ پێشکەوتنی باشووری عێراق خۆش دەکات و یارمەتی ناوەندی عەرەبی سوونیش دەدات تا ناوچەکەیان بەرێوەببەن، کوردستانیش حکوومەتی هەرێمی خۆی هەیە، دووەم: دەستوور یاسایەکی بۆ خاوکردنەوەی ئەو کێشانەی کە ناکۆکییان لە سەرە خستۆتە گەڕ وەك: دابەشکردنی خاك و دەسەڵات. بۆیە دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێم چارەسەرێکی سیاسی باشە و دژایەتی یاخود بەرهەڵستی عەربی سوونە بۆ ئەم پرۆسەیە دژی بەرژەوەندییەکانی خۆیانە، چونکە هەر جۆرە عێراقێکی یەکگرتوو، عەرەبی شیعە تێیدا باڵادەست دەبێت بۆیە پێویستە ڕێز لە ئارەزووی خەڵکی عێراق بگرێت کە بە ڕێژەی نزیکەی (٨٠ ٪) دەنگیان بە دەستوور داوە و وتویانە لە ناو بترازێ نابێ عێراق هەبێ، پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یارمەتی و پشتگیری هەرێمەکانی عێراق بکات بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان پێش بخەن، بەڵام ئەگەر گەلێك یان پتر لە گەلێکی عێراقی ویستی جودا ببێتەوە، پێویستە ڕێگەی لێ نەگرێت. (٥١)

بە هەمان ئاراستە، (هنری کسنجر)، وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمەریکا پاڵپشتی پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی عێراق دەکات و بە تاکە ڕێگاچارەری دەزانێت، لەم بارەیەوە دەڵێت: " مانەوەی عێراق وەك دەوڵەتێکی سەنترالیزم و خاوەن دەسەڵات لە بەرژەوەندی گەلانی عێراق و ئەمەریکادا نییە بۆیە پێویستە ڕێگە بدرێت کە پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق لە ڕووی ئەتنی و تایەفییەوە حکوومەتی تایبەت بە خۆیان هەبێ و عێراق بکەوێتە سێ هەرێمی فیدراڵی کوردی – سونی – شیعە ".(٥٢)

لە لایەکی ترەوە خاتوو (داون برانکاتی لێکۆڵیاری وانەبێژ لە سەنتەری دراساتی سیاسەتی دیموکراسی لە زانکۆی برینستون) سەبارەت بە ڕێگە چارەی کۆتایی هێنان بە تەنگژەو قەیرانەکانی عێراق، جەخت لە سەر پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی ئەم وڵاتە دەکات، لەم ڕووەوە دەڵێت: " فیدراڵیزم زیندوترین ئەگەرە بۆ ڕێگە گرتن لە ململانێی ئەتنیکی و شەڕی جودا خوازی و زامنی دامەزراندنی دیموکراسییەتێکی ئارامە لە عێراقدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جۆرە سیستەمێکی فیدراڵی لە بار نابێت بۆ ئەم حاڵەتە، بەڵکو پێویستە سیستەمێکی

(٥١) پیتر و. کابریت، کۆتایی عێراق، وەرگێڕ مامکاك، چاپی یەکەم، بەڵاوکراوەکانی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٧،ل ل٢٦٧——٢٩٨.

(٥٢) وەرگێڕاوە لە: نواف الزرو، الحروب " الا سرائيلية " في العراق، عمان، ٢٠٠٥، ص ص ١١٤ – ١١٥.



فیدراڵی بێت کە دەسەڵاتی سیاسی، دارایی بەرفراوان بۆ هەرێمەکان و حکوومەتە ناوچەییەکان مسۆگەر بکات لە هەمانکاتدا ببێتە هۆی دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان حکوومەتی مەرکەزی و حکوومەتە هەرێمییەکان و بەخشینی کۆنترۆلی زۆرتر بۆ گروپە جیاوازەکان سەبارەت بە کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و تایبەت بە خۆیان بە شێوەیەك ئەم گروپانە هەست بکەن کەمتر ئیستیغلال کراون، لە لایەکی ترەوە پێویستە فیدراڵییەت یاخود سیستەمی فیدراڵی بە شێوەیەك بێت بتوانرێت دەستنیشانی سنوورەکان بکرێ لە سەر بنەمای ئەتنیکی و ئایینی، لەم بارەیەوە پێویستە ئەمەریکا ئامۆژگاری عێراقییەکان بکات بۆ گرتنە بەری ئەم ڕێگە چارەیە، لە بەر ئەوەی سیستەمێکی لەم جۆرە نەك هەر یارمەتی دەر دەبێ بۆ بنیاتنانەوەی دیموکراسی لە عێراق، بەڵکو ڕێگر و بەربەستیش دەبێ لە هێنانەوەی حکوومەتێك کە تێیدا عەرەبە شیعەکان هەژموونیان بە سەر دا هەبێت ".(٥٣)

لە بەرامبەر ئەم بۆچوونانەدا هەندێکی تر زیاتر دەڕۆن، و داوا دەکەن عێراق بکرێتە سێ دەوڵەتی کۆنفیدراڵی هاوشێوەی یەکێتی ئەوروپا، ئەم پێشنیازە زیاتر لە لایەن سندوقی ئاشتی جیهانییەوە خراوەتەڕوو کە ئەم خاڵانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێت (٥٤) :

١- عێراق دابەش بکرێت بۆ سێ دەوڵەتی کۆنفیدراڵی بە ناوی (یەکێتی دەوڵەتانی عێراق).

٢- بەستنی ڕێککەوتننامەیەك لە نێوان دەوڵەتە ئەندامەکانی یەکێتی دەوڵەتانی عێراق، ئەم ڕێکەوتننامەیە لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتی چاودێری بکرێت، هەروەها ئەم پەیمان نامەیە دەبێ دەستەبەری پاراستنی مافی کەمینەکان، ئازادییە گشتییەکان، ئایینییەکان بکرێت بە هەمان شێوە پەیماننامەیەکی دەست درێژی نەکردن لە نێوان ئەم دەوڵەتانەدا ببەسترێت و لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بە تایبەت نەتەوە یەکگرتووەکان چاودێری پابەند بوون بەم پەیماننامەیە بکرێت، سزاش بە سەر لایەنە پێشێل کەرەکە دا بسەپێنێ.

(٥٣) خاتوو داون برانکاتی، ئایا فیدراڵی دەتوانێت جێگیری لە عێراق بە دی بهێنێت، وەرگێڕانی، بارزان وەهاب، گۆڤاری نۆڤین، ژمارە (١)، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٥٩ – ١٧٤.

(54) Pauline H. Baker, A Way Out: The Union of Iraq States Report 7, the Fund for Peace, Washington, March 2003 to June 2007,pp1-18.

٣- دابەشکردنی داهاتی نەوت بە شێوەیەکی یەکسان لە نێوان ئەم سێ دەوڵەتەی کە لە عێراق سەر هەڵدەدەن بە شێوەیەك هەر پێکهاتەیەك بڕی یەکسانەی داهاتی نەوتی بەرکەوێت.

٤- بۆ ماوەی (١٠) ساڵ داهاتەکانی نەوت بخرێتە حیسابەکەوە کە لە لایەن بانکی جیهانییەوە بەڕێوە ببرێت ئەمەش دەرفەت ناهێڵێت بۆ گۆڕین یان دەستکاری کردنی چۆنییەتی دابەشکردنی داهاتەکان.

٥- هەر دەوڵەتێك شارێکی گەورە بکاتە پایتەختی خۆی، کەرکوك پایتەختی دەوڵەتی کوردی، بەسرا پایتەختی دەوڵەتی عەرەبی شیعە، بەغداش بۆ عەرەبە سوونەکان. هەروەها ئەو کەسانەی ئارەزووی گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوون دەکەن، دەبێ لە لایەن کۆمەڵگای نێو دەوڵەتییەوە بە هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتەکانی عێراق ئەم مافەیان بۆ دەستەبەر بکرێت.

٦- دەوڵەتانی عێراق یەکێتییەکی ئابووری و فەرمی پێك بهێنێن هاوچەشنی ئەوەی لە ئەوروپا هەیە، کە تێیدا هاوکاری یەکتر بکەن بۆ بەڕێوەبردنی دەزگا و دامەزراوە دارایەکانی پەیوەست بە ئاڵوگۆڕی بازرگانییەوە لە ئابوورییەکی یەکگرتوو و ئاوێتەدا.

سەبارەت بەم پلانەی(سندووقی ئاشتی جیهانی) بۆ عێراق و هۆیەکانی ڕاگەیاندنی و هەروەها جیاوازی لەگەڵ پرۆژەی (جۆزیف بایدن)، سەرۆکی سندوقی ئاشتی جیهانی (پۆلین باکەر) جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە :" ئەوەی ئێمە خستمانەڕوو و پێشنیازمان کردووە ئەوەیە کە عێراق دابەش بکرێت، ئەم دابەشبوونە سروشتێکی سیاسی هەیە، هەر هەرێمێك کار و باری خۆی هەڵدەسوڕێنێت و هێزی ئاسایشی خۆی هەبێ، و لە ڕووی ئابوورییەوە پێکەوە ببەسترێن، جیاوازی ئەم پرۆژەیە لەگەڵ پرۆژەی (جۆزیف بایدن) ئەوەیە کە (جۆزیف بایدن) بە شێوەیەکی ڕەها بنبڕی و نکۆڵی لەوە دەکات کە پلانەکەی دابەشکردنی عێراق بێت، بەڵام ئەوەی ئێمە دابەشکردنەوە پێمان وایە ئەگەر پلانەکەی (جۆزیف بایدن) پراکتیزە بکرێت کە تێیدا حکوومەتی ناوەندی دەسەڵاتێکی سنووورداری هەبێت، ئەوە هێشتا هێزەکانی ئاسایش دەکەونە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندییەوە و ئەوەش جارێکی تر عێراق تووشی قەیران و گرفت دەکات بۆیە پلانەکەی ئێمە ئەوەیە کە عێراق لە ڕووی سیاسییەوە لێك جیا



بکرێتەوە و سەربەخۆیی هاوشێوەی دەوڵەتانی یەکێتی ئەوروپا بێت، بەڵام ئاوێتەبوونێکی ئابووری لە نێوانیان دا هەبێت ". [٥٥]

بە هەمان ئاراستە (د.قوسنەنتین دانیوس) ئوستادی زانستی سیاسەت لە زانکۆی کۆلۆمبیا پسپۆڕ و تایبەتمەند و توێژەر لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا هەمان بۆچوونی هەیە و لەم ڕووەوە دەڵێت: " لە بەر ئەوەی هەر لە سەرەتادا بە زەبری هێز توندوتیژی هەوڵ دراوە عێراق پێکەوە بهێڵێتەوە بۆیە بەردەوام لە قەیران و تەنگەژەدا بووە، بۆیە پێویستە ڕێکخستنی عێراق شێوەیەکی دیکە بەخۆیەوە بگرێت، دەبێ بۆ هەر سێ پێکهاتەی: (کورد و عەرەبی شیعە و عەرەبی سوونە) زەمینەیەك بڕەخسێندرێت هەتا بتوانن پێکەوە بژین و کار بکەن، ئەمەش لە ڕێگەی سیستەمێکی کۆنفیدراڵییەوە دەبێت بۆ هەر سێ هەرێمەکە ".[٥٦]

لە لایەکی ترەوە (راڵف پیتەر) نووسەر و ئستراتیژزانی ناسراو لە سەر ئاستی جیهانی و ئەفسەری خانەنشینی سوپای ئەمەریکا جەخت لە سەر دابەشبوونی عێراق دەکاتەوە بۆ سێ (٣) دەوڵەتی سەربەخۆ، بەڵام پێیوایە ئەمە دەبی قۆناغ بە قۆناغ بێ، قۆناغی یەکەم ناوی لێ ناوە : " دابەشبوونێکی نەرم (Soft Partition)" و پێیوایە "ئەمە باشترین چارەسەرە بۆ کێشەو گرفتەکانی عێراق، پاشان بە تێپەڕبوونی کات ئەم سێ پێکهاتە لێك جیا بکرێنەوە، ئەمەش ئاسانترە بۆ کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی کە ئەم واقیعە بە شێوەیەکی تەدریجی قبووڵ بکات". [٥٧]

---

(٥٥) هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٥٦)، ٢٢ تشرینی یەکەم، ل ١٢.

(٥٦) هەفتەنامەی گوڵان ژمارە (٦٢٦)، ١٢ ی ئاداری ٢٠٠٧.

راڵف پیتەر نووسەر و ئستراتیژزانی ناسراو لە سەر ئاستی جیهانی و ئەفسەری خانەنشینی سوپای ئەمەریکا لە حوزەیرانی ٢٠٠٦ توێژینەوەیەکی بە ناوی سنوورەکانی خوێن لە گوڤاری هێزی سەربازی ( Armed force Jornar)ی ئەمریکادا بەڵاوکردەوە، دوای دووبارە دارشتنەوەی نەخشەی سیاسی و جوگرافی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست کرد. بە پێەی ئەم دەوڵەتانە لە دوای شەڕی ئێکەمی جیهانی درستکراون لە لایەن دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکاتنەوە و بە پێی ویستی ئەم گەلانە نەبووە، هەر بۆیەش رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوام لە قەیراندایە. بۆیش داوا دەکەت سنوورەکان سەر لە نۆی دابرێژرێنەوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

(57) Ralph Peters, Blood borders: How a better Middle East would look, Armed Force Journal June 2006: http://live.armedforcesjournal.com/2006/06/1833899.

ئەوەی لە سەرەوە ئاماژە پێکرا لە پڕۆژە و پێشنیازی سیاسەتمەداران و پسپۆڕان و چاودێرانی سیاسی ناوەندەکانی لێکولێنەوە بۆ دەربازکردنی عێراق لەو گرژی و ئاڵۆزییەی کە تێیکەوتووە، دەکرێت بگوترێت دابەشکردنی عێراق بۆ سێ یان زیاتر لە سێ هەرێمی فیدراڵی بۆ ئەم قۆناغە چارەسەرەکی زیاتر پراگماتیانەیە بو کۆتایی هێنان بە گرفت و ململانێی ئەتنی، تایفی و مەزهەبی لە عێراق، بە مەرجێك هەڵگری کۆمەڵێك فاکتەر و رەگەز و بنەمای تر بێت کە بە لای کوردەوە زۆر گرنگ و پێویستن. بەو مانایەی فیدراڵییەت کۆتایی چارەسەری پرسی کورد نییە، بەڵکو زیاتر مەبەست و میکانیزمە بۆ گەیشتن بە چارەسەری کۆتایی کە ئەویش گەیشتنە بە مافی چارەی خۆنووسین و دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بۆیە پڕۆسەی بە فیدراڵی کردنی عێراق دەبێ رێگا خۆش کەر بێت بۆ بەدی هێنانی گشت مافەکانی خەڵکی کوردستان، بۆیە بۆ ئەوەی ئەم پڕۆسەیەش سەرکەوتن بە دەست بهێنێ بە لایەنی کەمەوە دەبێ هەڵگری کۆمەڵێك فاکتەر و رەهەندبێ. لە داخوازی سێیەمدا هەوڵ دەدەین بە پوختی ئەم بابەتە شرۆڤە بکەم.

## لقی سێیەم: فاکتەرەکانی سەرکەوتنی فیدراڵییەت لە عێراقدا:

### ١– یەکێتی ئارەزوومەندانە:

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی سیستەمی فیدراڵی پێیەوە دەناسرێت، ئەوەیە کە ئەم سیستەمە بە گوێرەی رەزامەندی لایەنە بەشداربووەکان دادەمەزرێت، فاکتەری دڵخوازانە و ئارەزوومەندانە ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێت لە سەرکەوتن و درێژخایەنی ئەم سیستەمە دا.[٥٨]

لێرەدا زیاتر مەبەست ئەوەیە، نەتەوەکان، تایەفەکان، گروپەکان و ئەوانەی دەیانەوێت دەوڵەتێکی فیدراڵی دروست بکەن دەبێ حەزیان لەو یەکگرتنە بێ و بە ئازادی و ئارەزووی خۆیان بچنە ناو ئەم یەکگرتنەوە، ئەمەش کاتێك دەبێ بەرژەوەندی خۆیان لەو یەکگرتنەوەیەدا ببینن و بەند نەکرێت بە هیچ جۆرە کۆبەندێك و بە شێوەیەك هەست بکەن ناچارن لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتەدا بمێنێنەوە.

(٥٨) بڕوانە: ئورسولا مونخ وکرستین، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٦ — ١٧؛ الفكرالجديد، ملف حول الدستور، مجلة الفكرية — سياسية تقدمية، عدد (٣٥)، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٨٠.



وەك ئاماژەمان بۆی کرد خودی چەمکی فیدراڵییەتیش هاوئاراستەیە لەگەڵ ئەم بۆچوونە، چونکە چەمکی فیدراڵیزم بە واتای هاوپەیمانی و گرێ بەست دێت لە نێوان هەرێم و ویلایەتەکان، ئەم گرێبەستە یاخود هاوپەیمانەتییە ناکرێت بە زۆرەملێ بێ، لە بەر ئەوە نابێت هیچ جۆرە گوشار و پەستانێك ئەم یەکگرتنەوەیدا بەکارهاتبێ، (بریندر ئولیری) پسپۆر و شارەزا لە بواری تەنگەژە و قەیرانە فرەنەتەوەیەکان لە بابەتێکدا لە ساڵی ٢٠٠٥ لە ژێر ناوی(فیدراڵییەتی فرەنەتەوەیی، فیدرەسی و دەسەڵاتی هاوبەش و کوردی عێراق) بەلاو کردەوە. جەخت لە سەر ئەم خاڵە دەکات و وای بۆ دەچێ کە زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی کە فرەنەتەوە و فرەتایفەن و فیدراڵییەت تێیدا شکستی هێناوە، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم یەکگرتنە سەربەست و ئازاد نەبووە، ئەم گەلانە ناچارکراون پێکەوە بژین، لەم رووەوە ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکات، کە بوونەتە هۆی هەرەس هێنانی دەوڵەتی فیدراڵی، لەوانە:

أ- فاکتەر یاخود ڕەگەزی زۆرە ملێ، ئەم نەتەوانە ناچاکراون و بە سەریاندا سەپێندراوە پێکەوە بژین، ئەم رێکەوتن نامەیە لە ئەنجامی رێکەوتننامەی دڵخوازانەو ئارەزوومەندانە نەبووە لە نێوان پێکهاتەکانی ئەم وڵاتانەدا و لە ڕوانگەی قەناعەتی ئەو گەلانە نەبووە.

ب- دیکتاتۆری: لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا دیموکراسییەت کە بڕبڕەی پشتی سیستەمی فیدراڵییەتە، پەراوێزکرابوو، بە شێوەیەکی دیکتاتۆرانە وڵات بەڕێوە دەبرا.

ج- دەرفەت نەدان بە نەتەوە بچووکەکان بۆ ئەوەی ممارەسەی مافەکانیان بکەن، کە ئەمەش بۆتە هۆی سەرهەڵدانی گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان نەتەوەی بچووك و نەتەوەی کە زۆرینە لە رووی ژمارەییەوە، نەتەوەی زۆرینە هەوڵیداوە خۆی بە سەر پێکهاتەکانی تریدا بسەپێنێ، ئەمەش وای کردووە کە نەتەوە بچووکەکان هەولی خۆرزگار کردن بدەن.

د - بە ناوەندکردنی دەسەڵات و کاڵکردنەوەی دەسەڵاتی هەرێمەکان، هەموو ئەمانە فاکتەری سەرەکی سەرهەڵدانی گرژی و ئاڵۆزی و ناکۆکی و ململانێ بووە لە نێوان دەوڵەتە فرەنەتەوەکان وەك یۆگسلاڤیا و یەکێتی سۆڤییەت کە لە ئەنجامدا بووە هۆی لە بەر یەك هەڵوەشانەوەی ئەم دەوڵەتانە.[٥٩]

(٥٩) بریندر ئولیری، فیدرالییەتی فرە نەتەوەیی، فیدرەسی و دەسەڵاتی هاوبەش و کوردی عێراق، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە (٣)، هەولێر، ساڵی یەکەم ئابی ٢٠٠٥، ل ١٢٩.

بۆیە هەر جۆرە سیستەمێکی فیدراڵی لە عێراق دەبێ لە سەر بنەمای پێکەوە ژیانێکی ئارەزوومەندانە و ئاشتییانە بێت لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانیدا و نابێ بە سەریاندا بسەپێندرێت، چونکە ئەمە هاودژ و پێچەوانەی پرەنسیپی یەکێتی ئارەزوومەندانەیە، بۆیە لە دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك دەبێ پێداچوونەوە بەو پێکەوە ژیانە بکرێت بۆ ئەوەی هەر یەك لە کورد — عەربی شیعە و سوونە بە شێوەیەکی ئازادانە و لە گوڕ حەز و بەرژەوەندییەکانیان ئایندەی خویان دیاری بکەن بەوەی دەیانەوێت لە چوارچێوەی عێراقدا بمێنن یاخود لێك جیا دەبنەوە ئەمەش دەکرێ لە ڕێگەی ریفراندۆمێکەوە بێت و ئەگەر هەر پێکهاتەیەك یاخود هەرێمەکان بە شێوەیەکی زۆرینە دەنگی بە جیابوونەوە و خۆکشاندنەوەی لە عێراقدا پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ و بە شێوەیەکی ئاشتییانە پەسند بکرێ.(٦٠) لەم ڕووەوە پیتەر کالبریت جەخت دەکاتە سەر ئەوەی پێویستە یارمەتی گەلانی عێراق بدرێت بۆ ئەوەی گەشە بە هەرێمەکانی خۆیان بدەن، بەڵام ئەگەر گەلێك یان زیاتر لە گەلێکی عێراقی ویستی جودا بێتەوە پێویستە ڕێگەی لێ نەگیرێ ".(٦١)

**٢ — هاوسەنگی لە نێوان هەرێمەکاندا:**

ئەوەی تێبینی لە دەکرێت زۆرینەی تێڕوانین و بۆچوونی پسپۆڕان و سیاسەتمەداران چاودێرانی سیاسی لە ڕوانگەی ململانێ و ناکۆکی نێوان عەرەبی شیعە و سوونەوە دەڕواننە مەسەلەی دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی فیدراڵ و پرۆسەی بە فیدراڵی کردنەکەی، بەڵام ئێمە لە ڕوانگە و دیدگایەکی تریشەوە سەیری هاوکێشەکە دەکەین ئەویش ئەوەیە، دابەشکردنی عێراق دەبێتە هۆی هێنانە دی جۆرێك لە هاوسەنگی لە نێوان هەرێمەکاندا و مەترسی هەژموونی دەسەڵاتی هەرێمی عەرەبی بە سەر هەرێمی کوردستاندا لاواز تر و کەمتر دەکات، بەڵام بوونی دوو هەرێمی فیدراڵی (کوردستان — عەرەبستان) دەبێتە هۆی ئەوەی هاوسەنگی هێز لە بەرژەوەندی هەرێمی عەرەبیدا لە ڕووی ئابووری، ڕێژەی دانیشتوان، سامانی سروشتی و هێزی سەربازییەوە. ئەمەش مەترسی ئەوەش درست دەکات لە دوا ڕۆژ دا هەوڵی خۆ سەپاندنی بە سەر هەرێمی کوردستان بدات و دەسەڵاتەکەی سنووردار بکات.

(٦٠) لیام اندرسن وغاریث ستانسفیلد، مصدر سابق، ص ص، ٣٩٣-٣٩٤.

(٦١) پیتە رو. کالبریت، کوتایی عیراق،...، ل٢٧٦.



بۆیە هاتنە ئارای هاوسەنگی و لێکچوون لە نێوان هەرێمەکاندا لە ڕووی ڕێژەی دانیشتوان، و سامانی سروشتی، هێزی ئابووری و مرۆیی و سەربازی ئابوورییەوە، زۆر گرنگ و پێویستە بۆ پاراستنی هاوسەنگی هێز لە نێوان پێکهاتەکانی پێك هێنەری سیستەمی فیدراڵیدا، بەو مانایەی نا هاوسەنگی و جیاوازی زۆر لە نێوان هەرێمەکان لە ڕووی سامانی سروشتی و هێزی سەربازی، مرۆیی و ئابووری و سیاسی و ڕێژەی دانیشتوانەوە وا دەکات هەندێ جار ئەو هەرێمەی ئەم ڕەگەزانەی تێدایە مەترسی ئەوەی هەیە هەوڵی سنووردارکردن و لاوازکردنی دەسەڵاتی هەرێمە بچووکەکان بدات.(٦٢)

ئەمەش ئەگەرێکی زۆر چاوەڕوان کراوە سەبارە بەو دەوڵەتانەی هاوشێوەی عێراق کلتووری دیموکراسی و یەکتر قبوڵ کردن و ڕێزگرتن لە مافی یەکتر زۆر لاواز و لە ئاستێکی نزم دایە. زۆر نموونەی بەم شێوەیەش هەیە یەکێتی سۆڤییەت یەکێك بوو لەو دەوڵەتانە کە ڕووسەکان نزیکەی (٦٠ ٪)ی سەرجەمی حکوومەتی فیدراڵیان پێك دەهێنا، هەروەها لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان، هێزی سەربازی، ئابووری لەوانی دیکە بەهێز و زۆرتر بوون، ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی هێز بۆ بەرژەوەندی ڕووسەکان یاخود نەتەوەی ڕووسی و توانی کۆنترۆڵی سەرجەم دەوڵەتی فیدراڵی بکات و هەوڵی دا نەتەوەکانی دیکە لە ناو بۆتەی نەتەوەی ڕووسی دا بتوێنێتەوە. هەمان شت سەبارەت بە یۆگسلاڤیاش ڕاستە، تێکچوونی هاوسەنگی هێز بۆ بەرژەوەندی سربیا لە ڕووی ئابووری، سەربازی، مرۆیەوە وای کرد خۆیان بە سەر پێکهاتەکانی دیکە دا بسەپێنن.(٦٣)

بە شێوەیەکی گشتی هاوسەنگی لە نێوان هەرێمەکاندا بەتایبەت سەبارەت عێراق و هەرێمی کوردستان لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان، هێزی سەربازی، ئابوورییەوە زۆر گرنگ و پێویستە. فاکتەرێکی بەهێز دەبێت بۆ پاراستنی هەرێمی کوردستان و کەمکردنەوەی ئەم هەڕەشە و مەترسییانەی کە بە هۆی هەرێمەکانی ترەوە ڕووبەڕووی دەبێت.

(٦٢) لطيف مصطفى أمين، شروط نجاح الفيدرالية و مدى توفر تلك الشروط في الحالة العراقية، مجلة سردم العربي، العدد ١٣، مصدر سابق، ص ص ٥٦ — ٥٨.

(٦٣) لطيف مصطفى أمين، الفيدرالية و آفاق نجاحها في العراق، الطبعة الاولى، سردم للطباعة و نشر، السليمانية، ٢٠٠٧، ص ص ٩٣ — ٩٥.

### ٣– دیموکراسی تەوافقی – Consociational democracy:

بوونی سیستەمێکی فیدراڵی لە هەر وڵاتێکدا و رادەی سەرکەوتنی پەیوەیستە بە بوونی سیستەمێکی دیموکراسییەوە. بەواتایەکی تر سیستەمی فیدراڵی بە سروشت خۆی پێویستی بە سیستەمێکی دیموکراسی هەیە. لەبەر ئەمە فیدراڵییەتێکی سەرکەوتوو پێویستی بە دیموکراسییەتێکی سەرکەوتوو هەیە، دیموکراسییەتی سەرکەوتووی جێگریش بریتییە لەو دیموکراسییەتەی کە لە ئاستی داخوازی و پێداویستییەکانی کۆمەڵگا و وڵاتدا بێ و وەڵام دەری داوخوازییەکانی بێ و بگونجێ لەگەڵ هەلومەرج و باردۆخی وڵاتەکەی.(٦٤)

لەم چوارچێوەیەدا دەکرێت ئاماژە بە دوو شێوازی دیموکراسی بکەین کە ئێستا بە شێویەکی بەربڵاوبوونیان هەیە لە جیهاندا ئەویش دیموکراسییەتی زۆرینە و دیموکراسییەتی تەوافقی، جۆری یەکەمی دیموکراسییەت پێ لە سەر فەرمانڕەوایی زۆرینەدا دەگرێت، بەو مانایەی ئەوەی زۆرینەی دەنگەکان بە دەست دەهێنێ دەسەڵات دەگرنە دەست و حکوومەت پێك دەهێنن و ئەوانی دیکەش دەچنە خانەی ئۆپۆزسیۆنەوە و رۆڵی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی دەگێرن.(٦٥) لێرەدا بۆ پراکتیزەکردنی راستەقینەی سیستەمی دیموکراسییەتی زۆرینە کۆمەڵێك مەرج و پێوەری تایبەتی پێویستن کە دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە:

أ– ئەم جۆرە سیستەمە زۆر جار لەو وڵاتانە دا ئامادەیە کە لە رووی کلتوورییەوە هاوشێوەن و لە رووی ئیتنی و مەزهەبی و تایفییەوە جیاوازی و ناکۆکییان تێدا نییە و کێشەو گرفتەکانی پەیوەست بەم مەسەلەیە زۆر لە مێژە چارەسەرکراون.

ب– ئەو پارت و هێزە سیاسییانەی کە ئامادەن و بوونیان هەیە، پارت و حیزبی سەرتاسەری هەموو وڵاتن، لە ناو هێزە جیاوازەکاندا و لە ناو هەموو بەشەکانی وڵاتدا ئامادەن، بە واتایەکی تر حزبێك نین کە رەنگدانەوەی ویست و بەرژەوەندنی و تێڕوانین و بۆچوونی بەشێکی وڵاتەکە بێت، یاخود بە ناوی گروپێکی ئەتنی و کلتووری تایبەتەوە قسە بکات و هەوڵی سەپاندنی نەتەوەیەك یاخود تایەفەیەك بە سەر ئەوانی تر دا بدات.

ج– لە نێوان پارت و هێزە سیاسییەکاندا، جیاوازی ریشەیی و گەورە و بنەڕەتی و قوڵی نییە و هێز و لایەنە سیاسییەکان لە سەر پرەنسیپ و شتە گشتی و ستراتیژییەکان لەگەڵ یەکتر

(٦٤) لیام اندرسن وغاریث ستانسفیلد، مصدر سابق، ص ص ٣٦٦ – ٣٦٧.

(٦٥) لطيف مصطفي أمين، الفيدرالية و آفاق نجاحها...، ص ص ٧٨ – ٧٩.



دا رێکن، یان هاودەنگن، ئەوە نییە یەکێکیان باوەڕی بە علمانییەت هەبێ و ئەوی دیکە هەوڵی تێکەڵ کردنی دین و سیاسەت بدات، یاخود بە دەرچوونی لایەنێك بارودۆخی وڵات بە شێوەیەك ئاراستە بکات کە کاریگەرییەکی بنەڕەتی و بنچینەیی بە سەر دا بهێنێت.(٦٦)

د– ئەم شێوازە دیموکراسییەتە لەو وڵاتانەدا پراکتیزە دەکرێت کە هاوکێشەی زۆرینە و کەمینە لە بەردەم ئەگەری بەردەوامی گۆڕانکاری دایە، بەو مانایە ئۆپۆزسیۆنی سیاسی یاخود ئەو کەمینەی لە دەرەوەی دەسەڵاتە، دەرفەتی بوونی بە زۆرینە و وەرگرتنی دەسەڵاتی هەیە و لە هەمانکاتدا ئەوەی لە دەسەڵات ئەگەری بە کەمینە بوونی هەیە، بە کورتی فەرمانڕەوایی کردنی لەو وڵاتەدا، لە سەر گریمانی گۆڕینی بەردەوامی هاوکێشەی زۆرینە و کەمینەی دارێژراوە.(٦٧)

هەموو ئەم مەرج و پێوەرانەی سەرەوە وا دەکەن کە سیستەمی دیموکراسی زۆرینە سەکەوتوو بێ و کۆمەڵگەش تووشی هیچ جۆرە گرفت و کێشە و هەڕەشەیەك نابێ، لە هەموویان گرنگتر هیچ ترس و گومان و نیگەرانییەك لە لای ئۆپۆزسیۆن و گروپە سیاسییەکان دروست نابێ بەوەی لایەنی براوە رێرەو و ئاراستەی کۆمەڵگا و دەوڵەت بە ئاراستەیەك بەرێت کە لەگەڵ ویست و خواست و پێدراوە فیکری و ئایدۆلۆجیای ئەوانە ناکۆك و هاودژ بێت، ئاشکراترین شێوازی ئەم دیموکراسییەش دەتوانین لە ئەمەریکا و بەریتانیا دا ببینین.(٦٨)

لەو وڵاتانەدا گرنگ نییە کام لایەنە و حیزب دەباتەوە، چونکە لە سەر پرەنسیپە گشتییەکان رێکن و بە دەرچوونی لایەنێك هیچ جۆرە هەڕەش و مەترسی بە سەر لایەنە سیاسی و جۆراوجۆرەکان دروست نابێ، بەڵام لە وڵاتێکدا ئەگەر ئەم مەرج و پێوەرانەی سەرەوەی تێیدا نەبێ، وڵاتێکی ئاڵۆز بێ لە رووی ئەتنی، دینی، تایفی و مەزهەبییەوە، ئەم جیاوازیانەش لە فۆرمی حیزب و دەزگا و ویستی تایبەتدا بەرجەستە بوون. لەم جۆرە وڵاتانەدا هەنگاوی یەکەم بۆ پاراستنی بەرەژەوەندی هەموو پێکهاتە و گروپە جیاوازەکان دەست بەردار بوونە لە دیموکراسی زۆرینە و گرتنە بەری دیموکراسی تەوافقییە.

(٦٦) مەریوان وریا قانع، دیموکراسییەت و عێراق و سیستانی، رۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە (١٥٣)، ٢٠٠٣/١٢/١٠.

(٦٧) آرنت ليبهارت، الديموقراطية التوافقية في مجتمع متعدد، ترجمة: حسني زينة، الطبعة الاولى، الفرات للنشر و توزيع، بغداد، ٢٠٠٦، ص ٥٤.

(٦٨) آرنت ليبهارت، مصدر سابق، ص ص ١٧٠ – ١٧١.

لەم رووەوە ستراتیژییەتی دیموکراسییەتی تەوافقی بریتییە لە بەڕێوەبردنی ناکۆکی و جیاوازییەکان و هەروەها کێشەکان لە رێی هاوکاری و هەماهەنگییەوە لە نێوان گشت گروپە سیاسییەکاندا، لە جێگای ململانێ و دەرکردنی بڕیارەکان بە شێویەکی زۆرینە [٦٩]، ئەمەش لە رێ چوار بنەما و پرەنسیپی سەرەکییەوە کە بە تایبەتمەندی و رەگەزە بنچینییەکانی دیموکراسییەتی تەوافقی دادەنرێن و دەکرێ لەم چوار خاڵەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە:

**یەکەم - هاوپەیمانییەتێکی بنکە فراوان:**

بەڕێوەبردنی وڵات لە رێگەی دروستکردنی حکوومەتێکی ئیئتیلاف و هاوپەیمانییەتێکی بنکە فراوانەوە کە هەموو پارت و لایەنی سیاسی و دینی و تایفی بگرێتە خۆ و رەنگدانەوەی تێڕوانین و بەرژەوەندی هەموو چین و توێژە گرنگەکانی کۆمەڵگای فرە رەنگ بێت، ئەمە هەنگاوی یەکەمی دوورخستنەوەی فەرمانڕەوایی زۆرینەیە، بەو مانایەی لە کۆمەڵگای فرە رەنگ و فرە پێکهاتەدا کە خاوەن جیاوازی ئەتنی، کلتووری، دینی تا رادەیەك ناکۆك و هاودژن لەگەڵ یەکتردا، پراکتیزەکردنی دیموکراسییەتی زۆرینەی وڵات، حکوومەت و سیستەمی سیاسی رووبەڕووی ململانێ و ناسەقامگیری سیاسی و ململانێ دەکات.[٧٠]

**دووەم - ڤیتۆی (المتبادل):**

بەشداریکردنی هەموو گروپ و هێز لایەنە سیاسییەکان لە دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵیدا هەنگاوێکی گرنگە بۆ گروپەکان و ئەو نەتەوانەی لە رووی ژمارەوە کەمینەن، بەڵام ئەم پرەنسیپە بە تەنیا پارێزەرێکی رەها (مطلق) نییە لەبەر ئەوەی هەندێ جار بە هۆی هاوکێشەی زۆرینەوە بڕیارێك دەردەچێ و دژی بەرژەوەندییەکانییەتی، تەنانەت کە بەشدارە لە دەسەڵاتی سیاسیدا ناتوانرێ رێ لێ بگرێ، لەم حاڵەتەدا دەبێ مافی ڤیتۆی هەبێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، مەبەستی سەرەکیش لەم ڤیتۆیە بریتییە لەوەی هەر گروپێك و هەرێمێك بتوانێ بە باشترین شێوە بەرگری لە کیانەکەی خۆی بکات و بەرژەوندییەکانی خۆی بپارێزێ بە شێوەیەك هیچ هەڕەشەیەکی لە سەر نەمێنێ.[٧١]

(٦٩) آرنت لیبهارت ، مصدر سابق، ص ١٧.

(٧٠) مصدر نفسه، ص ص، ٤٧-٦٤

(٧١) المصدر نفسه، ص ص ٤٧ — ٦٤.



ارنت لیبهارت ئەو بۆچوونەی بە لاواز دەزانێت کە پێیوایە، مافی ڤیتۆ بە دەست ئەو نەتەوانەی کە لە رووی ژمارەوە کەمن، هەڕەشە لە دەسەڵاتی زۆرینە و حکوومەتی ئیئتیلاف دەکات لە بەر چەند فاکتەرێك:

١- ئەم ڤیتۆیە تەنیا بۆ کەمینە نییە، بەڵکو زۆرینەش دەگرێتەوە هەموو چینەکان و هەرێمەکان دەتوانن بە کاری بهێنن.

٢- رەتکردنەوەی بڕیارێك و ڤیتۆکردن لە لایەن گروپێك یاخود نەتەوەیەك کە لە روویی ژمارەوە کەمینەیە بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خویەتی، واتە گرووپەکان شتەك ڤیتۆ ناکەن ئەگەر هەڕەشە نەبێ لە سەریان.

٣- بوونی گرەنتی ڤیتۆ وەك چەك وایە، وا دەکات گروپەکان و ئەوانەی کەمینەن لە رووی ژمارەی دانیشتووانەوە هەست بە ئاسایش و ئاسوودەیی بکەن و هەڕەشەی زۆرینەیان لە سەر نەمێنێت هەوڵ ئەدەن بە باشترین شێوە خۆیان بپارێزێن.

٤- هەموو لایەنێك و گروپە سیاسی و تایفی و مەزهەبییەکان ئەو ئەگەرەیان لە بەر چاوە کە زیادەڕەوی کردن لە بەکارهێنانی ڤیتۆ، لەوانەیە کۆمەڵگا و وڵات بە ئاراستەی تەنگژە و قەیرانێکی گەورە ببات و ئەمەش وا دەکات یاخود وا لە هەرێمەکان دەکات بگەنە ئەو قەناعەتەی لە پێناوی دوورخستنەوەی وڵات لە تەنگەژە و قەیران و لە بەرچاو گرتنی بەرژەوەندی گشتی واز لە بەشێك لە بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان بهێنن. لە هەندێ وڵات وەك سویسرا و نیوزلەندا ڤیتۆی عورفی هەیە، لە بەلجیکیا پرەنسیپێکی نافەرمییە، بەڵام دانپێنانێکی دەستووری هەیە، ئەو بڕیارانەی کاریگەری سیاسییان هەیە بۆ سەر بەرژەوەندی کلتووری — فەرهەنگی و سیاسی، هەردوو گروپ فەرەنسی زمان و هۆڵەندی زمان دەرناچێ مەگەر بە رەزامەندی نوێنەرەکانیان نەبێ و هەروەها هەرێمی فیدراڵی کیوبك لە کەنەدا خاوەن ماڵی ڤیتۆیە سەبارەت بە هەموو ئەو بڕیارانەی پەیوەندیان بە هەرێمی کیوبکەوە هەیە.[٧٢]

**سێیەم— رێژەیی:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە پرەسیپە کانی خۆ لادان و دەرچوون لە فەرمانڕەوایی زۆرینە، ئەم پرەسیپە پەیوەندی پتەوی بە پرەنسیپی هاوپەیمانی و ئیئتیلافی بەرفراوانەوە هەیە، کە ئەویش

(٧٢) مصدر نفسه، ص ص ٦٥ — ٦٦.

بریتییە لە دابەشکردنی دەسەڵات لە حکوومەتی ناوەندیدا بە هاوبەشی و بە شێوەیەك لەگەڵ ڕێژەی هەر پێکهاتەیەك بگونجێ، هەروەها دابەشکردنی وەزارەتەکان و بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان و نفوز و دەسەڵاتەکانی حکوومەتی ناوەندی بە شێوەیەکی ڕێژەیی نەك بە پێی فەرمانڕەوایی زۆرینە، ئەمەش ناکرێ ئەگەر بە سازش کردن نەبێ لە سەر بڕیارەکان بە شێوەیەك هەموو پێکهاتەیەك ڕازی بکات.

**چوارەم - سەربەخۆی هەرێمەکان:**

خاڵی چوارەم بۆ خۆ لادان لە فەرمانڕەوایی زۆرینە، سەربەخۆی هەرێمەکان کە هەر پێکهاتەیەك لە چوارچێوەی جوگرافیای خۆیدا فەرمانڕەوایی خۆی بکات و کاروباری خۆی بەڕێوە ببات، باشترین شێوازی ئەم سیستەمەش وەك لە پێشدا گوتمان سیستەمێکی فیدراڵییە و فیدراڵییەت ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دیموکراسییەتی تەوافقیدا.[٧٣]

مەبەست و ئامانجی هەرە سەرەکی دیموکراسییەتی تەوافقی لە هەمووی ئەو پرەنسیپانەی کە باس کران بریتییە لە ڕاگرتنی باڵانس و هاوسەنگی هێز لە نێوان هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا. بەو مانایە ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگا و وڵاتانەی فرە ئەتنی و کلتوور و زمان و ئاینییە، ناکرێت لە ڕێگەی دیموکراسییەتی زۆرینەوە فەرمانڕەوایی بکرێت. چونکە وڵات بە ئاراستەی ململانێ و ناکۆکی و شەڕی ناوخۆیی دەبات.[٧٤] بۆیە پێکەوە ژیانێکی دیموکراسی و ئاشتییانە باشترە لە دیموکراسییەتێکی ناجێگیر و پڕ ململانێ کە شەڕ و ئاژاوە و ناسەقامگیری لێ دەکەوێتەوە.[٧٥]

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەر بێینە سەر بارودۆخی عێراق و بمانەوێت پڕۆسەی بە فیدراڵی کردن بچەسپێ و سەرکەوتوو بێ، و بتوانێ بە باشترین شێوە بەرژەوەندی هەموو پێکهاتەکان، لەوانەش نەتەوەی کورد بپارێزێ زۆر پێویستە پشت ئەستوور بێ بە دیموکراسییەتی تەوافقی، چونکە لەم وڵاتەدا هیچ جۆرە مەرجێکی دیموکراسییەتی زۆرینەی تێدا نییە، بە پێچەوانەوە بە دەیان پارت و گروپ و لایەنی سیاسی هەن و زۆربەیان لە سەر بنەمای ئەتنی و دینی و تایفی

(٧٣) مصدر نفسه، ص ص ٦٥ — ٧٢.

(٧٤) فالح عبدالجبار، متضادات الدستور...، ص ٨٥.

(٧٥) آرنت ليبهارت ، مصدر سابق، ص ص ٨٢ — ٩٠.



دروستبوونە و حیزبی ناوچەیێن نەك سەرتاسەری. هەر دوو پڕۆسەی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ ئەم ڕاستییەی سەلماندووە و عێراقیش بە سەر سێ ناوچەی لێك جیاوازدا دابەش کردووە. بەشی هەرە زوری هاوڵاتیانی عێراقی دەنگیان بە حیزب و لایەنی نەتەوەی و تایەفی داوە و ژمارەیەکی زور کەم لە هاوڵاتیان دەنگی خۆیان بۆ پارتی نا ئایینی و نا نەتەوەیان دا.[٧٦] (بڕوانە: خشتە ژمارە (١٤) و (١٥)).

لە بەر ئەمە هەژموونی هەر یەك لەم پێکهاتانە یاخود نەتەوەیەك بە تەنیا بە سەر دەسەڵاتی حکوومەتی فیدراڵی، تەنگەژە و قەیرانی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، وڵاتەکەش پەلکێشی شەڕێکی خوێناوی دەکەن، قۆرخ کردنی دەسەڵات بە درێژایی سەدەیەك لە لایەن عەرەبی سوونەوە بە تەواوەتی ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە، لە بەر ئەوە هەلومەرج و بارودۆخی عێراق وا دەخوازێ دوور بخرێتەوە لەو دیموکراسییەتەی هەموو دەسەڵاتەکان دەخاتە ژێر ڕکێفی نەتەوەیێك و ئەوانی دیکە دەخاتە پەراوێزەوە، بەتایبەت ئەگەر ئەو خاڵەش لە بەر چاو بگرێن کە هاوکێشەی کەمینە و زۆرینە لە عێراقدا هاوکێشەیەکی زۆر ئاڵۆز و مەترسی دارە، سەبارەت بە کورد، هاوکێشەکە بە جۆرێکە کە لایەنی عەرەبی بە گشتی بەرامبەر بە کورد لە بەردەم ئەگەری بەردەوامی بە دەست هێنانی زۆرینەی دەنگەکانن ولایەنی کوردیش هیچ کاتێك لە چوارچێوەی عێراقدا ناتوانێت ببێتە زۆرینە.[٧٧]

بۆیە پەنا بردن بۆ بنەما و پرەنسیپەکانی دیموکراسییەتی تەوافقی و هاوکات لەگەڵ ڕەچاو کردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و هەروەها بوونی ڤیتۆ لە هەندێك حاڵەتی پەیوەندیدار بەکار و باری دەرەوە — بەرگری دارایی، گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی هەرێمەکان و بە تایبەت سەبارەت بە کوردەوە [٧٨]، بەمە کورد دەتوانێ بە باشترین شێوە بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ئەگەری ڕێکەوتنی لایەنە عەرەبییە عێراقییەکان لەگەل یەکتر لە لایەك و ڕێك کەوتنیان لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکان بپارێزێ، ئەوەی لێرەدا زیاتر جێگای مەترسی و نیگەرانییەتی دەستووری هەمیشەیی عێراق ئەم هاوکیشەیەی بە کراوەی هێشتووە.

(٧٦) پیتر و. گالبریت، کۆتایی عێراق...، ل ٩.

(٧٧) بڕوانە: لطيف مصطفي امين، الفيدرالية و آفاق نجاحها...، ص ١٠٥.

(٧٨) هەمان سەرچاوە، ل ١٣٣.

هەروەك لە هەر دوو خشتەی (١٥ و١٦)دا دەردەکەوێت. لە هەردوو پروسەی هەڵبژاردن لە عێراقد ا (هەڵبژاردنەکانی ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ و ١٥ کانوونی یەکەمی٢٠٠٥) بەشی هەرە زوری دەنگدەران دەنگیان بە لیستی ئەتنی و تایفی و ئایینی داوە کە دیارترینی ئەو لیستانەش بریتین لە لیستی هاوپەیمانیەتی یەکگرتووی عیراق کە بە لیستی شیعەکان ناسراوە، لیستی هاوپەیمانی کوردستان و بەرەی تەوافقی عیراقی(سونەی عەرەب). ئەوانەی خۆییان بە لیستی نا ئایینی و نا نەتەوەیان دە ناساند لەوانەش لیستی نیشتیمانی(العراقیە) بە سەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی رێژەیەکی زور کەمی دەنگیان بە دەست هێنا بە تایبەت لە پرۆسەی دووەمی هەڵبژارتنەکاندا کە ئەو کات عەرەبی سونە بە لیستی (بەرەی تەوافقی) بەشدارییان تێیدا کرد.

| ناوی لیست | رێژەی دەنگ | ژمارەی کورسی |
|---|---|---|
| لیستی هاوپەیمانییەتی یەکگرتووی عێراق | ٤٨,١٨٪ | ١٤٠ |
| لیستی هاوپەیمانی کوردستان | ٧٢, ٢٥ ٪ | ٧٥ |
| لیستی(العراقیە) | ٪١٣, ٨٣ | ٤٠ |
| لیستی العراقیون | ٪١ ,٧٨ | ٥ |
| لیستی بەرەی تركومانی | ٪١ ,١٠ | ٣ |
| كادرو هەڵبژاردە نیشتیمانییە بێلایەنەكان | ٪٠ ,٨٢ | ٣ |
| یەكێتی گەل (حزبی شیوعی) | ٪٠ ,٧١ | ٢ |
| كۆمەڵی ئیسلامی كوردستان | ٪٠ ,٥١ | ٢ |
| لیستی رێكخراوی كاری ئسلامی لە عێراق | ٪٠ ,٤٣ | ٢ |
| هاوپەیمانێتی نیشتیمانی دیموكراتی | ٪٠ ,٣٦ | ١ |
| كوتلەی(المصالحە والتحریر) | | ١ |
| لیستی رافیدەینی نیشتیمانی مەسیحی | | ١ |
| كۆی هەمووی | ٪١٠٠ | ٢٧٥ |

**خشتەی ژمارە (١٥)، ئەو لیستانەی بەرزترین رێژەی دەنگیان بەدەستهێنا لە هەڵبژاردنەکانی ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی عێراق.** (٧٩)

(٧٩) بروانە: ماڵپەری کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان: www.ieciraq.org.



| ناوی قەوارەی سیاسی | کۆی ژمارەی کورسی |
|---|---|
| لیستی هاوپەیمانییەتی یەکگرتووی عێراق | ١٢٨ |
| لیستی هاوپەیمانی کوردستان | ٥٣ |
| بەرەی تەوافقی عێراقی | ٤٤ |
| لیستی نیشتیمانی(العراقیە) | ٢٥ |
| بەرەی عێراقی بۆ دانوستاندنی نیشتیمانی | ١١ |
| یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان | ٥ |
| کوتلەی(المصالحە والتحریر) | ٣ |
| الرسالیون | ٢ |
| لیستی بەرەی ترکومانی | ١ |
| لیستی رافیدەین | ١ |
| لیستی میسل ئالوسی بۆ نەتەوەی عێراق | ١ |
| بزووتنەوەی ئێزدی بۆ چاکسازی پێشکەوتن | ١ |
| کۆ | ٢٧٥ |

**خشتەی ژمارە (١٦)، ئەو لیستانەی بەزترین رێژەی دەنگیان بە دەست هێنا لە هەڵبژاردنەکانی ١٥ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ بۆ ئەنجومەنی نشتیمانی عێراق.** (٨٠)

(٨٠) بڕوانە: کۆمیسیۆنی باڵای سەربخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراق، راپورتێك بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران، سێ پرۆسەی هەڵبژاردنی مێژوویی لە سالێك سەرچاوەی پێشوون ل ل٧٠-٩٢ ماڵپەری کۆمیسیۆنی باڵای هەلبژاردنەکان: www.ieciraq.org یا نتائج انتخابات عراقیة من ویكیبید؛ **http:ar.wikpedia.0rg/wiki**

## لقی چوارەم: گرفتەکانی بەردەم بە فیدرالی کردنی عێراق:

### أ – گرفتە ناوخۆییەکان:

عێراق تەنها دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و مەزهەب نییە لە جیهاندا، بەڵکو زیاتر لە (١٥٠) دەوڵەتی فرەنەتەوە و فرەپێکهاتە هەن، هەر بۆیە گرفتی عێراق ئەوەی نییە کە لە دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و پێکهاتە و مەزهەبە، بەڵکو گرفتەکە لە چۆنییەتی رێکخستنی و بەڕێوەبردنی ئەم فرەییە دایە. عێراق لەو کاتەوە دامەزراوە بە شێوەیەکی زۆرەملێ و لە سەر بنەمای چەوساندن و سەرکوت کردن و پەراوێزکردنی زۆرینەی پێکهاتەکانی بە تایبەت کورد و عەرەبی شیعە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.[٨١]

لە دوای دارمانی رژێمی بەعس (٩نیسانی ٢٠٠٣)، هەلومەرج و بارودۆخێکی نوێ هاتە کایەوە، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی سیاسی عێراق دەرفەتێکی لەبار درایە دەست پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق، بۆ ئەوەی لە سەر بنەمای دیموکراسییەت و رێزگرتن لە مافەکانی یەکتر، چارەسەری گرفتەکانی ئەم وڵاتە بکەن و کۆتایی بە هەموو ئەو تەنگەژە و قەیرانانە بهێنن کە عێراق بە درێژایی چەندین ساڵە تێیکەوتووە، بەڵام بەشێکی زۆر لایەنی عەرەبی عێراقی بە هاندان و پاڵپشتی دەوڵەتە دراوسێ و عەرەبییەکان وەك (ترکیا، عربستان سعودی و سوریا)بە پاساو و بیانووی جۆراو جۆرەوە چوونەتە ناو بەرەی دژایەتی کردنی پرۆسەی سیاسی و پیادە کردنی سیستەمی فیدراڵی. بەرهەڵستی زۆربەی هێز و لایەنە عەرەبییەکان بەتایبەت عەرەبە سوننەکان هەڵقوڵاوی کۆمەڵێك فاکتەر و رەهەندی جۆراو جۆرن کە دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکرێتەوە :

١- عەرەبە سوونەکان خۆیان بە فەرمانڕەوای سروشتی عێراق دەزانن و پێش گوڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق تەواوی دەسەڵات و داهاتی ئەم وڵاتە لە ژێر دەستیاندا بووە، بەڵام هاوکات لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی عێراق هاوکێشە سیاسییەکان گۆڕانکاری تێکەوت و ئەو دەسەڵاتەیان نەما، بۆیە ئەستەمە توانای تێگەیشتنی ئەو بارودۆخەیان هەبێ.[٨٢]

---

(٨١) د. مهدی جابر مهدی، چاوپێکەوتن لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦١٧)، هەولێر، ٢٠٠٧/١/٨، ل ٢٨.

(٨٢) ليام اندرسن وغاريث ستانسفيلد ، مصدر سابق، ص ٣٦١.



٢- ناسیۆنالیستەکانی عەرەب کە زۆربەیان عەرەبی سوونەن خۆیان بە هەڵگری دروشمی ناسنامەی عروبەی عێراق دەزانن بۆیە لە بەرامبەر دەستووری عێراق کە ئەو وڵاتەی بە وڵاتێکی فرەنەتەوەیی و مەزهەب و ئاین و ئاینزا پێناسەی کردووە نیگەرانن، وای بۆدەچن ئەمە سەرەتای دوورخستنەوەی عێراقە لە جیهانی عەرەبی سوونە کە خۆیان تێیدا زۆرینەن. بۆیە جەخت دەکەنە سەر ئەوەی پێویستە دەستوور ئەم خاڵەی تێدا جیگیر بێ کە عێراق بە خاك و گەل بە بەشێك لە نیشتیمانی عەرەب دابنرێ.

هەروەها بەرهەڵستی و دژایەتی زۆربەی عەرەبە سونەکان بو فیدراڵییەت لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە پێیان وایە دابەشکردنی داهات و دانپێدانان بە واقیعی فرەئەتنی و فرە ناسنامەیی دەبێتە هۆی هەڵوەشانی دەوڵەتی ناوەندی عێراق.[٨٣] و ئەو وڵاتە بەرەو دابەش بوون و لە بەر یەك هەڵوەشاندنەوە دەچێت.

٣- گوڕانکارییەکانی (٩)ی نیسانی ٢٠٠٣ لە عێراق، حکوومەتێکی تازەی هێناوەتە ئاراوە کە بە هەموو پێوەرەکانی دیموکراسی، حکوومەتێکە لە رێگەی سندووقەکانی دەنگ دانەوە ئەم دەسەڵاتەی وەرگرتووە، ئەمەش عێراق و ناوچەکەی خستۆتە بەردەم هاوکێشەیەکی نوێ، ئەم هاوکێشەیە نوێیەش بریتییە لە هاتنە سەرکاری دەسەڵاتێك کە زۆرینەی لە عەرەبە شیعەکان پێك دێت. کە تا رادەیەکی زۆر هاوسۆز و گوێڕایەڵی ئێرانن و لە زۆر حاڵەتیشدا خواستەکانی بۆ دەهێنەدی، بۆیە سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دەسەڵاتە لە عێراق، تەواوی جیهانی عەرەبی سوونەی نیگەران کردووە و وای لێ کردووە هانی عەرەبی سوونەی عێراق بدەن بۆ دژایەتی کردنی سەرجەم پرۆسە سیاسی عێراق.[٨٤]

---

(٨٣) فالح عبدالجبار، مصدر سابق، ص ص ٧٧ – ٧٨.

(٨٤) رێکەوت اسماعیل ابراهیم، بۆچی ئەمەریکا لە بارودۆخی عێراق نیگەرانە، گۆڤاری نۆڤین، وەرزانەیـەکی فیکری و روناکبیرییە، مەکتەبی (ی ن ك) دەری دەکات، ژمارە (١٠)، نیسانی ٢٠٠٧، سلێمانی، ل ١٥٤.

## ب: گرفته دەرەكییەكان:

### ١- توركیا:

توركیا یەكێكە لەو دەوڵەتە هەرێمییانەی زۆر بە توندی دژایەتی و بەرهەڵستی سەرهەڵدانی هەر جۆرە قەوارەیەكی كوردی كە هەنگاو بەرەو سەربەخۆی بهاوێژی لە كوردستانی عێراق دەكات. بە هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی خۆی لێك دەداتەوە و ڕەتی دەكاتەوە.[٨٥] و لە هەوڵێكی بەردەوام دایە بۆ ئەوەی تەگەرەو كۆسپ بخاتە بەردەم پێشڤەچوونی پرۆسەی سیاسی هەرێمی كوردستان.

پێش گۆڕانكارییەكانی ٢٠٠٣ لە عێراق، تێڕوانین و و پێشبینییەكانی ئەو وڵاتە بەو ئاراستەیە بۆ كە لە دوای هاتنە سەر كاری حكوومەتێكی نوێ و لادانی ڕژێمی بەعس، دەسەڵاتی حكوومەتی ناوەندی دەگەڕێتەوە هەرێمی كوردستان، ئەمەش ئەو دەرفەتەی پێ دەبەخشێ كە بە هاوكاری هەماهەنگی لەگەڵ ئەم حكوومەتە، دیفاكتۆی هەرێمی كوردستان، بەرەو لاوازی و پشتگوێ خستن و لاوازی ببات، بەڵام هەنگاوەكانی دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس تەواو بە پێچەوانەی ستراتیژی و بۆچوون و مەزەندەكانی ئەو وڵاتە بووە. دەرچوونی یاسایی كاتی بۆ قۆناغی ڤەگوهێزەر(ئینتقالی)، پاشانیش نووسینەوەی دەستووری هەمیشەی، سەركردایەتی سیاسی كورد توانی بەشێكی گرنگی مافەكانی خۆی تێدا بچەسپێنێ و دەقنووس بكات كە زۆربەیان هێڵی سووربوون بۆ توركیا، وەك چەسپاندنی سیستەمی فیدراڵی، دانانی میكانیزمێكی یاسایی، سیاسی بۆ چارەسەركردنی پرسی كەركوك، دانپێنان بە حكوومەتی هەرێمی كوردستان و مانەوەی هێزی پێشمەرگە.[٨٦]

ئەم بە یاسایی بوون و بە فەرمی بوونەی دیفاكتۆی هەرێمی كوردستان و ڕەوایی و شەرعییەت وەرگرتنە لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە، وای كرد توركیا و دەوڵەتە هەرێمییەكان بە ترس و گومانێكی زۆرەوە بڕواننە پرۆسە و پێشهاتە سیاسییەكانی عێراق، تەنانەت

(٨٥) بڕوانە: هێوركردنەوەی دڵەڕاوكێكانی توركیا لە بارەی ئاواتەكانی كوردەوە، ڕاپۆرتی (٣٥)ی Criss Group)لە، ٢٠٠٥/١/٢٦ : http://www.crisisgroup.org/nome/index.cfm?id=47828

(٨٦) بڕوانە: بەندەكانی (١، ٥٨، ٥٣) قانون ادارة الدولة العراقیة للمرحلة الانتقالیة؛ هەروەها بەندەكانی(١، ١٤٠، ١١٧) لە: دەستووری هەمیشەیی عێراق.



هەڵوێست و كاردانەوەی هاودژ لە هەمبەری وەربگرن، پێداچوونەوەیەكی تەواو لە سیاسەت و ستراتیژی خۆیان بە ئاراستەی گوشار خستنە سەر هەرێمی كوردستان و لاواز كردنیدا بكەن.

هەر بۆیەش لە سەروبەندی دەرچوونی یاسای كاتی (جەمیل چیچیك) وەزیری داد و وتەبێژی بە ناوی حكوومەتی توركیا، دژایەتی حكوومەتەكەی بۆ یاساكە دەربڕی و ڕایگەیاند:" لە بەرامبەر یاسای كاتی عێراقدا ئاسوودە نین، ئەم یاسایە ترس و هەڕەشەیان لە سەر زیاتر دەكات و ئەو دەقە یاسایی و دەستوورییە ئاشتی هەمیشەیی لە عێراقدا دەستەبەر ناكات و سەركردایەتی قۆناغێكی درێژ خایەن لە ئاژاوە و ناسەقامگیری دەكات ".[٨٧]

بە هەمان ئاراستە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی توركیا لە كاتی ڕاگەیاندی دەستووری هەمیشەیی دووپاتی كردەوە كە :"وڵاتەكەی درێژە بە سیاسەتی دان نەنان بە هەرێمی كوردستانی عێراق دەدات و ئەوەشی جەخت كردەوە كە لە دیدی ئەوان دەڤەرێك یاخود ناوچەیەك نییە بە ناوی كوردستان ".[٨٨]

دژایەتی و بەرهەڵستی توركیا بۆ فیدراڵییەتی هەرێمی كوردستان و پرۆسەی بە فیدراڵی كرودنی عێراق، هەڵقوڵاوی فاكتەر و هۆكاری جۆراوجۆرە، لە لایەكەوە ئەو وڵاتە پێیوایە هەر جۆرە دابەش بوونێك لە عێراقدا دەبێتە هۆی بە هێزبوونی دەسەڵاتی هەرێمی كوردستان و پێگەی سیاسی كوردستان لە هاوكێشەی سیاسییەكانی عێراق و دەڤەرەكە بەهێزتر و قایمتر دەكات، ئەمەش پێچەوانەی ستراتیژی و سیاسەتی ئەو وڵاتەیە كە دەیەوێت بە دامەزراندنی دەسەڵاتێكی سەنتراڵیزمی توند لە بەغدا، كیانی هەرێمی كوردستان بەرەو پەراوێزی و نەمان ببات، (ئیلنۆر چەڤیگ)، ڕۆژنامە نووسی تورك جەخت لە سەر ئەم سیاسییەتەی توركیا دەكاتەوە و دەڵێت: " توركیا چاوەڕێی ئەوەیە حكوومەتێكی ناوەندی بەهێز لە بەغدا بهێنێتە كایەوە و دەسەڵاتی بگەڕێتەوە هەرێمی كوردستان بە بێ ڕەچاوكردنی ئەوەی فەرمانڕەوایەكەی چۆنە و كێ بەڕێوەی دەبات، گرنگ ئەوەیە بتوانرێت بە سەر كوردەكاندا زاڵ بێت و ڕێ بگرێ لەوەی خۆی بەڕێوە ببات و بەرەو پێشەوە بچێت ".[٨٩]

لە لایەكی ترەوە توركیا نیگەرانە لەوەی فۆرمول یاخود شێوازی فیدراڵییەتی هەرێمی كوردستان لە عێراق ببێتە نموونە و نەخشە ڕێگایەك بۆ كوردەكانی ئەو وڵاتە و هانیان بدەت كە خوازیاری

(٨٧) بڕوانە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٤٧٥)، ٢٠٠٤/٣/١١، ل ٦.

(٨٨) ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە ١٠٩٦، یەكشەممە، ٢٠٠٥/٩/٤.

(٨٩) ئیلنۆر چەڤیگ، كاتی ئەوە هاتووە توركیا بەرامبەر كوردەكانی عێراق بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٤٠) ٢٠٠٥/٦/١٩، هەولێر، ل ٤٠.

هەمان سیستەم بن بۆ چارەسەری پرسی کورد [٩٠]، بە واتایەکی تر ترس و نیگەرانییەکانی تورکیا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پێیوایە هەر جۆرە پێشڤەچوونێکی سیاسی و دیموکراسی لە هەرێمی کوردستان کاریگەری راستەوخۆی دەبێ بۆ سەر کوردەکانی باکووری کوردستان. کە تورکیا بە درێژایی سەدەیەکە سیاسەتی نکۆڵی کردن و چەوساندن و لە ناو بردنی لە هەمبەریان گرتۆتە بەر و دانی پێدانەناون. وەك نەتەوەیەکی خاوەن خاك و زمان و نیشتیمان و کلتووری تایبەت و بە درێژایی تەمەنی ئەو دەوڵەتە هەوڵی داوە لە رێگەی هێزی سەربازییەوە لە ناو نەتەوەی تورکدا بیان توێنیتەوە، هەر ئەمەش وای کرد تورکیا هەر جۆرە کیانێکی کوردی لە دەرەوەی سنووری خۆی رەت بکاتەوە [٩١] و دژی بوەستێ و تەگەری بخاتە بەردەمی، بەو بیانوویەی کە هەڕەشە لە یەکێتی خاکی ئەم ولاتە دەکات.

(چەنگیر شاندار) نووسەری بەناوبانگی تورك ئاماژە بەم خاڵە دەکات و پێیوایە کە : "دژایەتی کردنی ولاتەکەی بۆ سیستەمی فیدراڵی هەرێمی کوردستان و دابەشکردنی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بێ متمانەییەی کە تورکیا هەیەتی بەرامبەر بە کوردەکانی ولاتەکەی و ئامادە نەبوون بە دانپێنان بە مافە نەتەوەییەکانی، هەر ئەمەش وای کردووە، بچووکترین قسە یاخود باسکردن لە سەر سیستەمی فیدراڵی باشووری کوردستان، تورکیا تووشی سەرهێشە بکات، ئەگەر نا ئێستا زۆربەی دەوڵەتە دۆست و هاوپەیمانەکانی تورکیا خاوەن سیستەمی فیدراڵین، لەم رووەوە تورکیا هەرگیز گلەیی و دژایەتی خۆی بۆ سیستەمی سیاسی ئەم ولاتانە دەرنەبڕیوە. "[٩٢]

بە شێوەیەکی گشتی تورکیا لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ ستراتیژ و سیاسەتێکی دیاریکراو و تا رادەیەك نەگۆڕی گرتۆتە بەر لە هەمبەر هەرێمی کوردستان و عێراق، و لە چوارچێوەی ئەم ستراتیژییەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکان دەکات کە ئەویش بریتییە لە:

(٩٠) فیلیپس دیڤید، دەسەڵات دابەشکردن لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە (٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٧.

(٩١) ليام أندرسن و غاريث ستانسفيلد، مصدر سابق، ص ٣٩٩.

(٩٢) چەنگیز شاندار، بۆ ئێمەی تورك دژی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانین، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٥٥٢)، ٢٠٠٥/٩/١، هەولێر، ل ٣٧.



١- پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق، لەم سونگەیەوە تورکیا دژایەتی هەر جۆرە دابەشبوونێکی عێراق دەکات و هەر جۆرە دابەشبوونێکیش بە واتای کردنەوەی دەرگای دابەشبوونی دەوڵەتە دراوسێکانە، لەوانەش خودی تورکیا.

٢- رێگرتن لە دروستبوونی دەوڵەتی کوردی لە کوردستانی عێراق بەو پێیەی دەبێتە هۆی هاندەرێك بۆ کوردەکانی ولاتەکەی بۆ ئەوەی چاو لە براکانیان بکەن و داوای سەربەخۆی بکەن.

٣- داواکرنی هەرێمەکی ئۆتۆنۆمی بۆ تورکمانەکان. هەڵوەشاندنی دەوڵەتی عێراق، تورکیا هان دەدات کە داوای مافی تورکمانەکان بکات، مافی رۆشنبیری، سیاسی و کلتووری و دامەزراندنی ئۆتۆنۆمییەك بۆیان لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان.

٤- تورکیا هەوڵ ئەدات دەسەڵاتێکی توندی سنترالیزمی لە بەغدا دروست بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت دەسەڵات و هەژموونی خۆی بە سەر هەرێمی کوردستاندا بسەپێنێ، بەڵام لە هەمانکاتدا نایەوێت ئەم دەسەڵاتە ببێتە هەڕەشە بۆ دراوسێکانی.

٥- رێگرتن لەوەی ئێران ببێتە خاوەن پێگەیەکی بەهێز لە باشووری عێراقدا.[٩٣]

٦- داواکردنی ویلایەتی موسڵ و هەوڵ دان بۆ داگیرکردنی لە کاتی لە بەریەك هەڵوەشانی دەوڵەتی عێراق. [٩٤]

هەر لە چوارچێوەی ئەم سیاسەت و ستراتیژییەی سەرەوە دا بوو، کە کاتێك ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکی پڕۆژەیەکی نا پابەند سەبارەت بە دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی کوردی، سوونی و شیعی پەسەند کرد، تورکیا کەوتە جموجۆڵ و بزاڤێ سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازی گەورە کە لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوەدا واتا بە تەنها لە دوای (١٨ — ١٩) رۆژ لە دەرچوونی پڕۆژەکە قەیران و تەنگەژەیەکی گەورەی هێنایەوە لەگەڵ هەرێمی کوردستان و گوشار و هەڕەشەکانی بۆ دەستێوەردان لە کاروباری هەرێمی کوردستان بە بیانووی ڕاودونانی تەڤگەرا ڕزگاریخوازا کورد لە باکووری کوردستان (PKK)، هەڵکشانی گەورەی بە خۆیەوە بینی. [٩٥]

(٩٣) د. عبدالوهاب حميد رشيد، التحول الديمقراطية في العراق، الطبعة الاولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٦، ص ٤٩.

(٩٤) بڕوانە: کراهام فوللەرو ئەوانی تر، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٤٠-١٤٢.

(٩٥) لە ١٥/ ١٠ / ٢٠٠٧، تورکیا پڕۆژەیەکی خستە بەردەم پەرلەمانی ولاتەکەی بۆ بەزاندنی سنووری هەرێمی کوردستان، بە بیانووی راو دونانی چەکدارانی پەکەکە، پڕۆژەکە (٥٠٧) دەنگی هێنا لە بەرامبەردا ئەندام پەرلەمانەکانی کانی سەر بە حزبی کومەڵگای دیموکرات کە پارتەکی کوردی بووە بە(٢١) دەنگ

چاو دێرانی سیاسی و پسپۆڕانی شارەزا لە کاروباری تورکیا لەوانە (د. محمد نورەدین د.، مەمەد عەلی بیراند) پێیان وایە ئامانجی سەرەکی تورکیا لەم هەموو هەولانە مەبەستەکەی لاوازکردنی هەرێمی کوردستانە. لەم چوارچێوەیەدا د. (محمد نورەدین)، پسپۆڕ و شارەزا لە کاروباری سیاسی تورکیا پێی وا بوو کە " ئامانجی سەرەکی تورکیا لەو قەیرانەی کە لە ١٥ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧ دا هێنایەوە مەبەستی تورکیا پارتی کرێکارانی کوردستان نەبووە، بەڵکو مەبەستەکەی بریتییە لە لاوازکردنی هەرێمی کوردستان. ئەمەش لە پێناوی ڕێگرتن لە دروستبوونی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ ".[٩٦]

لە هەمان چوارچێوەدا، د. (مەمەد عەلی بیراند) ڕۆژنامەنووسی تورك لە بابەتێك کە لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧دا لە ڕۆژنامەی حریەتی تورکیا دا بڵاوی کردەوە جەختی کردە سەر ئەم

دژوەستان، بە پێی ئەم بڕیارە تورکیا بۆ ماوەی ساڵێك بۆی هەیە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە هەرێمی کوردستان ئەنجام بدات، ئەم پرۆژە بڕیارە هاوکات بوو لەگەڵ دەرچوونی پرۆژەی ناموڵزەمی ئەنجوومەنی پیران بۆ دابەشبوونی عێراق بۆ سێ هەرێمی فیدراڵی، هەروەها بە جینۆسساید ناسینی کوشتاری ئەرمەنییەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا، هەروەها نزیکبوونەوە لە پرۆسەی ریفراندۆمی کەرکوك، بە پشتبەستن بەم بڕیارە لە ١٦ ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ فڕۆکەجەنگییەکانی تورکیا سنووری هەرێمی کوردستانیان بەزاند کەتنە بردومانکردنی ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان دواتریش لە ٢١ی شوباتی٢٠٠٨ دا سوپای تورکیا سنووری هەرێمی کوردستانی بەزاند بۆ ماوەی (٩) ڕۆژ ئۆپەراسیۆنی سوپای تورکیا بەردەوام بوو، لەم هێرشەدا سوپای تورکیا ژێرخانی ئابووریی هەرێمی کوردستانی کرد بۆ ئامانجی خۆی. شایانی باسە تورکیا بە هۆی گوشاری زۆری نێودەوڵەتی و ئەورووپی، ئەمەریکی و سەرکردایەتی کورد لە ١ئاداری٢٠٠٨ هێزەکانی خۆی کشاندەوە بۆ ناو سنووری خۆی. بڕوانە:

البرلمان التركي يعطي الضوء الأخضر لعمل عسكري في العراق وغول يطالب ب"تفهم عربي" لموقف بلاده.

http:www.alreyadh.com/2007/10/18/articler287&5590.HTM

التوغل التركي في العراق.. أهداف معلنة وأخرى في دائرة التكهنات.

http://almalafpress.net/?d=171&id=52977

ملف: التوغل التركي داخل حدود اقليم كردستان العراق مواقف و تصريحات و ردود فعل.

http://www.pukonline.com/arabi/yeke.php?besh=Nusraw&perrg
e=nusraw&nujimare=10473

(٩٦) د. محمد نورەدین، چاو پێکەوتنێکی تایبەت لە گەڵ هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٦٦٠)، ٢٠٠٧/١١/١٩، هەولێر، ل ل ٢٢ — ٢٣.



ئامانجەی تورکیا و ئاماژەی بەوە کردبوو کە: " دابەشبوونی عێراق و سەربەخۆیی کوردستان ئەگەرێکی پەسەند نەکراوە بە لای تورکیاوە، ئەمەش لە بەر ئەوەی دامەزراندنی ناوەندێکی راکێشەر لە باکووری عێراق لە داهاتووی درێژخایەندا دەبێتە هۆی دابەشبوونی تورکیا، هەر ئەمەش وای کردووە کە تورکیا تەگەرە بخاتە بەردەم سەربەخۆی باشووری کوردستان و لەم چوارچێوەیەدا (PKK) بەهێزترین بیانوویە بۆ ئەم مەبەستە ". [٩٧]

هەروەها بەشیکردن و لێکدانەوەی خودی لێدوانەکانی بەرپرسانی ئەو وڵاتە، زۆر بە زەقی روون دەبێتەوە کە مەبەست و ئامانجی بنەڕەتی ترکیا لاوازکردن و گەمارۆدانی هەرێمی کوردستان و هەڵوەشاندنی ریفراندومی کەرکوك و دژایەتی دابەشکردن عێراق بووە بۆ سێ هەرێمی فیدراڵی، نەك لێدانی چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) تەنانەت پێش دەرچوونی پرۆژەی جۆزیف بایدن، عبداللە گول وەزیری دەرەوەی تورکیا لە سەردانێك دا بۆ واشنتۆن لە شوباتی ٢٠٠٧دا ئاماژەی بەوە کرد بوو کە " بە پێ ڕێکەوتنی ١٩٢٦ ئێمە ویلایەتی (موسل)مان بۆ عێراقێکی یەکگرتوو بەجێهێشت بۆیە ئەگەر عێراق دابەش بکرێت ئەو کاتە ئێمە ئەو ڕێکەوتن نامەیە هەڵدەوەشێنینەوە ". [٩٨]

بە هەمان ئاراستە (یەشار بویوکت ئانت) سەرۆك ئەرکانی سوپای تورکیا لە ٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧دا دژایەتی خۆی بۆ پرۆژەی دابەشکردنی عێراق دەربڕی و ڕایگەیاند " بڕیاری ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا، هەڕەشە و مەترسییەکی گەورەیە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی کوردی، شیعی و سوونی، دەبێتە هوی ئەوەی ماوەیەکی زۆر و لە ناکاو دەوڵەتی کوردی لە عێراق دروست بێت، ئەمەش کوردەکانی تورکیا دەورژێنێت ". [٩٩]

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەکرێت بڵێین، تورکیا بەردەوام دەبێ لە دژایەتی هەرێمی کوردستان و بەردەوام دەبێ بە کارت و ئامرازی جۆراوجۆری وەك کارتی، PKK و هەڕەشەی سەربازی و ئابووری گوشار بۆ سەر کورد دەهێنی، بۆیە سەرکردایەتی سیاسی کورد دەبێ زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو وڵاتە بکات و هەوڵ بدات نەکەوێتە داوی تورکیاوە.

(٩٧) وەرگێڕاوە لە: هەفتەنامەی بزاڤ، گۆڤارێکی سیاسی هەفتەنامەیە، ژمارە ٢١، هەولێر، ٤ ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٧، ل ١١.

(٩٨) وەرگێڕاوە لە: هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٢٢)، ٢٠٠٧/٢/١٢، هەولێر، ل ل ٨ — ٩.

(٩٩) بڕوانە: www.arroee.com/modales.phonam=wews&f:le=orticle

**٢: دەوڵەتانی عەرەبی:**

زوربەی دەوڵەتانی عەرەبی هەر لە سەرەتای درست بوّنییەوە، تیّروانین سیاسەتەکانیان بەو ئاراستەیە بووە کە تایبەتمەندییەکانی گەل نەتەوەکانی ناعەرەب لە ناو بوّتەی نەتەوەی عەرەبدا بتویّنەوە و بەردەوام هەولّی سڕینەوەی زمان و کلتووریان دراوە.

هەر بۆیەش لەو کاتەی دەوڵەتانی عەرەبی دروستبوونە تاکو ئەمڕۆ نەیانتوانیوە چارەسەریّکی ئاقلانە و ریالیستی و دیموکراسیانە و بنەبڕانە بۆ دیاردەی فرەنەتەوەیی، کلتووری، دینی، مەزهەبی، تایفی ناو کۆمەڵگاکانی خۆیان بدۆزنەوە، کیّشە و ململانیّ ئەتنی — مەزهەبی بیّ چارەسەر ماونە تەوەو و زۆر لە ناسیۆلیست و دەوڵەتە عەرەبییەکان بەو پەڕی چاوی گومانەوە سەیری بابەت و مەسەلەکانی ڕیفۆرمی دیموکراسی —مافی نەتەوە و کەمینەکان دەکەن، وا تەماشای مەسەلەی نەتەوەکانی نا عەرەبی چوارچیّوەی دەوڵەتەکانیان دەکەن کە گوایە ئالەتیّکی دەستی دەرەوەن و هەوڵ ئەدەن بۆ دابەشکردنی نیشتیمانی عەرەب. [(١٠٠)]

هەر ئەم تیّڕوانینانەی دەوڵەتانی عەرەب وای کردووە، زۆر بە توندی دژایەتی و بەرهەڵستی هەر جۆرە گۆڕانکارییەکی سیاسی چوارچیّوەی دەوڵەتانی خۆیان بکەن. لەوانەش ئەم پرۆسە سیاسی و دیموکراسییەی کە لە عیّراقدا هاتۆتە ئاراوە. لە بەرامبەر پیّشڤەچوونە سیاسییەکانی عیّراق ئاسوودە نین و بە شیّوەیەکی زۆر ئاشکرا دژایەتی پرۆسەی دیموکراسی و بە فیدراڵی کردنی دەکەن و دژی ئەم ئاراستەیەن.

لە بەر ئەوەی لە لایەکەوە بوونی عیّراقیّکی دیموکراسی و پیّشکەوتوو بە هەڕەشە و مەترسی بە سەر خۆیان و سیستەمە دیکتاتۆرەکانیان دەزانن، چونکە بە شیّوەیەکی توندوتیژ و پۆلیسی کۆنترۆڵی دەوڵەتانیان کردووە و بە زۆری و دوور لە هەموو جۆرە مەرج و پیّوەریّکی دیموکراسی خۆیان بە سەر گەل و کۆمەڵگاکانیاندا سەپاندووە، هەر لە بەر ئەمەش بە بیانووی پاراستنی یەکیّتی خاکی عەرەب، بەرەنگاربوونەوەی کۆلۆنیالیزم، دژایەتی پرۆسەی سیاسی عیّراق دەکەن و سوورن لە سەر ئەوەی کە عیّراق بە گەل و خاکەوە بەشیّکیدا نەبڕاوە لە نیشتمانی عەرەب و هەوڵی ترساندنی عەرەبی عیّراق بە تایبەت سوونەکان دەدەن بەوەی عیّراق بەرەو دابەشبوون و لیّك دابڕان و لە بەر یەك هەڵوەشانەوە دەچیّت بۆ ئەوەی دژایەتی پرۆسەکە بکەن ویستویانە وا پیشانی رای گشتی عەرەب بدەن، کە پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی عیّراق سەرەتا و دەسپیّکی دابڕان و دوورخستنەوەی ئەم وڵاتەیە لە ژینگەی ئیسلامی و عەرەبی. [(١٠١)]

---

(١٠٠) عومەر نورەدینی، سەرچاوەی پیّشوو، ل ل٢٨٤-٢٩١.

(١٠١) د. جبار قادر، الفيدرالية تجسيد لتعايش...، ص ٢٩.



هەر بۆیەش ئەوەی بە لای دەوڵەتانی عەرەبییەوە گرنگ بوویێت عروبەی عیّراقە، بەردەوام ئەم بابەتەیان لە سەر ئاستی عەرەبی و هەریّمی و ئیسلامی ورژاندووە، هەوڵیان داوە وا پیشانی رای گشتی عەرەب بدەن کە عروبەی عیّراق لە بەردەوام و هەڕەشە و مەترسیدایە.

لە لایەکی ترەوە دەوڵەتانی عەرەبی لە هاتنە سەر گۆڕەپانی سیاسی کورد و عەرەبی شیعە نیگەرانن، پیّیان وایە بە دەسەڵاتدار بوونی عەرەبی شیعە لە عیّراق دەبیّتە هۆی ورژاندن و هۆشیار کردنەوەی شیعەکان لە جیهانی عەرەبیدا بۆ ئەوەی خوازیاری مافەکانیان بن و لە دروستبوونی هیّلالی شیعە دەترسن. هەروەها بە چاوی گومان و ترسەوە سەیری کورد و سەرکردایەتی سیاسییەکەی دەکەن و پیّیان وایە ئالییەتی دەستی دەرەکین و خەریّکی پیلان گیّرانن بۆ دابەشکردنی نیشتمانی عەرەب. [(١٠٢)]

(د. سەعد ناجی جەواد) کەسایەتی عەرەب ئاماژە بەوە دەکات کە دژایەتی کردنی سیستەمی فیدراڵی لە لایەن عەرەبەکانەوە بە هۆی ئەوەیە کە :" فیدراڵییەت دەبیّتە هۆی دروستبوونی دوو ئیدارەی و بەڕیّوەبەری لیّك جودا و هەروەها بە هۆی نەبوونی خاڵ و **سەوابتی** هاوبەش و نەگۆڕی وەك یەکیّتی خاکی عیّراق، دابەش نەکردن و رەتکردنی چارەسەرییە دەرەکییەکان" هەروەها دەڵیّت: " ئەوەی کورد جەختی لە سەر دەکات دوورە لە بیرۆکەی یەك گەل و یەك خاك و بەرژەوەندی. " [(١٠٣)]

هەڵویست و بۆچوون و تیّڕوانینە دژەکانی وڵاتان و دەوڵەتانی عەرەبی لە هەمبەری پرۆسەی سیاسی عیّراق، دەتوانین لە دوای پەسند کردنی دەستووری هەمیشەیی و هەروەها دەرچوونی پرۆژەی (جۆزیف بایدن) زۆر بە ئاشکرا ببینین، لە سەروبەندی دەرچوونی دەستووری هەمیشەیدا، دەوڵەتانی عەرەبی بە میدیا و رۆشەنبیرەکانییەوە کەوتنە دژایەتی کردنی دەستوورەکە، لە سەرووی هەموویانەوە کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی کە زۆر بە توندی دژایەتی خۆی بۆ دەستوورەکە دەربڕی و بە دەسووریّکی "ئاژاوەگیّڕ وەسفی کرد " داواشیان لە حکوومەتی عیّراق کرد کە" ڕوونکردنەوەی بە پەلە بدات سەبارەت بە بەندی سیّ دەستوور کە ئەم وڵاتە بە وڵاتیّکی فرەنەتەوە و ئایین و ئایینزا لە قەڵەم دابوو "[(١٠٤)].

---

(١٠٢) هوشنگ الوزيری، عروبة العراق و محنة الاخرين غير العرب، ، مجلة سردم العربي، مجلة فصلية ثقافية عامة، العدد ١٠، دار السردم للطباعة و النشر، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ص ٢١٦ — ٢١٧.

(١٠٣) د. سعد ناجي جواد، القضية الكوردية، في : جعفر ضياء جعفر و آخرون، برنامج لمستقبل العراق بعد انهاء الاحتلال، ندوة مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الاولى، بيروت، تشرين الاول ٢٠٠٥، ص ٢٧٢.

(١٠٤) هوشنگ الوزيری، مصدر سابق، ص ٢١٧.

لە لایەکی ترەوە هاوکات لەگەڵ دەرچوونی پرۆژەی جوزێف بایدن، دەوڵەتانی عەرەبی و پارتە سیاسییەکان و کۆمکاری عەرەبی و ئەنجوومەنی هاوکاری کەنداوی عەرەب و زۆربەی رۆشنبیر و میدیاکان، کەوتنە دژایەتی کردنی پرۆژەکە وەك بەشێك لە پیلانی ئەمریکی – ئیسرائیل یان لە قەڵەمدا بوو لێکترازان و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عێراق و جۆگرافیایەکەی [١٠٥]، هەروەها بە گەورەترین هەرەشە و مەترسییان دانا بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەی عەرەب و دەوڵەتانی عەرەب، بەو مانایەی کە دەبێتە دەستپێکی دابەش کردنی تەواوی جیهانی عەرەب، لەم چوارچێوەیە دا، کۆمکاری وڵاتانی عەرەب پرۆژەکە بە تێروانینێکی ژەهراوی ئەمەریکا لە قەڵەمدا بۆ ئایندەی وڵاتانی عەرەب بەو مانایە ئەگەری ئەوە هەیە کە لە وڵاتانی تری عەرەبیدا دووبارە ببێتەوە، ببێتە هۆی لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، هەروەها جەختی لە سەر ئەوەی کرد کە پێویستە رێز لە یەکێتی خاکی عێراق و ناسنامە و شوناسە عەرەبییەکە و ئیسلامییەکەی بگیرێت و دژی هەر جۆرە دابەشکردنی عێراقین لە ژێر هەر پەردە و بیانوێك دا.[١٠٦]

لە لایەن خۆیەوە دەوڵەتی سووریاش زۆر بەتوندی دژایەتی خوی بۆ دابەشکردنی عێراق و هەر هەوڵێکی کوردی دەربری کە دەبێتە هۆی سەربەخۆیی کوردەکان، لەوش گەورەتر تەنیا دەوڵەتی ناوچەکە و جیهان بوو کە پشتگیری دەوڵەتی تورکیای کرد بۆ پەلاماردانی هەرێمی کوردستان لەم رووەوە (بەشار ئەسەد) سەرۆك کۆماری سووریا کە لە٢٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧دا بە سەردانێك گەیشتبووە تورکیا بۆ دووپاتکردنەوەی یەك دەنگی و یەك هەڵوێستی دەوڵەتە هەرێمییەکان سەبارەت بە پێشهاتە سیاسییەکانی عێراق و دەڤەرەکە ئاماژەی بەوە کرد کە: "شکست هێنان لە پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق دەبێتە هۆی تەقینەوەی بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەراست و ناوچەکە، لەم رووەوە تورکیا و سووریا و دەوڵەتە هەرێمییەکان هاوهەڵوێست و هاودەنگن بە شێوەیەکی رەها لە سەر ئەوەی پێویستە بە هەموو تواناکانیانەوە بەرگری لە یەکێتی خاکی عێراق بکرێت و

(١٠٥) بروانە: ثلاث مؤتمرات تدين تقسيم العراق:
http://www.Islamweb.net/ver141080/acchive/readart.php?id=2/2007/10/3.
فتوح هيكل، اطروحات تقسيم العراق...احتمالات التنفيذ ومخاطرها:
http://www.ecssr.ac.ae/cda/ar/2007/10/10.
(١٠٦) الجامعه العربيه تستنكر تصويت"الشيوخ الامريكي"على تقسيم العراق:
http://www.alarabiya.net/articles/2007/09/27/39658.html as retrieved on
الجامعة العربية تحذر من تبعات تقسيم العراق 200708:27:26
http://www.alrai.com/pages.php?news_id=1762.



تورکیا و سووریا زۆر بە توندی دژایەتی هەر جۆرە هەوڵێکی کوردەکان دەکەن بۆ خۆجیاکردنەوە لە حکوومەتی ناوەندی، لە بەر ئەوەی ئەم خۆ دوورخستنەوەیە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی، دواتریش دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نزعەی سەربەخۆی کوردەکان لەم دو وڵاتەدا ".[١٠٧]

لە هەمانکاتدا (بەشار ئەسەد) پشتیوانی خۆی بو بڕیاری پەرلەمانی تورکی دەربڕی بۆ هێرش کردن بۆ سەر هەرێمی کوردستان و رایگەیاند: " ئەمە مافێکی رەوای تورکیایە لە چوارچێوەی شەڕی دژە تیرۆر دا. " [١٠٨]

بە هەمان ئاراستە سکرتێری گشتی ئەنجوومەنی هاوکاری کەنداوی عەرەب (عبدالرحمن العطية) لە بەیاننامەیەکدا دژایەتی پرۆسەی بە فیدراڵی کردنی عێراقی دەربڕی و رای گەیاند دژی هەر جۆرە ئاراستەیەکی لەم شێوازەیە لە بەر ئەوەی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نزعەی جودا خوازی لە دەڤەرەکەدا " هەروەها جەختی کرد لە سەر یەکێتی خاك و گەل و سەروەری عێراق.[١٠٩]

بە شێوەیەکی گشتی دەوڵەتانی وەك (عەرەبستانی سعودی سوریا) رۆڵێکی زۆر نیگەتیڤیان هەبووە لە هەمبەر پرۆسەی سیاسی عێراق لە بەر ئەوەی، عێراقێکی دیموکراسی و فیدراڵی دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگای گۆڕانکاری سیاسی – ئابووری و کۆمەڵایەتی و دیموکراسی لەم وڵاتانە دا، کە ئەمەش لە بەرژەوەندی دەسەڵات و سیستەمە نا دیموکراتییەکانیاندا نییە، لە بەر ئەمەش رۆڵێکی زۆر تێکدەرانەیان گێڕاوە لە عێراقدا و هانی ئیسلامییە توندڕەوەکان و ئەندامانی رێکخراوی قاعیدە و نەتەوە پەرستەکانی عەرەبیان داوە بۆ ئەوەی کرداری توندوتیژی و تەقینەوە لە عێراق ئەنجام بدەن.

(١٠٧) الاسد: تقسيم العراق "سيفجر"الشرق الاوسط:
http://www.arraee.com/modules.php?name=News&file=article&s20/10/2007.
(١٠٨) هەمان سەرچاوە.
(١٠٩) بروانە: عرب الخليج يقولون انهم يعارضون تقسيم العراق:
http://ara.today.reuters.com/news/newsArticle.aspx?type=topNews&story ID=2007-10-02T143911Z_01_EGO252608_RT.RIDST_0_OEGTP-IQ

## باسی سێیەم

## گەڕانەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بۆ سەر هەرێمی کوردستان

کەرکوك و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە، قووڵایی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەی کورد پێکدەهێنن، و هەموو بەڵگەنامە و فاکتەرە مێژووی و جۆگرافی، کوردستانی بوونی ئەو ناوچە و دەڤەرانە دەسەلمێنن و پشتڕاستی دەکەنەوە[110]، لەبەر ئەمەش چاوەڕێ ناکرێ بێ چارەسەرکردنی ئەم پرسە و گەڕانەوەیان بۆ سەر هەرێمی کوردستان، دۆزی کورد بە ئاراستەی چارەسەری بڕوات و پەیوەندی نێوان کورد و حکوومەتی ناوەندی بەرەو ئاسایی بوونەوە بچێت.

لە ساڵی ١٩٧٠دا، پرسی کەرکوك و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە لە تەوەرە هەرە گرنگەکانیدا نوستاندنی نێوان تەڤگەرا ڕزگاریخوازا کورد و حکوومەتی ناوەندی بووە، بە پێی ڕێکەوتنی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠، هەر دوو لایەن ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی ئۆتۆنۆمی کوردستان تەواوی ئەو دەڤەر و ناوچانە بگرێتەوە کە زۆرینەی دانیشتووانی کوردن، ئەوەش بە شێوەیەکی گشتی هەر چوار پارێزگای کەرکوك، سلێمانی، دهۆك و هەولێر دەگریتەوە [111]، بەڵام ڕژێمی بەعس بە دەرکردنی کەرکوك و هەندێ ناوچەی تر لە جوار چێوەی سنووری ئۆتۆنۆمی کوردستان و خۆدزینەوە لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە و، سەمت و ڕێڕەوی ڕووداوەکانی بە ئاراستەیەکی تر دا برد، کێشەکەش بە هەڵواسراوی مایەوە.

لە پەراویزی تەنگژەو قەیرانی داگیر کردنی کوێت بە هۆی ئەو گۆڕانگاری و هاوکێشە سیاسییانەی کە لە کوردستان و عێراق و ناوچەکە هاتنە ئاراوە، ڕێگای خۆش کرد بۆ ئەوەی بۆ جارێکی تر، دووەم گەورەترین دانوستاندن لە دوای ڕێکەوتنی ١١ی ئادار سەبارەت بە پرسی کەرکوك و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە لە نێوان حکوومەتی ناوەندی و بەرەی

(١١٠) بڕوانە: د. نوري طالباني، منطقة كركوك و محاولات تغيير واقعها القومي، الطبعة الثالثة، مطبعه وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص ص ١٨ — ٣٧.

(١١١) بڕوانە: د. منذر الفضل، دراسات حول القضية الكردية و مستقبل العراق، الطبعة الثانية، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤، ص ص ٢٩٣ — ٢٩٤؛ د. خليل اسماعيل محمد، ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢١٤٣)، ٢٠٠٥/٥/١٤.



کوردستانی بەڕێوە بچێت، بەڵام بە هۆی نەبوونی نییەتێکی ڕاستەقینە لە لای حکوومەتی ناوەندی بۆ چارەسەرکردنی، گفتوگۆکان بێ ئەنجام و بێ ئاکام مانەوە [112]. بەمەش جارێکی تر چارەنووسی ئەم دەڤەرانە بە هەڵواسراوی مایەوە، بە کێشانەوەی بەڕێوەبەرتییەکانی حکوومەتی ناوەندی کێشەکە ئاڵۆزتر بوو. بە هۆی ئەوەی بەشێکی گرنگ و ستراتیژی خاکی کوردستان، کە لە دوای گۆرانکارییەکانی(٩)ی نیسانی ٢٠٠٣ لە لە عێراق پێی دەوترێت ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە لە ژێر دەستی حکوومەتی ناوەندیدا مانەوە، کەوتنە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان.[113]

لە دوای پشت تێکردنی ڕژێمی بەعس بە گرتنە بەری ڕێگە چارەیەکی دیموکراسی و ئاشتییانە بۆ دۆزی کورد و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە، سەرکردایەتی سیاسی کورد ڕووی لە ئۆپۆزسیۆنێ عێراقی کرد و هەوڵە سیاسی و دیپلۆماسییەکانی خۆی لە چوارچێوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا چڕتر کردەوە، لە پێناوی دۆزینەوەی چارەسەرێکی دیموکراسی و ریالیستانە بۆ دۆزی کورد و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لە سەرە.

لەم ڕووەشەوە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە زۆربەی کۆنگرە و کۆبوونەوەکانی خۆیدا، پشتگیری خۆی بۆ مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان دووپات کردۆتەوە و جەختیشی کردووە سەر سڕینەوەی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی و بە عەرەبکردنی کوردستان، لە گرنگترینی ئەم کۆنگرانەش، کۆنگرەی لەندەنی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بووە، کە (١٤ — ١٦)ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢ لە بەریتانیا بەڕێوەچووە، لە بەندی ٩ ی بەیاننامەکەدا زۆر بە راشکاوی پرۆتستۆی سیاسەتی ڕاگواستن و تەعریب کردنی ناوچەکانی کەرکوك، زومار، خانەقین، مەندەلی، شێخان، مەخمور کرد، و داواشیکرد کە ئەو سیاسەتەی کە ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٦٨ پێی هەستاوە بە مەبەستی گۆڕینی سیمای دیموگرافی هەرێمی کوردستان هەڵبوەشێتەوە [114]. بێگومان ئەم هەڵوێستەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە دوای

(١١٢) فريد اسسرد، المسالة الكردية بعد قانون ادارة الدولة العراقية، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٤، ص ٥٢.

(١١٣)، مصدر نفسه، ص ٥٥.

(١١٤) لە کۆنگرەی بەیروت (١١-١٣) ئاداری ١٩٩١، هێزە سیاسیەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، لە بڕگەی ٧ی بەیاننامەکە داوایان کرد لیژنەیەك دروست بکرێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە ڕاگواستنی

گۆڕانكارییەكانی ٢٠٠٣ لە عێراقیش كاریگەری هەبووە لە سەر ناوەڕۆكی یاسای كاتی، بە شێوەیەك توانرا لە چوارچێوەی یاسای كاتیدا و لە بەندی (٥٨)دا چارەسەرێكی تایبەت بۆ ئەو ناوچانە كە ناكۆكییان لەسەرە بدۆزرێتەوە.

لە بڕگەی(أ)ی ئەم بەندە دا هاتووە: "حكوومەتی راگوزەری عێراق بە تایبەتی دەسەلاّتی بالاّ بۆ چارەسەركردنی كێشەكان لە سەر مۆڵكداری و چەندین لایەنی دیكە كە پەیوەندییان هەیە بەو مەسەلەوە بە شێوەیەكی خێرا هەستن بە گرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو لە پێناو لابردنی ئەو ستەم و زۆریەی كە رژێمی پێشوو پێی هەستابوو لەوانە گۆڕینی رەوش و باری نیشتەجێ و دانیشتن لە هەندێ ناوچەی دیاریكراودا كە كەركوكیش لەو ناوچانەیە، ئەمەش لە رێگای دەركردن و نەفی كردنی كەسەكان لە شوێنی زێدی خۆیان و لە رێگای راگواستنی زۆرەملێ بێ، لە ناو ئەو ناوچانە و دەرەوەی دا، نیشتەجێ كردنی بێگانەكان لەو ناوچانە و بێبەش كردنی دانیشتووانە رەسەنەكەی لە كاركردن و هەروەها لە رێگەی راست كردنەوەی ناسنامەی نەتەوەییەوە " [١١٥]، لەم رووەوە داوا لە حكوومەت دەكات ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێ:

زۆرەملێ كورد و سیاسەتی پاكتاوی رەگەزی و وێرانكردنی گوندەكانی كوردستان، هەروەها لە كۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی كە (٢٧ – ٣١) تشرینی یەكەمی ١٩٩١ لە هاوینە هەواری صلاح الدین بەسترا هەموو لایەنەكان هاودەنگ و هاوڕا بوون و جەختیان كردە سەر ئەوەی كە پێویستە هەموو بارودۆخێكی ناسروشتی و سەركوت كردنەوەی نەتەوەیی و لە ناوبردن بە هۆی ڕەگەزەوە چارەسەر بكرێت بە شێویەكی لەگەڵ بنەمای یاسایی یەك بگرنەوە، بە هەمان شێوە كۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی لە لەندەن ١٤، ١٦ كانوونی یەكەمی٢٠٠٢ی لە بەریتانیا بەسترا، لە برگە(٩)دا زۆر بە ڕاشكاوی داوای نەهێلاّنی سیاسەتی پاكتاوی رەگەزی كرد، لە ڕێگەی گەڕانەوەی عەرەبە هاوردەكان بۆ شوێنە رەسەنەكانیان و هەروەها گەڕانەوەی ئاوارە كوردەكان و هەروەها كوردە فەیلییەكان كە بە بیانووی پاشكویێ بۆ ئێران دەركراون، هەوەها هەموو ئەو شێواندنەی كە سەبارەت بە گۆڕینی سیمای دیموگرافی ناوچەكانی هەرێمی كوردستان كراون، بڕوانە: ئەحمەد عزیز، كركوك في ظل معاهدات المعارضة العراقیة و المادة ٥٨، مجلة سردم العربي، عدد ١٠، ٢٠٠٥، ص ص ١٦٠ - ١٦١.

(١١٥) قانون ادارة الدولة العراقیة للمرحلة الانتقالیة.



١- سەبارەت بە هاوردە و راگوێزراوەكان و كۆچ پێكرا و كۆچ بەرەكان، ئەركی حكوومەتە كە لە ماوەیەكی ماقوڵدا، ئەوانە بگەڕێنێتەوە سەر ماڵ و موڵكی خۆیان، ئەگەر ئەوەش نەكرا پێویستە حكوومەت قەرەبوویەكی دادپەروەرانەیان بۆ بكات.
٢- سەبارەت بەو كەسانەی كە بۆ ناوچە و جێگە دیاركراو گوێزراونەتەوە، دەبێ حكوومەت، دووبارە نیشتەجێیان بكات یاخود قەرەبووكردنەوەیان بە بەخشینی زەوییەكی دیكە پێیان لە لایەن دەوڵەتەوە لە جێگەیەكی نزیك شوێنی نیشتەجێ بوونیان لەو پارێزگایەی كە لێ هێنراون.
٣- سەبارەت بەو كەسانەی كە لە دەرفەتی ژیان و خۆ ژیاندن یاخود دامەزراندن بێ بەش كراون بە مەبەستی ناچاركردنیان بۆ ئەوەی كۆچ بكەن، پێویستە حكوومەت دەرفەتی نوێی كاریان لەو ناوچە و زەویانەیان بۆ دەستەبەر بكات.
٤- سەبارەت بە راستكردنەوەی شوناسی نەتەوەیی (تصحیح القومی) پێویستە حكوومەت هەموو ئەو بڕیارانەی پەیوەندداریان بەو مەسەلەیەوە هەڵبوەشێنێتەوە و رێگە بدات خەڵك بە ویستی خۆیان ناسنامەی نەتەوەیی و ئینتمای نەژادی خۆیان دیاری بكەن.

لە بڕگەی(ب)دا هاتبوو: رژێمی پێشوو بە مەبەستی سیاسی سنوورە ئیدارییەكانی دەستكاری كردووە و گۆڕانكاری بە سەڕدا هێناون، بۆیە پێویستە لە سەر سەرۆكایەتی حكوومەتی ڕاگوێزراوی عێراق راسپاردە پێشكەش بە ئەنجوومەنی نیشتمانی بكات لە پێناو چارەسەركردنی ئەو گۆڕین و دەستكارییە نا دادپەروەرانە.

بڕگەی (ج)دا ئاماژەی بەوە كردبوو كە :"یەكلاكردنەوەی یەكجارەكی ئەو دەڤەرانەی ناكۆكییان لەسەرە بە كەركوكیشەوە، دوادەخرێت بۆ پاش تەواوبوونی هەموو ڕێوشوێنەكانی سەرەوە، و ئەنجامدانی ئامار و سەرژمێرییەكی شەفاف و دادپەروەرانەی دانیشتووان و پەسندكردنی دەستووری هەمیشەیی، دەبێ ئەم یەكلاكردنەوەیە بە شێوەیەك بێت لەگەڵ پرەنسیپی دادپەروەری بگونجێ و لە پڕۆسەكەشدا ئیرادە و ویستی دانیشتووانی ئەو دەڤەرانە لە بەر چاو بگیرێ"[١١٦].

ئەم بەندە و بڕگانەی سەرەوە دەكرێت لە دوو روانگەی جیاوازەوە لێكدانەوە و شیكردنەوەیان بۆ بكرێت. خاڵە گرنگ و پۆزەتیڤەكانی بریتین لەوەی دانی ناوە بەوەی كە

(١١٦) بۆ بینینی دەقی بەندی ٥٨ بڕوانە، قانون ادارة الدولة العراقیة للمرحلة الانتقالیة.

کەرکوك و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە، تووشی سیاسەتی ڕەگەزپەرەستی و بە عەرەب کردن هاتوون و حکوومەتی ناوەندی بە مەبەستی سیاسی دیموگرافیای ئەو ناوچانەیان گۆڕیەوە، ئەم دانپێنانە خۆی لە خۆیدا گرنگە لەبەر ئەوەی ناتوانرێت کێشەیەك چارەسەر بکرێت ئەگەر دانپێنانەکەی ئاشکرا و راشکاوانە نەبێت، و جەختکردن لە سەر یەکلاکردنەوەی، خاڵێکی دیکەی گرنگ بەشداری پێکردنی فاکتەری دانیشتوانە لە یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ئەو ناوچانەی کێشەیان لە سەرە [117]، بەو مانایە دەبێت پرسەکە لەگور حەز و ویست و داخوازییەکانی دانیشتووانی ناوچەکە یەکلا بکرێتەوە. بێ گومان ئەمەش کۆك و تەبایە لەگەڵ بنەما و پرەنسیپەکانی دیموکراسی و یاسایی نێودەوڵەتی. لە هەمموویان گرنك تر بەشداری پێ کردنی فاکتەری دانیشتوان، ڕەوایی و شەرعیەتی تەواوی دەداتە ئەو ئەنجام و بارودۆخەی نوێییەی کە لێی دەکەوێتەوە. [118]

لە بەرامبەریشدا چەند خاڵێکی نیگەتیڤ و لاواز تێدا بەدی دەکرێت، یاساکە جگە لە کەرکوك ئەو ناوچانەی کە ناکۆکییان لەسەرە دیاری نەکردووە، ئەمەش کۆمەڵێك پرس و گومان و ئاڵۆزی دروست دەکەن سەبارەت بەم بابەتە هەستیارە، لەوانەیە لە کاتی پرۆسەی ڕێفراندۆمدا مشتومڕی لە سەر دروست ببێ، هەروەها بە پێی بەندی (٥٨) هەڵوەشاندنەوەی سیاسەتی تەعریب تەنها کردەوەکانی رژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٦٨ بە دواوە دەگەڕێتەوە، لە لایەکی ترەوە پرسی کەرکوك و ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە لە کێشەیەکی سیاسییەوە کراوە بە کێشەیەکی یاسایی، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی نیوەی خاکی کوردستان کە بە قووڵایی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی کورد دادەنرێت ببێتە ئەو ناوچانەی کێشەی لە سەرەوە (المناطق المتنازع علیها) و مافیان داوە بە لایەنی عەرەبی و عەرەبە هاوردەکان وەکو کورد، لایەنێك بێ لە داکۆکی کردنی شتێك کە لە بنەڕەتدا هی ئەو نییە و داگیری کردووە. [119]

بە شێوەیەکی گشتی وەك یاسای کاتی و بەندی (٥٨)کە تیایدا ئاماژەی پێ کرابوو، حکوومەتی کاتی عێراق بە سەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەست بە کار

(١١٧) فرید اسسرد، مصدر سابق، ص ص ٦٧ — ٦٨.

(١١٨) مصدر نفسە، ص ص ٦٧ — ٦٨.

(١١٩) جوهر نامیق سالم، کورد لە گەمەی...، ل ٩٧.



بوو، وابەستە بوو بەگرتنەبەری هەنگاوی خێراو بە پەلە و چالاك و کاریگەر بۆ لابردن و سڕینەوەی شوێنەوارەکانی رژێمی پێشوو، بەڵام ئەم حکوومەتە لەم رووەوە هەنگاوی ئەوتۆی نەهاویشت و بە پێچەوانەوە لە بیانوو و پاساوی جۆراوجۆری وەك بارودۆخی ناسەقامگیری عێراق و رەوشی ئاسایش خۆی لەم ئەرکە یاساییە دزییەوە [120]. دوای ئەویش حکوومەتی ابراهیم الجعفری هات، ئەگەرچی پێش پێك هێنانی حکوومەت، رێکەوتننامەیەکی سیاسی لە نێوان لیستی هاوبەندی عێراقی و لیستی هاوپەیمانی کوردستان مۆرکراو بوو، لەو ڕێکەوتنامەیەدا هاتبوو، کە دوای تەنها یەك مانگ لە بەرواری راگەیاندنی حکوومەت، دەبێت ئەندامانی لیژنەی تایبەت بە ئاسایی کردنەوەی ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە دیاری بکرێت و بودجەی پێویست بخرێتە بەر دەستیان و بەپەلە لە ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی ناوچە بە عەرەب کراوەکان بکرێت. [121]، بەڵام حکوومەتی جەعفەریش نەك هەر پەلەی نەکرد لە جێبەجێ کردنی بەندی (٥٨)، بەڵکو کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی کات کوشتن و مانۆری سیاسی و دیپلۆماسی بەهاوکاری دەوڵەتە دراوسێکان دژی کورد. [122]

(١٢٠) حکوومەتی ئەیاد عەلاوی کە یەکەم حکوومەت بووە لە دوای دەرچوونی یاسای کاتی پێویست بووە هەڵستێت بە جێبەجێکردنی بەندی (٥٨)، بەڵام بە بیانووی جۆراوجۆرەوە خۆی لەم کارە دزییەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کاردانەوەیەکی توند لە لایەن سەرکردایەتی سیاسی کوردستانەوە وەربگرێت و پێش مانگی یەکەم لە یەکەم پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی عێراق دوای گرتنی کرد، سەبارەت بەجێبەجێکردنی ئەم بەندە بۆیە ئەیاد عەلاوی و جۆن میکرو پۆنتی، لەم روویەوە بە نوسراوی فەرمی پشتگیری خۆیان بۆ تەواوی بەند و بڕگەکانی بەندی ٥٨ دەربڕی بۆ بینین دەقی ئەم هەردوو نامەیە بڕوانە : احمد عزیز، مصدر سابق، ص ص ١٦٢ — ١٦٣.

(١٢١) بۆ بینینی دەقی ئەم ڕێکەوتن نامەیە بڕوانە : الملف العراقی، شهریة سیاسیة وثائقیة یصدرها المعهد العراقی للتنمیة والدیمقراطیة، العدد(٤١)،٢٠٠٥، ص١٢.

(١٢٢) لە سەردەمی حکوومەتی ئەیاد عەلاوی بڕیارێك دەرکرا بۆ پێکهێنانی دەستەیەکی تایبەت بە ناوی دەستەی باڵای تایبەت بە ئاسایی کردنەوەی باردۆخ لە کەرکوك و ئەو ناوچانەی کێشەیان لە سەرە، حمید مجید موسی کرا بە سەرۆکی ئەو دەستەیە، لە دوای پێك هێنانی حکوومەتی نوری المالکی سەرۆکی لیژنەی تایبەت بە ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کەرکوك و دەڤەرەکانی تر وەزیری دادی عێراقی بە ناوی هاشم عبدالرحمن الشبلی، لە لایەکی ترەوە سەرەڕای ئەم لیژنەیە بۆ هۆی هەستیاری بابەتەکە چەندین لیژنەی تری سەبارەت بە چاودێری کردنی جۆنیەتی بەڕێوە چوونی پرۆسەکە دروست کران لەوانە : ١ — لیژنەی بەدوادا چوونەوەی

هەموو ئەمانەش وای کرد بە ناچاری بەندی (٥٨) بگوازرێتەوە بۆ ناو دەستووری هەمیشەیی، بەو مەبەستەی لە ماوەیەکی دیاریکراو دا پراکتیزە بکرێت و لە بەندی (١٤٠)دا دەقنووس کرا، لەم بەندەشدا وێرای جەختکردن لە سەر تەواوکردنی جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی بەندی (٥٨) بە هەموو برگەکانییەوە، ئاماژەش بەوە کردبوو کە پێویستە هەر سێ قۆناغی (ئاسایی کردنەوە، ئامار، ڕیفراندۆم) لە ماوەیەکدا کە لە ٣١ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ تێپەڕ نەکات تەواو بکرێت.[١٢٣]

بە هەمان شێوەش لە بەندی (٢٢)ی کارنامەی حکوومەتی (نوری ئەلمالکی) دا، جارێکی تر جەختکرا لە سەر جێبەجێکردنی بەندی (١٤٠) بە هەر سێ قۆناغەکەوە لەم بەندەدا هاتبوو " حکوومەت پابەندە بە جێبەجێ کردنی بەندی (١٤٠)ی دەستوور کە پشت بە بەندنی (٥٨) ی یاسای ئیداری دەوڵەت دەبەستێ، و خۆی لە سێ قۆناغی سەرەکیدا دەبینێتەوە: ئاسایی کردنەوە و ئامار و ڕاپرسی لە کەرکوك و ناوچەکانی تر کە ناکۆکییان لەسەرە، حکوومەت هەر لە دوای دامەزراندنیدا هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی هەنگاوی پێویست بۆ ئاسایی کردنەوە، وەك گەڕانەوەی قەزا و ناحییەکان بۆ سەر ئیدارەی کەرکوك کە لە بنەڕەتدا سەر بە کەرکوك بوونە، ئەم قۆناغە لە ٢٠ ی ئاداری ٢٠٠٧ دا کۆتایی پێ دێت، قۆناغی ئاماریش لە ٣١ ی تەمووزی ٢٠٠٧دا دەست پێ دەکات، دوا قۆناغیش کە راپرسییە لە ١٥ تشرینی دووەمی ٢٠٠٧دا کۆتایی پێ دێت".[١٢٤]

بەڵام حکوومەتی عێراق بە سەرۆکایەتی نوری المالکی وێڕای ئەو هەموو بەند و خاڵ و ڕێکەوتنانەی کە ئاماژەمان پێ کردن لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە پێویست بوو چارەنووسی ئەم ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە یەکلایی بکریتەوە تەنیا چوار(٤)بڕیاری دەرکرد کە بریتی بوون لە:

ئەنجوومەنی نوێنەرانی کۆماری عێراق — ٢ — لیژنەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان کە لە لایەن محمد احسان، وەزیری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێمی کوردستان سەرپەرشتی دەکرێت -٣ — لیژنەی پەرلەمانی کوردستان -٤- لیژنەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان -٥- لیژنەی لایەنە سیاسییەکان -٧- لیژنەی پارێزگای کەرکوك. بڕوانە: جوهر نامیق سالم، کورد لە گەمەی...، ل١٠٢.

(١٢٣) بڕوانە: دەستووری هەیشەیی عێراق بەندی (١٤٠).

(١٢٤) بڕوانە: جوهر نامیق سالم، کورد لە گەمەی...، ل ٩٤ -٩٦.



١- گەڕانەوەی کارمەندان لەو ناوچانەی ناکۆکییان لە سەرە کە دەرکراون لە پاش تەمووزی ١٩٦٨ تا ٢٠٠٣ بۆ سەر کارەکانی پێشوو.

٢- ناردنەوەی عەرەبە هاوردەکان بە دوو مەرج: یەکەم بە ئارەزووی خۆیان بێ، دووەم کەمکردنەوەی بڕە پارەی قەرەبوو کردنەوەیان لە ٢٠ ملیۆن بۆ ١٠ ملیۆن.

٣- گەڕانەوەی کوردە دەرکراوەکان بۆ سەر جێگای خۆیان و قەرەبووکردنەوەیان.

٤- هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستە کشتوکاڵییەکان کە لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعەرەبکردندا مۆرکراون".[١٢٥]

بەم شێوەیە و بە ناچاری لەسەر داخوازی نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان (ستیڤان دیمەستورە) پرۆسەکە درێژکرایەوە بۆ (٦) مانگی تر، واتە تا مانگی حزیرانی ٢٠٠٨[١٢٦]. لە ڕاستیدا هاتنەناوەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ ناو کێشەکە؛ دەگرێتەوە بۆ دوو هوکاری سەرەکی:

١- شکست هێنانی هەر سێ حکوومەتی (ئەیاد عەلاوی، ابراهیم الجعفری، نوری المالکی) لە جێبەجیکردنی بەندی (٥٨)ی دەستووری کاتی و بەندی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی بە پیێ ئەو سەقفە زەمەنەی کە بۆی دیاری کرابوو.

٢- خۆدی بەندی (٥٨)ی دەستووری کاتی و بەندی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی جەختیان لە سەر ئەوە کردبوو کە ئەگەر هاتوو لایەنە عێراقییەکان نەیانتوانی پرسەکە چارەسەر بکەن ئەوا دەبی پەنا بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بەرێت.

ئەوەی جێگای نیگەرانییە بەشی هەرە زۆری عەرەبەکان، بە هەر سێ حکوومەتی ئەیاد عەلاوی و ئیبراهیم جەعفەری و دواتریش نوری المالکی لەگەڵ ئاسایی کردنەوەی ڕەوشی ئەو ناوچانەی ناکۆکییان لەسەرە نەبوون و نین بە بیانوو و پاساوی جۆراوجۆرەوە دژایەتی بەندی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی دەکەن و بە هیچ شێوەیەکیش پابەندی بەڵێنەکانی خۆیان نەبوونە، ئەگەر ئەمە لایەنێکی کێشەکە بێت، کەوا بەشێکی تری گرفتەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی دەوڵەتانی هەرێمی و عەرەبی، بەو مانایەی پرسی کەرکوك ڕەهەندی ناوخۆیی

(١٢٥) بو بینینی دەقی ئەم چوار بڕیارە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ل ٤٥٦-٤٦١.

(١٢٦). بڕوانە: ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٧١٢) ٢٠٠٧/١٢/٢٧.

تێپەڕاندووە، ڕەهەندێکی قوڵی هەرێمی و نێودەوڵەتی وەرگرتووە، زۆربەی دەوڵەتانی عەرەبی بە دەوڵەتی ئێران و تورکیاشەوە دژی گەڕانەوەی کەرکوکن بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

دەوڵەتانی عەرەبی مەسەلەی کەرکوك-یان پەیوەست کردووە بە یەکێتی خاکی عێراقەوە، وای بۆ دەچن لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە دەبێتە هۆی پارچە پارچە کردنی عێراق و لاوازکردنی سنووری نیشتیمانی عەرەب. بە هەمان ئاراستەش تورکیا لە سەر هەموو ئاستەکان لە کار و بزاڤ دایە بۆ ئەوەی کەرکوك نەگەڕێتەوە سەر کوردستان، لە بەر ئەوە وای بۆ دەچن ئەم کارە سەنگ و قورسایی کورد لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین سەنگین تر و بەهێز تر دەکات، تەنانەت هەموو هاوکێشە سیاسییەکانی ناوچەکە سەروبن دەکات. پێیان وایە هەرێمی کوردستان بە کەرکووکەوە پێگەیەکی ستراتیژی بۆ کورد لە دەڤەرەکەدا پەیدا دەکات و لە ڕەنگرێژکردنی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین ڕۆڵێکی گرنگ و بنەڕەتی دەگێڕن.[١٢٧]

بە هەمان ئاراستە دەوڵەتانی هەرێمی و عەرەبی (تورکیا و عەربستانی سعودی) کاریگەریان لەسەر ڕاپۆڕتی (بیکەر- هاملتۆن) و گروپی قەیرانی نێودەوڵەتییەکان هەبووە کە داوای دوا خستنی بەندی (١٤٠) یان کردووە، داوایان کردووە کە پارێزگای کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی سەربەخۆ و دەسەڵات لە نێوان پێکهاتەکان دا دابەش بکرێت.

شایانی باسە ڕاپۆرتی بیکەر هامیلتۆن لە خاڵی ٣٠ دا ئاماژە بەوە دەکا کە :"لە بەر ڕۆشنایی باری ترسناکی کەرکوك، زۆر پێویستی هەیە بە ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بۆ خۆپاراستن لە توندوتیژی چاوەڕوان کراو، کەرکوك دەتوانێ ببێتە بەرمیلێك باڕووت، ئەنجام دانی ڕاپرسی دەربارەی چارەنووسی کەرکوك بەر لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ دا، وەك لە دەستووری عێراقدا داوای کراوە، دەبێتە هۆی تەقینەوەی بارودۆخەکە، لە بەر ئەمە پێویستە دوابخرێت، ئەم مەسەلەیە دەبێ بخرێتە سەر ئەژێندای گروپی نێودەوڵەتی بۆ پشتگیری عێراق".[١٢٨] هەروەها

---

(١٢٧) بڕوانە: ئەسرا چیتچی چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ٦٢٢، ٢٠٠٧/٢/١٢، ل ٢٧؛ چەنگیز کاتمان، چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ٦١٥، ٢٠٠٧/٣/٥، ل ٣٩.

(١٢٨) بروانە: ڕاپۆرتی گروپی لێکۆڵینەوەی عیراق (بیکەر- هامڵتۆن)، وەرگێڕانی: جەمیل عەلی و ئەوانی تر، لە بڵاوکراوەکانی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل١٢٢-١٦٣؛ هەروەها ئەم سایتانەی خواوەوە:



گروپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکانیش لە ڕاپۆرتەکانی خۆیدا لە ١٨ ی تەمووزی ٢٠٠٦، و ١٧ نیسانی ٢٠٠٧ دا داوای دواخستنی مادەی ١٤٠ دەکات، بەم شێویەوەی خوارەوە :

١- دواخستنی ئەو ڕیفراندۆمەی کە دەبێ سەبارەت بە کەرکوك ئەنجام بدرێت.

٢- هێشتنەوەی کەرکوك وەك هەرێمەکی فیدراڵی سەربەخۆ.

٣- دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی شارەکە دا.

٤- درێژە پێ دان بە هەڵگەڕانەوەی کارە نارەواکانی پێشوو و قەرەبووکردنەوەیان و هەروەها داوا دەکا ئەو ناوچانەی سەر بە ئیدارەی کەرکوکن نەگەڕێنەوە سەر پارێزگای کەرکوك.[١٢٩]

بێگومان هەموو ئەمانە ناکۆکن لەگەڵ ستراتیژییەتی کورد، لە جێگای ئەوەی پرسەکە چارەسەر بکرێت، ئاڵۆزتر لێ دێت و زیانێکی گەورەش بە بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی گەلی کوردستان دەگەینێت. کەرکوك و ئەو ناوچانەی کە ناکۆکییان لەسەرە، قووڵایی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەی کوردێك دەهێنن و رووبەڕووی سەرجەمی ئەم دەڤەر و ناوچانەی نزیکی نیوەی خاکی کوردستان پێك دەهێنن. (بروانە: خشتەی ژمارە (١٤). لە رووی مێژووی و جۆگرافی و ئەتنییەیەوە، هیچ جۆرە گومانێك لە کوردستانی بوونی ئەم دەڤەرانە ناکرێت و دەکەونە چوارچێوەی سنووری هەرێمی کوردستان. بۆیە ڕێگە چارەی دیموکراسی و ئاشتییانە بۆ یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ئەم دەڤەرانە، جێبەجێکردنی تەواوی بەندی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیە، کە لەم رووەوە میکانیزمێکی گونجاوی بۆ دانراوە، ئەویش (ئاسایی کردنەوە، ئامار و ریفراندۆم)، ئەم ڕێگە چارەیە کۆك و تەبایە لەگەڵ گشت بنەما و پرەنسیپەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ، هەروەها بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی.

---

قراء ة سريعة فى تقرير بيكر هاملتون : www.aljazeera.net/nr/expres/2006/12/17

تقرير بيكرهاملتون"علاج خاطیء:

news.bbc.co.uk/hi/Arabic/press/newsid_61600/6167741.htm

واجه تقرير بيكلر هاملتون (مجموعة دراسة العراق) الرفض الشديد:

www.elaph.com/elaphweb/elaphwriter/2006/12/12

(١٢٩) بڕوانە: سایتی گروپە قەیرانە نێو دەوڵەتییەکان:

http://www.crisisgroup.org/nome/index.cfm?id=47828

| یەکە ئیدارییەکان | ڕێژەی ژمارەی دانیشتووان لە کۆی گشتی | ڕێژەی پانتایی لە کۆی گشتی |
|---|---|---|
| قەزای سنجار | ٩ ,٤ | ٧, ٢ |
| قەزای تەلەعفەر | ١٢, ٨ | ١١, ١ |
| قەزای تلکیف | ٥, ٠ | ٣ , ١ |
| قەزای شێخان | ٢ , ٢ | ٣, ٣ |
| قەزای حەمدانییە | ٤ , ٧ | ٢, ٩ |
| قەزای مخمور | ٥ و٦ | ٦, ٨ |
| قەزای کەرکوك | ٢٥, ١ | ١٣, ٨ |
| قەزای حەویجە | ٤, ٨ | ٧, ٧ |
| قەزای دووبز | ١ ,٧ | ٤, ٠ |
| قەزای کفری | ٤, ٠ | ٥, ٥ |
| قەزای دووز خورماتو | ٨, ٤ | ٥ , ٨ |
| قەزای خانەقین | ١٠ , ٥ | ٨ , ٧ |
| شارۆچکەی مەندەلی | ٢ , ٦ | ٢ , ٩ |
| شارۆچکەی قەزانییە | ٠ , ٩ | ٨ ٬ ١ |
| قەزای بەدرە | ١, ٤ | ٩ , ١ |

**بڕوانە خشتەی ژمارە (١٧). ناوچە دابڕاوەکان، ڕێژەی ژمارەی دانیشتووان و پانتایی.**[١٣٠]

(١٣٠) بڕوانە: د خليل اسماعيل محمد، المنطقة المتنازع عليها بين الحاضر الملتهب؛ المستقبل المجهول، مكتب الفكر والتوعية، (ي ،ن ،ك) سليمانية، ص٢٦.



لە کۆتاییدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکریت کە پێویستە سەرکردایەتی سیاسی کورد بەردەوام بێت لەسەر ئەو ڕێگەچارە دیموکراسییە کە لە دەستووردا هاتووە، بۆ پراکتیزەکردنی بەندی ١٤٠ دەستووری هەمیشەیی هاوکات لەگەڵ ئەمە پێویستە هەوڵەکانی خۆی لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە چڕتر و کاریگەرتر بکات، پێویستە لایەنی کوردی قەناعەت بە پێکهاتەکانەی دیکەی شاری کەرکوك بهێنێ کە پراکتیزەکردنی ئەم بەندە دەستوورییە و گەڕانەوی ئەو ناوچانەی کە ناکۆکییان لە سەرە بە بەمانای پەراوێزکردنی پێکهاتەکانی دیکەی نایەت. لە لایەکی ترەوە و لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی زۆر پێویستە سەرکردایەتی لە هەوڵە سیاسی و دیپلۆماسییەکانی خۆی بەردەوام بێت و چڕتر و کاراتری بکات بۆ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا پشتگیری ئەم چارەسەرە دیموکراسییە بکەن.

## باسی چوارەم

## پەیڕەوکردنی دیبلۆماسییەتێکی بەهێز و چالاك لە سەر ئاستی دەرەکی

لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و دارمانی یەکێتی سۆڤییەت و لە بەریەك هەڵوەشانی فاکتەری نێودەوڵەتی تارادەیەك بە ئاراستەی پشتگیری کردنی گەلانی چەوساوەو ستەمدیدە گۆڕانکاری گەورە و مەزنی بە خۆیەوە بینی وە. لەم رووەوە رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی بینیوە لە رزگارکردنی گەلانی چوارچێوەی دەولەتی یوگسلافیا، پشتگیرکردنی تیموری رۆژهەڵات، سەرپەرشتیکردنی دانوستاندنەکانی نێوان بزووتنەوەی رزگاریخوازی سوودان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی، بەهاناوە چوونی دانیشتووانی هەرێمی دارفۆر، هەروەها لێك نزیکردنەوەی هەردوولایەنی ئیسرائیلی- فەلەستینی.

بێگومان ئەم گۆڕانە پوزەتیڤانەی فاکتەری نێودەوڵەتی بەئاراستەی پشتگیری کردنی گەلانی چەوساوە، گەلی کوردیشی گرتەوە، لە دوای کۆچڕەوە ملیۆنییەکەی گەلی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١دا، رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی گێرا لە دەرکردنی بڕیاری (٦٨٨)دا و دامەزراندنی نەوای ئارام و ناوچەی دژەفرین(no flay zone) لە هەرێمی کوردستان و پاراستنی لە هەڕەشە و دەستتێوەردانی حکوومەتی ناوەندی و دەوڵەتە دراوسێکان.[١٣١]

لە لایەکی ترەوە فاکتەری نێودەوڵەتی بە تایبەت ئەمریکی لە دوای رووداوە تیرۆریستییەکەی ١١ی ئەیلولی ٢٠٠١ لە ئەمریکا بە شێوەیەکی کاریگەرتر و چالاکتر هاتووتە مەیدانەوە، لە پێناوی بەرانگاربوونەوەی تیرۆری نێودەوڵەتی و لادانی رژێمە دیکتاتۆر و خوسەپێنەرەکان، هەوڵ دان بۆ هێنانەدی گۆڕانکاری هەمە لایەن و بەرفراوان لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتی، سیاسی و رۆشنبیرییەوە لە جیهان بەگشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی، هەروەها کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر گۆڕانکارییە سیاسییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چۆنییەتی ئاراستەکردنیان، هەموو ئەمانەش وا دەکەن، لەم قۆناغەی کە کورد

(١٣١) بڕوانە: صلاح بدر الدين، نحو عقد سياسي بين الكرد والعرب، في: الملتقى الثقافي الكردي -العربي، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٤، ص ٥٣-٥٥، عومەر نورەدین، سەروەری دەوڵەت و پێوەندی بەدوزی کوردەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٩-٤٦، و بەدواوە.



پیایدا تێپەردەبێ پێویستە لە سەر ئاستی دەرەکی دیپلۆماسییەتێکی چالاك و کاریگەر و بەهێز پەیڕەو بکات و لەگەڵ گۆڕانکارییەکان بڕوات و خۆی بگونجێنێ لەگەڵ بەرژەوەندی زلهێزەکان و هەوڵ بدات تەواوی سەنگ و قورسایی خۆی لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە بەکاربهێنێ بۆ سوود وەرگرتن لە فاکتەری نێودەوڵەتی لە پێناوی دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانی خۆی، لەم چوارچێوەیەدا پێویستە لە سەر ئاستی دەرەکی کورد ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژێ:

### ١- لەسەر ئاستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

ئەمریکا بە هۆی ئەو توانایەی کە هەیەتی لە رووی سەربازی، ئابووری، تەکنەلۆژی و سیاسییەوە رۆڵێکی گرنگ و بنەڕەتی لە هەڵسوڕاندنی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا دەگێڕێ و کاریگەری تەواوی هەیە لە سەر گۆڕانکارییە سیاسییەکانی جیهان بەگشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی سەبارەت بە کوردیشەوە، ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩١دا رۆڵێکی گرنگی بینیوە لە دامەزراندنی ناوچەی ئارام و بەردەوامی پاسەوانێتی نێودەوڵەتی بۆ هەرێمی کوردستان و گوشار خستنە سەر حکوومەتی ناوەندی و دەوڵەتانی دراوسێ بۆ دەستوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی کوردستان، و هەروەها لە چەسپاندنی پرۆسەی ئاشتی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و کۆتایی هێنان بە شەڕی ناوخۆی کوردستان ساڵی ١٩٩٨دا، رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەبووە.[١٣٢]

لە دوای لادانی رژێمی بەعس لە عێراقیش پەیوەندی نێوان کورد و ئەمریکا پێشڤەچوونەکی باشی بەخۆیەوە بینیوە، کورد و ئەمریکا بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە لە عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و ئەم بەرژەوەندییانە هاودژ و ناکۆك نین لەگەڵ یەکتر، ئەمریکا لە توانای دایە پشتگیری و یارمەتی کورد بدات سەبارەت بە مەسەلەی پیادەکردنی سیستەمی فیدراڵی لە عێراق و پراکتیزەکردنی بەندی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشە پەیوەست بە پرسی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان و بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و ئابووری هەرێمی کوردستان و پاراستنی لە دەست درێژی و هەڕەشەی دەوڵەتە دراوسێکان، لە بەرامبەریشدا، ئەمریکا هەوڵ

(١٣٢). بڕوانە: عومەر نورەدین، سیستەمی نوێ........، ل ٣٥٠-٤٢١؛ د. خالد يونس خالد، مصدر سابق، ص٤١٨.

ئەدەت بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزی لە ڕێگەی گرتنەبەری ئەم ڕێ و شوێنانەی خوارەوە:[١٣٣]

١- ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر، بەو پێیەی هەڕەشە و مەترسین بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٢- ڕێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی کۆمەڵکوژ.

٣- پارێزگاری کردن لە جێگرکردنی نرخی نەوت و دابین کردنی.

٤- دابینکردنی ئاسایشی ئیسرائیل.

٥- پەرەپێدانی دیموکراسییەت و مافی مرۆڤ.

٦- چاکسازی دیفورمی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری.

ئەم بەرژەوەندی و ستراتیژییەتی ئەمریکا لە جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاوئاراستەیە لەگەڵ بەرژەوەندی گەلی کورد. بە تایبەت لە کوردستانی عێراقدا. هەرێمی کوردستان دەتوانرێ ببیتە یەکێك لەو فاکتەر و پێگەیانەی کە یارمەتیدەرو پاڵپشتی کەر بێ بۆ ئەمریکا لە پرۆسەی بە دیموکراسی کردنی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

هاوکاری نێوان کورد و ئەمریکا لە دوای ڕژێمی بەعس لە عێراق بە تەواوەتی ئەم بۆچوونە پشت ڕاست دەکاتەوە، ئەمەش بە پێچەوانەی هەلوێستی زۆربەری دەوڵەتەکانی ناوچەکەیە لە وانە: (ئێران، سوریا، تورکیا، عەربستانی سعودی) کە بە توندی دژایەتی ئەم گۆڕانکارییانە دەکەن.

بۆیە کورد دەبی هەوڵ بدات خۆی بگونجێنێ لەگەڵ بەرژەوەندی و ستراتیژییەتی ئەمریکا و لەم ڕووەشەوە پشتگیری ئەم وڵاتە دەستەبەر دەکات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی و بەدیهێنانی مافەکانی.

ئەمەش بەو شێوەیە دەبێ کە کورد هەوڵ بدات لەسەر ئاستی دەرەوە دیپلۆماسییەتێکی بەهێز پەیڕەو بکات و خۆی لە ناوەندەکانی دروست کردنی بڕیار لە ئەمریکا نزیك بکاتەوە لوبییەکی بەهێز لە واشنتون بخاتە گەر.

(١٣٣) د. جمال مصطفى عبدالله السلطان، الاستراتيجية الامريكية في الشرق الاوسط، الطبعة العربية الاولى، مطبعة الارز، عمان، ٢٠٠٢، ص ص (٤٣-٦٦) و(١١٤+١٣٢).



لەم چوارچێوەیەدا، سەبارەت بە سیاسەتی سەرکردایەتی کورد لەم قۆناغەدا و چونییەتی قەناعەت پێکردنی ئەمریکا و ڕای گشتی ئەم وڵاتە بۆ پارستنی بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردستان (د.مارتن سلان) ئوستادی زانستی سیاسەت لە زانکۆی (مایکون ستایتی) ئەمریکی ئاماژە بەوە دەکات کە: "کورد زۆر پێویستە پەیوەندییەکی توندوتۆلی لەگەڵ ئەمریکادا ببەستێ لە سەر ئاستی دەرەوە و ناوەوە، سەرکردایەتی سیاسی کورد و حکوومەتی هەرێمی کوردستان لەسەر ئاستی ئەمریکا پێویستە هەندێك کەسانی شارەزا و پسپۆر لە بواری پەیوەندییە گشتییەکاندا بدۆزنەوە. تاکو بە شێوەیەکی چالاك و کاریگەر نوێنەرایەتی ئەجندەیی کورد بکەن و بەرگیری لە بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردستان بکەن. زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس شارەزای کاروباری کوردستان نین و زانیاری و تێگەیشتنیان لەسەر کورد زۆر کەمە، هەندێکیشیان هەر شارەزایی کوردستان نین. بۆیە حکوومەتی هەرێمی کوردستان، دەبێ هەوڵەکانی خۆی چڕتر بکاتەوە بۆ ئەوەی لوبییەکی بەهێز و کاریگەر لە واشنتون بخەنەکار و پێویستە ئەم لوبییە خۆیان بگەینە ناو ژوورەکانی ئەندامانی کۆنگرێس لە هەردوو پارتی کۆماری و جمهوری و گفتووگۆ و دانوستاندن لەگەڵیان بکەن تاکو ئاگاداری کورد بن وبەرژەوەندییەکانی بپارێزن لەم ڕووەشەوە کورد دەبێ بیسەلمێنێ دۆستی ڕاستەقینەی ئەمریکایە، بەهەمان ئاراستە پێویستە کورد لەگەڵ لوبییەکانی جوولەکە، یۆنانییەکان، ئەرمەنستان، پێوەندییەکی بەهێز دروست بکات، لە هەمانکاتیشدا دەبێ کوردستان لەسەر ئاستی ناوخۆی خۆیان دیموکراسییەتێکی ڕاستەقینە پەیڕەو بکەن و هەوڵ بدەن بۆ نەهێلانی گەندەلی، لەسەر ئاستی ڕاگەیاندنیش لە ئەمریکا پێویستە هەموو تواناکانی خۆی بخاتە گەر بۆ ئەوەی دوزی خۆی وەك دۆزێکی ڕەوا پێشانی ڕای گشتی ئەمریکا بدات، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ پەیوەندی بە کەناڵە ناودار و پڕجەماوەرییەکانی ئەمریکا و جیهان بکەن و هەوڵ بدەن لە ڕێگەی ئەم کەناڵانەوە ڕەوایی کێشەی خۆیان پێشانی ڕای گشتی ئەمریکی و جیهان بدەن".[١٣٤]

بەهەمان ئاراستە د. (کارول ئولێری) لە زانکۆی ئەمریکا، پێیوایە کە: "کورد دەبێ هەوڵ بدات بە شێوەیەکی زۆرچڕ و فراوان گفتوگۆ و دانوستاندن لەگەڵ هەردوو پارتی دیموکراتی و

(١٣٤). د. مارتن سلان، دیدارەکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٢٩)، هەولێر، ٢٠٠٧/٤/٩، ل٤٨-٥٣.

جمهوری ئەنجام بدات، بە تایبەت دیموکراتییەکان کە ئێستا لە هەردوو ئەنجوومەنی نوێنەران و پیراندا زۆرینەن، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی لە کێشەی کورد تێبگەن، لەلایەکی ترەوە زۆر پێویستە لوبی کوردی لە واشنتۆن هەبێ، هەوڵ بدات راستەوخۆ قسە بۆ نوێنەرەکانی هەردوو پارتی دیموکراتی و جمهوری ناو کۆنگرێس بکەن، هەروەها بەرپرسانی کورد داوەتی واشنتۆن بکەن بۆ ئەوەی لە ناوەند گرنگەکانی بیرکردن و لێکۆڵینەوەی ئەمریکی وەك ئامۆژگاری پروکینگز، ئامۆژکاری ئینتەرپرایزی و چەندین ئامۆژگاری دیکە کە هەن لە واشنتۆن قسە بۆ رۆشنبیران و شارەزایانی ئەمریکا بکەن سەبارەت بە پرسی کورد".[١٣٥]

هەر پێوەند بەم مەسەلەیەوە (د.توماس ئەمبروسوی)، ئوستادی تەنگژە ئیتینەکان و سیاسەتی نێودەوڵەتی لە زانکۆی ڤیرجینیای ئەمریکی هەمان بۆچوونی هەیە پێیوایە کە: "کورد پێویستی بە خستنەگەڕی کاریگەری لوبی هەیە بە شێوەیەك و تا ئەو ئاستەی لە کۆنگرێس و ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، چەندین ئەندام بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی کورد بکەن، هەروەها پەیوەندی کردن بەو کەسانەوە کە کاریگەرییان هەیە لەسەر رای گشتی ئەمریکا بۆ ئەوەی رەوای دۆزی کورد پێشانی رای گشتی ئەمریکا بدەن".[١٣٦]

لە لایەکی ترەوە بە هۆی ئەو بارودۆخە هەستیارە کە کورد تێیدا تێپەردەبێ زۆر بوونی هەڕەشە و گوشارە جۆراوجۆرەکانی ناوخۆیی و دەوڵەتانی دراوسێی، کورد پێویستییەکی زۆری بە بوونی بنکەیەکی سەربازی ئەمریکی هەیە و لەم رووەوە پێویسە کورد قەناعەت بە ئەمریکا بهێنێ بو دانانی بنکەیەکی سەربازی لە کوردستان، بەتایبەتی لەم رووەوە کۆمەڵێك کەسایەتی ناوداری ئەمریکی پشتگیری ئەمە دەکەن. (مادلین ئولبرایت) لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گوڤاری (شیترنی) چاپی ئەڵمانی لە ١٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا ئاماژەی بەوە کرد کە پێویستە ئەمریکا بەشێك لە هێزەکانی خۆی بۆ پاراستنی کوردەکان لە هەڕەشەی دەوڵەتانی دراوسێ لە عێراقدا بهێلێتەوە.[١٣٧]

(١٣٥). د. کارول ئولێری، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گولان، ژمارە (٦١٨)،هەولێر، ٢٠٠٧/١/١٥، ل٢٤.

(١٣٦). د. توماس ئەمبروسی، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گولان، ژمارە(٦٢٦)، ٢٠٠٧/٣/١٢، ل١٣.

(١٣٧). وەرگیراوە لە رۆژنامەی خەبات، ژمارە (٢٧٣٤)، ١٨ کانوونی دووەمی ٢٠٠٧.



بێگومان بوونی بنکەیەکی سەربازی لە هەرێمی کوردستان گرنگی و بایەخێکی تایبەتی دەبێ سەبارەت بە کوردەوە. گرنگی بوونی ئەم بنکە سەربازییە بۆ هەرێمی کوردستان خۆی لەوەدا دەبینێت کە دامەزراندنی ئەم بنکە سەربازییە وادەکات کوردەکان لە هەڕەشەو دەست درێژی دەوڵەتانی دراوسێ بپارێزێ. هەروەها هەرێمی کوردستان لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە سەقامگیری و پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ، یارمەتی دەردەبێ بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بەرفراوان کاری بازرگانی تێیدا بکرێت، سارمایەدارەکانیش بە دڵنیاییەوە دەتوانن سەرمایەکانیان بخەنەگەر.[١٣٨]

**٢- لەسەر ئاستی ئەورووپا:**

بێگومان دەوڵەتانی ئەورووپی و یەکێتی ئەورووپا، بونیادی سیاسی زۆر گرنگ و بەهێزن لە جیهان بەگشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی، ئەم دەوڵەتانە گەورەترین تەوەری جیهانین لە دوای ئەمریکا لە سیستەمی ئەمڕۆی جیهاندا، کاریگەری گەورە و مەزنیان هەیە لەسەر رەوتی رووداوەکان و ئەو گۆڕانکارییانەی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دێنەکایەوە، لە ناوەندی دەرکردنی بڕیاری جیهانی دا حسابی وردی بۆ دەکرێت بە تایبەت ئەو دەوڵەتانەی ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتین، دەوڵەتانی ئەورووپا بە تایبەت فەرەنسا و بەریتانیا رۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان هەبووە سەبارەت بە دامەزراندنی پاسەوانێتی نێودەوڵەتی بۆ هەرێمی کوردستان، ئەم دەوڵەتانە زیاتر ناسراون و کاریگەرن لە ناوەندەکانی جیهاندا بۆ پشتگیری کردنی مافەکانی مرۆڤ و یارمەتی دانی گەلانی چەوساوە[١٣٩]، هەروەها دەتوانن زیاتر لە ئەمریکا یارمەتی کورد بدەن بۆ بنیادنانی ئابووری کوردستان و گەشەسەندن و فراوانکردنی بواری بازرگانی و بەگەڕخستنی سەرمایە لە کوردستان، سەبارە بە تورکیاش کارتی گرنگیان

(١٣٨) د.جانسون بیرگن، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گولان، ژمارە(٦٢٧)، هەولێر، ٢٠٠٧/٣/١٨، ل٢٣.

(١٣٩) بڕوانە : مایکل م. گونتر، العامل الکوردي في السیاسة الخارجیة الترکیة، في: هنری پارکی و اخرون، القضیة الکوردیة في ترکیا، ترجمە: هەڤال، الطبعة الاولی، مطبعة ئاراس، ٢٠٠٧، ل١٠٩.

بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی گوشار بخەنە سەری، بۆ خۆ دوورخستن لە دەستتێوەردان لە کاروباری هەرێمی کوردستان.[١٤٠]

هەلومەرج و بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان وا دەخوازێ کورد پەرە بە پەیوەندییەکانی خۆی بدات لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپا و یەکێتی ئەوروپا. بۆ ئەوەی ئەم وڵاتانە پشتگیری لە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بکەن. بە تایبەت لە دوای گۆڕانکارییەکانی ٢٠٠٣ لە عێراق، دۆزی کورد هەڵکشانی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە. ئاستی بەنێو دەوڵەت بوونی زۆر بەرەو پێش چووە، توانیویانە تا رادەیەکی زور بەرپەرچی ئەو هەوڵانەی تورکیا و دەوڵەتانی ناوچەکە بدەنەوە کە بە درێژایی سەدەیەکە ویستویانە پرسی کورد، وەك کێشەی تیرۆرو فاکتەری ناسەقامگیری پیشانی رای گشتی بدەن.

هەروەك لیام اندرسن و **غاریث** ستانسفیلد ئاماژەی بۆ دەکەن کە: " دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان ویستیان وای پیشان بدەن کە بوونی کیانێکی کوردی لە باشووری کوردستان دەبێتە هۆی فاکتەری ناسەقامگیری لە ناوچەکەدا، بەڵام پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکان پێچەوانەی ئەوەیان سەلماند، کوردەکانی عێراق لە دوای دارمانی رژێمی بەعس ئەو راستییەیان سەلماند ئەگەر رێز لە مافەکانی گەلی کوردستان بگرن و وەك نەتەوەیەك سەیریان بکەن ئەوا گەورەترین پاڵپشتی دیموکراسی و فاکتەری ئاشتی و تەباین لە ناوچەکەدا".[١٤١]

بۆیە لەم قۆناغەدا خستنەگەڕی لوبییەکی کوردی بە هێز و چالاك و هەروەها جالییەی کوردی لەسەر ئاستی یەکێتی ئەوروپا و دەوڵەتانی ئەوروپا، بە تایبەت دەوڵەتانی وەك بریتانیا، فەرەنسا، بەلجیکا، ئەڵمانیا، و هەموو ئەوانەی کە قورسایی و سەنگی خۆیان هەیە، دەبێ لە پێشەوەی بەرنامە گرنگەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بێت، ئەم لوبییە دەبێ هەوڵ بدات لە سەر ئاستی تاکەکەس و بە کۆمەڵ، دوستی زیاتر بۆ کورد پەیدا بکەن، هەروەها بەشدار بن لە کونفرانس و کۆبوونەوە نێو دەوڵەتەییەکان.[١٤٢]

---

(١٤٠) بڕوانە: کریم یلدز، ترکیا، الکورد والاتحاد الاوربی، فی هنری پارکی و اخرون، المصدرالسابق، ص١٥٥ وما بعدها، پیتەرو گالبریش، کۆتایی عێراق،...، ل ٢٨٩.

(١٤١) لیام اندرسن و غاریث ستانسفیلد، مصدر سابق، ص ٤٠٠.

(١٤٢) د. جوان حەقی، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە(٦٤٠)،هەولێر، ٢٠٠٧/٦/٢٥، ل٤٣.



### ٣- لەسەر ئاستی هەرێمی:

یەکێك لەو هۆکار و فاکتەرانەی کە لە سەدەی بیستەمدا، بە تایبەت لە سەردەمی جەنگی ساردا رێگربوون لە بەردەم بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بۆ ئەوەی بتوانێ لەسەر ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی و گەمە و مانۆری سیاسی بکات. سوود لە ناکۆکی و جیاوازی لە نێوان دەوڵەتانی ناوچەکە وەربگرێ، بریتی بووە لەو گەمارۆ سیاسییە ناوچەیی و جیهانییەی کە بەسەریدا سەپێنرا بوو، ئەم گەمارویە وای کرد بوو، کورد نەدەتوانرا بە ئاسانی بجوولێت، و سوود لە ناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتان وەربگرێ.[١٤٣]

بەڵام ئێستا ئەم هاوکێشانە گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە، راستە دەوڵەتە دراوسێکان کوك و تەبان لە سەر دژایەتی کردنی کورد، بەرهەڵستی و دژایەتی سەرهەڵدانی هەر جۆرە کیانێکی کوردی لە عێراق و ناوچەکەدا دەکەن، بەڵام دەکرێت ئەوەش بلێین بە هۆی جیاوازی لە تێروانین و سیاسەتەکانیان لە هەمبەر پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەم هاوکێشە سیاسییە نوێیانەی کە لە عێراق هاتوونەتە ئاراوە، هەروەها هاودژی و لێك نەچوونی سیاسەتەکانیان لە هەمبەر ئەمریکا کە گەورەترین ئەکتەری سیستەمی نوێ جیهانییە، هەمووی ئەم هۆکارانە وای کردووە، کە کورد، دەتوانی سوود لە ناکۆکییەکانی نێوان ئەم دەوڵەتان وەربگری رێ بگرێت لەوەی کە ئەم دەوڵەتانە لەیەك کاتدا دژی هەرێمی کوردستان یەك بگرن.

ئەمەش بەو شێوەیە دەبی کە کورد خۆی وای پیشان بدات کە هەڕەشە نییە بۆ سەریان و بە بەردەوامی گفتوگو دانووستاندن لەگەڵیان بکات. لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا پێوەندییان لەگەڵ ببەستێ بە تایبەت لە رووی ئابوورییەوە. (د. جامیس ستونەر) ئوستادی زانستی سیاسەت لە زانکۆی (هارڤاردی) ئەمریکا جەخت لەسەر ئەم خالە دەکات و پێوایە :" لە سەرئاستی هەرێمی پێویستە حکوومەتی هەرێمی کوردستان پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکان بە تایبەت تورکیا پەرەپێبدات لە رووی ئابووری و بازرگانییەوە، هانی جموجولی بازرگانی بدات لەگەڵ ئەم دەوڵەتانە، ئەمە دەبێتە هاندەرێك بۆ لێك نزیکردنەوەی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا، دەبێتە هۆی ئەوەی هەڕەشە و گوشارەکانی ئەم دەوڵەتە لە

---

(١٤٣). بڕوانە: ئەکرەم میهرداد، رەوشی جیهانی و پرسی کورد، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە (٥)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، ل١٢٩.

سەر كوردستان كەمتر لاوازتربن، لەبەر ئەوەی پەرەپێدانی پێوەندی بازرگانی و راكێشانی سەرمایەی توركی بۆ ناو هەرێمی كوردستان، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانەی بەرژەوەندییان لە هەرێمەكەدا هەیە بەرهەڵستی سیاسەتی هەڕەشە ئامێزی توركیا بكەن لە هەمبەر هەرێمی كوردستان". (١٤٤)

بێگومان فاكتەری ئابووری یەكێكە لەو فاكتەرانەی كە لە دونیای ئەمڕۆدا بە گرنگترین سەرچاوەی هێز دادەنرێت لە هەر وڵاتێكدا و كاریگەری راستەوخۆی لەسەر سیاسەت و هەلوێستی دەوڵەتان هەیە ئەگەر چی لە دوای دارمانی رژێمی بەعس پێوەندی سیاسی نێوان هەرێمی كوردستان و توركیا گرژی و ئالوزی زۆر پێوە دیارە، بەڵام لە روری بازرگانییەوە بەو شێوە نییە. ئاستی پیوەندی بازرگانی نێوان توركیا و هەرێمی كوردستان بەرەو پێشچوونێكی باشی بە خۆیەوە بینیوە. بۆیە حكوومەتی كوردستان دەبێ بەردەوام بێ لەسەر راكێشانی سەرمایەی دەوڵەتانی دراوسێ بە تایبەت توركیا بۆ ناو هەرێمی كوردستان. پەرەپێدانی پەیوەندی بازرگانی وا دەكات كە سەرمایەدارانی تورك قەیراناوی بوونی پەیوەندی نێوان هەردوو لا بە بەرژەوەندی خۆیان نەزانن و بەرهەڵستی ئەم جۆرە سیاسەتە بكەن. (١٤٥)

هاوكات لەگەڵ ئەم هەنگاوانەی سەرەوە پێویستە سەركردایەتی كورد بۆ كەمكردن یاخود لابردنی هەڕەشە و دەستتێوەردانەكانی توركیا لە كاروباری هەرێمی كوردستان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژێ:

١- برینی بیانووی توركیا بۆ مەسەلەی (p.k.k) و هەوڵدان بۆ قەناعەت پێكردنی پارتی كرێكارانی كوردستان بۆ ئەوەی واز لە خەباتی چەكداری بهێنێ و خەباتی سیاسی بكات.
٢- ئاگاداركردنەوەی رای گشتی جیهانی لە پێشیلكارییەكانی توركیا لە هەمبەر مافی كورد لە توركیا.
٣- دامەزراندنی كەناڵێكی تەلەفزیۆنی بە زمانی توركی، بۆ ئەوەی بتوانرێ راستییەكان بۆ رای گشتی توركیا ئاشكرا بكات.

(١٤٤). د. جامیس ستونەر، دیدارێكی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٦١)، ٢٠٠٧/١١/٢٦.ل.

(١٤٥) زریان رۆژهەڵاتی، رۆڵی فاكتەری وزە لە پەرەپێدانی، پەیوەندییەكانی نێوان توركیا و هەرێمی كوردستاندا، لە دوسیێ توركیا (گوڤار)، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی، ژمارە(٦)، ئابی ٢٠٠٧، ل١٥.



٤- بەهێزكردنی پەیوەندییەكانی خۆی لەگەڵ لایەنە دیموكرات خوازەكانی توركیا.
٦- ناردنی وەفدی حزبی — حكوومی بەردەوام بۆ دەوڵەتە دراوسێكان بۆ ئەوەی لە نزیكەوە گفتوگۆ لەگەڵ یاندا بكەن.
٧- پشتگیری كردنی توركیا لە وەرگرتنی لە یەكێتی ئەورووپا.

لە كۆتایی ئەم باسەدا دەبێت ئاماژە بەوە بكەین كە بۆ ئەوەی فاكتەری كوردی لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە كاریگەری خۆی هەبێ و لە لایەن كومەڵگای نێودەوڵەتییەوە زیاتر پشتگیری لە دۆزی كورد بكرێت، لە هەمانكاتیشدا كورد بتوانێ لە روانگەیەكی بەهێزەوە مامەڵە لەگەڵ هاوكێشە سیاسییەكانی عێراق و ناوچەكە بكات و رووبەڕووی هەڕەشە و مەترسییەكان ببێتەوە. لە سەر ئاستی ناوخۆشی پێویستی بە كۆمەڵێ گۆڕانكاری گەورە هەیە، لەوانەش قووڵكردنی پرۆسەی دیموكراسی و پراكتیزەكردنی دیموكراسییەتی راستەقینە، بەسەروەركردنی یاسا و كۆمەڵگای مەدەنی و رێزگرتن لە مافەكانی مرۆڤ و دابینكردنی پانتایەكی فراوان بۆ ئازادی را دەربرین، هەروەها بێ لایەنكردنی دادگاكانی هەرێم و دەست كردن بە هەڵمەتێكی بەر فراوان لە چاكسازی و پاكسازی لە دامودەزگانی حكوومەتی هەرێم و بەرەنگاربوونەوە و قەڵاچۆكردنی گەندەلی كە ناوە ناوە لە ناوەندەكانی جیهانیدا باسی لێوە دەكرێت.

بێگومان هەمووی ئەم ریفۆرمە پۆزەتیڤانە وادەكات كە سەنگ و قورسایی كورد لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە زیاتر ببێت جەماوەر و هاوڵاتیانی كوردستان زیاتر متمانەیان بە حكوومەت دەبێت و سەركردایەتی كوردستان زیاتر دەتوانێ بە پشتببەستن بە ئیرادەی گەلەكەیان رووبەرووی هەرەشە و مەترسییەكان ببنەوە، هەروەها كۆمەڵگەی نێودەولەتی بە تایبەت ئەمریكا و دەوڵەتانی ئەورووپی یەكێتی ئەورووپا، تەنانەت دەوڵەتانی وەك روسیا و چین زیاتر ئامادە دەبن پشتگیری كورد بكەن

## ئەنجامەکان

لە دوای لێکۆڵینەوەی هەمە لایەنەی توێژینەوەکە گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- دروستبوونی دەوڵەتی عێراق لە سەرەتای سەدەی بیستەم، دواتریش لکاندنی کوردستانی عێراق بە جەستەی ئەم دەوڵەتەوە؛ لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانی و سیاسەتی بەرژەوەند خوازی دەوڵەتە زلهێزەکان بە تایبەت بەریتانیا بووە. نەك رەزامەندی و بەرژەوەندی و هاوبەش لە نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراقدا.

٢- لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە، بە ئارەزو و حەز و ویست و بەرژەوندی و خواستەکانی گەلی کورد و بە پێی پرەنسیپ و بنەماکانی مافی چارەی خۆی نووسینی گەلان نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێناسەی عێراقی بوون بە سەریدا سەپێنراوە. ناچار کراووە لە چوارچێوەی ئەم ولاتەدا بژیت.

٣- بوونی زۆری نەوت و سامانی سروشتی، هەروەها پێگە و شوێنی ستراتیژی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی)؛ فاکتەری زۆر گرنگ بووە بۆ خزاندنی ئەم بەشەی کوردستان بۆ ناو چوار چێوەی دەوڵەتی عێراق. سەرەرای بوونی نەوت، بەریتانیا وای بۆ دەچوو پاراستنی هەرێمی میزوپۆتامیا بە بێ ویلایەتی موسڵ کارێکی زۆر قورس و گرانە و پێویستی بە ژمارەیەکی زۆری سەرباز هەیە. هەر بۆیەش هەموو تواناکانی خوی خستەگەڕی بۆ لکاندنی ئەم بەشە کوردستان بە عێراقەوە.

٤- هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، ولاتە زلهێزەکان لە گوڕ بەرژەوەندیە ستراتیژییەکانی خویان، تایفەی عەرەبی سوونی بە سەر زۆرینەی پێکهاتەکانی دیکەیدا بە تایبەت کورد و شیعەدا سەپاند.

٥- حکوومەتەکانی عێراق باوەریان بە ماف و داخوازییەکانی گەلی کورد نەبوو. بەردەوام جەختیان کردۆتە سەر ئەوەی کە کوردستان بە گەڵ و خاکەوە بەشێکە لەنەتەوە و نیشتیمانی عەرەب؛ و لێی جیا نابێتەوە. هەر بۆیەش هەرگیز ئامادە نەبوونە لەگوڕ بنەما و پرەنسیپەکانی مافی چارەی خۆنووسین و لە رێگەی ئاشتی و دیموکراسییەوە ئەم پرسە چارەسەر بکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام هەوڵیان داوە لە رێگەی سەربازی و کوشتن و قڕکردن ئەم پرسە یەکلا بکەنەوە.



٦- ئامانجی سەرەکی حکوومەتەکانی عێراق، بە تایبەت لە سەردەمی رژێمی بەعس لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی تەعریب و پرۆسەکانی ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورد؛ بریتی بووە لە بە کەمینە کردنی کورد و کەمکردنەوەی رێژەی کورد بە نزمترین ئاست بە شێوەیەك هیچ کاتێك نەتوانێت ببێتە هەرەشە و مەترسی بۆ سەر شوناس و ناسنامەی عەرەبی عێراق. ویستویانە بیکەنە کەمینەیەکی بێ خاك و ناسنامە و مێژوو لەم ولاتەدا.

٧- دەوڵەتە زلهێزەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی، پیلانی دووبارە داڕشتنەوەی نەخشەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست یان داڕشتبوو. رێککەوتبوون لە سەر پارچە پارچە کردنی دەوڵەتی عوسمانی و دەست بە سەر داگرتنی؛ بە شێوەیەك لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان بگونجێ. ئەگەر چی بە هۆی ئەو پێشهات و گۆڕانکارییە سیاسیانەی کە بەروودانی شۆڕشی بەلشەفی رویدان؛ تا رادەیەك نەخشەکەیان گۆڕانکاری تێکەوت، بەلام لە هەموو حاڵەتێکدا بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان چەند دەوڵەتێکیان دروست کرد و چەند نەتەوەیەکیشیان وەکو کورد بێ دەوڵەت هێشتەوە.

٨- زۆربەی ئەو راگەیاندن و بلاوکراوانەی کە زلهێزەکان لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانی دەریان کرد، سەبارەت بە مافی چارەی خۆنووسینی گەلان و رێزگرتن لە ئیرادەی گەل و نەتەوەکانی چوار چێوەی دەوڵەتی عوسمانی، تەنیا بۆ چەواشەکردنی رای گشتی و راکێشانی سۆزی ئەم گەلانە بوو بۆ لای خۆیان، بەلام بەشێك نەبووە کە ستراتیژییەکانیان و هەرگیز رێزیان لە ئیرادەی گەلان نەگرت. و پابەندی بەڵێنەکانی خۆیان نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ پاراستن و جێگیرکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، گەمەیان بە چارەنووسی نەتەوەکان بە تایبەت نەتەوەی کورد کرد.

٩- دەوڵەتە برپیار بە دەستەکان لە دوای دارمانی دەوڵەتی عوسمانی، نەیانویستووە کێشە و گرفتەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەشێوازەکی ئاشتی و دیموکراسیانە چارەسەر بکرێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە هەوڵیان داوە کۆمەڵێك کێشەی تر دروست بکەن. هەندێك گرفتیش بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە. بۆ ئەوەی بتوانن ئەم کێشەو گرفتانە وەك وەرەقەیەك بۆ پاراستنی بەرژەوەندی بە کاری بهێنن. بەریتانیا بە دروستکردنی پرسی کورد، توانی زۆربەی مەرجەکانی خۆی بە سەر عێراق و تورکیا دا بسەپێنێ.

١٠- سەبارەت بەوەی کورد لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی نەیتوانی تەنانەت چوارچێوەیەکی ئۆتۆنۆمیش بۆ خۆی دەستەبەر بکات؛ راستە دەوڵەتە زلهێزەکان بەرپرسیاری یەکەم بوون، بەڵام بەشێکی ئوباڵەکەی دەکەوێتە ئەستۆی خودی کورد. دەوڵەتانی وەك فەرەنسا، بەریتانیا، تورکیا و دەوڵەتانی تر، هەموویان بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان هەڵسوکەوتیان دەکرد. تاکە لایەن کە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی هەلسوکەوتی نەدەکرد کورد بوو. سەرەڕای ئەوەی زۆربەی بەندەکانی پەیمانی سیڤەر بۆ باکووری کوردستان تەرخان کرابوو؛ بەڵام سەرکردەکانی کورد لە باکووری کوردستان هیچ هەولێکی ئەوتۆیان نەدا بۆ ئەەی ئەو پەیمانە کە لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بڕیاری لە سەر درا بوو بسەپێنن و بیکەنە واقع. سەرکردە کوردەکان لە جێگای ئەوەی بەرەیەکی هاوبەش پێك بهێنن بۆ رزگارکردنی نیشتیمانەکەیان و ستراتیژییەکی هاوبەشیان هەبێ. باوەڕیان بە قسەی مستەفا کەمال کرد. شانبەشانی تورکەکان دژی یۆنانییەکان شەڕیان کرد. تاکو تەرازوی هێز بۆ بەرژەوەندی تورکەکان شکاندیانەوە و هاوکێشەکان گۆڕانکاریان بە سەر داهات. لە هەموویان سەیرتر لە دوای هەڵوەشانەوەی پەیمانی سیڤەر، کوردەکان هیچ جۆرە نارەزایەکیان دەرنەبڕی وەك ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێ.

١١- دۆزی کورد بە هۆی ئەو پارچە پارچە بوونەی تووشی بووە، رەهەندی هەرێمی و لەوێشەوە رەهەندێکی نێودەوڵەتی وەرگرتووە. بەو مانایەی دەوڵەتانی هەرێمی سەرهەڵدانی هەر جۆرە کیانێکی کوردی لە هەر پارچەیەکی کوردستان، بە هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان لێکی دەدەنەوەو. لە ئاستی ئەو هەڕەشانە دا دەست وەستان نەبوونە. بەردەوام هەولێان داوە بە سیاسەت و ستراتیژییەکی هاوبەش لە سەر ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتی ڕووبەڕووی کورد ببنەوە، هەر بۆیەش بە درێژایی سەدەی بیستەم تاکو رووخانی بلۆکی کۆمۆنیستی، توانیویانە پرسی کورد بیکەنە کێشەی ئاسایش و تێکەڵی شەڕی ساردی نێوان دوو جەمسەری بکەن. بەمەش توانیویانە فاکتەری نێو دەوڵەتی بە ئاراستەی هاودژ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کورد بخەنە گەڕێ، کۆماری مهاباد ١٩٤٦ و شۆڕشی ئەیلول دوو نموونەی زیندون؛ کە بوونە قوربانی ململانێ نێوان دوو جەمسەر.

١٢- لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی  تاکو کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، بە هۆی ئەوەی دۆزی کورد و بزافی رزگاریخوازی کورد لە ژێر گەمارۆی سێ فاکتەری یەك لە دوای یەکی



ناوخۆیی، هەرێمی و نێودەوڵەتی دا بوو؛ و ئەم فاکتەرانە هاودژ بوونە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد و هەموو شۆڕشەکانی کورد و تووشی شکست و هەرەس هێنان بوونە.

١٣- بە هۆی سەرکوت کردنی خەڵکی راپەڕیوی کوردستان و روودانی کارەساتی کۆڕەوە ملیۆنییەکەی لە بەهاری ١٩٩١، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا پاسەوانیەتی نێودەوڵەتی بۆ کورد دامەزرا. ئەم پاسەوانییەتییە نێودەوڵەتییە، بە دەستتێوەردانی مرۆیەوە پشت ئەستوور بوو. بەمەش دوای ٨٠ ساڵ پشت تێ کردنی، فاکتەری نێو دەوڵەتی بە ئاراستەی پشتگیری کردنی دۆزی کورد گۆڕانکاری بە سەردا هات.

١٤- لە کۆتایی هێنانی شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رۆڵی کاریگەر و یەکلاکەرەوەی گێڕا. بە تایبەت لە ئیمزا کردنی رێکەوتن نامەی واشنتۆن (١٧ ئەیلولی ١٩٩٨) لە نێوان  بەرێزان مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی دا.

١٥- روخاندی رژێمی بەعس  پەیوەندی بەو تێڕوانین و بۆچوونەی ئەمەریکاوە هەبووە، کە پێی وا بوو ئەرکی دوای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و دارمانی بلۆکی کۆمۆنیستی بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بنەماکانی دیموکراسییەت لە جیهان و رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و بە سەروەری کردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری نێودەوڵەتی و لادانی سیستەمە دیکتاتۆرەکان. هەروەها بەرپاکردنی شەپۆلێکی بەرفراوان و ریفۆرم و چاکسازی لە رووی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسییەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. رووداوەکانی ١١ ی ئەیلولی ٢٠٠١ وای کرد کە ئەمەریکا ئەم پڕۆژەیە لە چوارچێوەی ستراتیژییەکی نوێدا بخاتە گەڕی. بۆیە روخاندنی رژێمی تاڵیبان لە ئەفغانیستان و دواتریش رژێمی بەعس لە عێراق دەستپێکی پراکتیزەکردنی ئەم ستراتیژییەتە نوێیە بوو کە ئەمریکا دەیویست لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پراکتیزەی بکات.

١٦-  تورکیا بە رێ نەدان بە سوپای ئەمەریکا بۆ کردنەوەی بەرەی باکووری لە ساڵی ٢٠٠٣ لە عێراق تووشی هەڵەیەکی گەورە بوو. بە هۆی ئەو سیاسەتەوە تورکیا نەیتوانی نەخشە و پیلانەکانی خۆی کە لە هەمبەر هەرێمی کوردستان دایڕشتبوو، بخاتە بواری پراکتیزە کردنەوە. لە بەرامبەردا کورد توانی جێگای تورکیا پڕ بکاتەوە. بەرەی باکووریش بە هاوکاری کورد و ئەمەریکا سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێنا.

١٧- گۆڕانكارییەكانی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ لە عێراق كاریگەری مەزنی هەبووە لە سەر كۆتایی هێنان بە دیاردەی دووی حكوومەتی و دوو ئیدارەیی، و هاتنە ئارای گۆتارێكی سیاسی یەكگرتوو لە نێوان سەركردایەتی سیاسی كورد لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە. هۆیەكیش ئەوە بوو، سەركردایەتی سیاسی كورد گەیشتە ئەو قەناعەتەی كە تەنیا بە یەكگرتووی و یەك هەڵوێستی دەتوانن بەرژەوەندییەكانی گەلی كورد لە عێراقی نوێدا بپارێزن. و ڕووبەڕووی ئەو هەڕەشە و مەترسیانە ببنەوە كە ڕووبەڕووی كورد دەبێتەوە.

١٨- قۆناغی یەكەمی پێك هێنانی حكوومەتی یەكگرتووی كوردستان لە ساڵی ١٩٩٢ دا، لەگەڵ قۆناغی دووەمی یەكگرتنەوەی هەر دوو ئیدارە و پێك هێنانی حكوومەتی یەكگرتوو زور لیك جیاواز بوون" قۆناغی یەكەم زاڵبوونی بەرژەوەندی تاكە حیزب بووە بە سەر بەرژەوەندی نەتەوەیی دا. كە دەرئەنجامەكەش شەڕی ناوخۆی لێ كەوتەوە. بەڵام قۆناغی دووەم ڕێك بە پێچەوانەوە قۆناغی پێشخستن و زاڵبوونی بەرژەوەندی نەتەوەیی بە سەر بەرژەوەندی تاكە حیزبیدا بووە. هەروەها گرتنە بەری شێوازی ئاشتیانە و دیالۆگ بۆ كۆتایی هێنان بە ناكۆكی و ململانێیەكان.

١٩- یەكگرتووی و یەك هەڵوێستی كورد لە دوای پرۆسەی ئازاد كردنی عێراق، كوردی كردە فاكتەر و توخمێكی بەهێز لە هاوكێشەی سیاسییەكانی عێراق و ناوچەكەدا. بووە هۆی دەركەوتنی سەنگ و قورسایی فاكتەری كورد. ئەمەش وای كرد لە سەر ئاستی عێراق بۆ یەكەمین جار لە مێژووی سیاسی عێراقدا، كوردێك پۆستی سەرۆك كۆماری وەربگرێ. لە سەر ئاستی كوردستانیش بۆ یەكەمین جار لە مێژووی سیاسی كورد دا، پەرلەمانی كوردستان سەرۆكێك بو هەرێمی كوردستان دەستنیشان كرد.

٢٠- لە دوای داڕمانی ڕژێمی بەعس، بۆ یەكەمین جار لە مێژووی سیاسی عێراقدا؛ كورد دەرفەتی بۆی ڕەخسا كە بەشداری لە پرۆسەی سیاسی عێراقدا بكەت. و لەم ڕووەوە لایەنی كوردی توانی ڕۆڵێكی بنەڕەتی لە داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی دا بگێڕێت. و بەشێكی گرنگی مافەكانی خۆی تێدا دەقنووس بكات.

٢١- بە پێی پرەنسیپییەكانی مافی چارەی خۆنووسین، هەمووگەل و نەتەوەیەك بێ جیاوازی قەبارەیی دانیشتووان و ڕەگەز و ئایین، مافی ئەوەی هەیە بە شێوەیەكی تەواو ئازادانە و سەربەخۆ دوور لە هەر جۆرە هەڕەشە و چاوسوور كردنەوەیەك؛ لە گوڕ بەرژەوەندییە



كانی خۆی بڕیاری چارەنووسی بدات. و پێگەی سیاسی خۆی لە سەر ئاستی ناوخۆیی و دەرەوەی وڵات دیاری بكات.

٢٢- بە گوێرەی بنەما و پرەنسیپەكانی مافی چارەی خۆی نووسین، گەلی كورد مافی ئەوەی هەیە بەو شێوەی كە لە یاسای نێو دەوڵەتیدا دانی پێ نراوە، بڕیاری چارەی خۆنووسین بدات. بە هەر دوو ڕووەكەیەوە؛ بەڵام دەستووری هەمیشەیی عێراق دانیپێدا نەناوە. هیچ میكانیزمێكیش لە دەستوور دا نییە؛ بۆ ئەوەی كورد هەر دوو ڕووی مافی چارەی خۆنووسین بە شێوەیەكی دیموكراسی دەستەبەر بكات.

٢٣- فیدراڵیزم ڕێكخستنێكی سیاسی، دەستوورییە. بە پێیگرێ بەستەكی ئارەزوومەندانە لە نێوان لایەنە پێك هێنەرەكانیدا دێتەكایەوە. شێوازەكە لە شێوازەكانی دابەشكردنی دەسەڵات لە نێوان حكوومەتی فیدراڵی و حكوومەتە هەرێمییەكان. لە وڵاتە فرەنەتەوە و پێكهاتەدا فاكتەرێكی گرنگە بۆ چارەسەری كێشەی نەتەوەیی و تایفی. هێنانە دی پێكەوە ژیانێكی ئاشتیانەیە لە نێوان پێكهاتەكاندا.

٢٤ - پیادەكردنی سیستەمی فیدراڵی بۆ قۆناغی ئەمڕۆی عێراق وكوردستان، چارەسەرێكی ڕیالیستی و پراگماتیانەیە. دەتوانرێ سنوورەك بۆ ململانێ و ناكۆكییەكانی ناوخۆی عێراق دابنێ. كێشەی دەسەڵاتیش چارەسەر بكات؛ بە مەرجێك ئەم فیدراڵییەت پشت ئەستوور بێت بە دیموكراسییەتی تەوافوقی و پرەنسیپی یەكێتی ئارەزوومەندانە.

## پێشنیازەکان

١- پێشنیاز دەکەین سەرکردایەتی سیاسی کورد بە شێوەیەکی زۆر هێمنانە و پراگماتیانە، هەڵسوکەوت لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکان بە تایبەت تورکیا بکات. هەوڵ بدات کارتی پەکەکە لە دەست تورکیا دەربهێنێ. کە بەو بیانووەوە دژایەتی مافەکانی گەلی کورد دەکات. پێویستە هەوڵ بدات قەناعەت بە پارتی کرێکارانی کوردستان بهێنێت، کە واز لە خەباتی چەکداری بهێنن و بە شێوەیەکی سیاسی درێژە بە خەبات بدەن.

٢- ئەگەر مادەی ١٤٠ لە ماوەی (شەش) مانگی تردا پراکتیزە نەکرا، و حکوومەتی عێراق بە بیانووی جۆراو جۆرەوە خۆی لەم کارە دزییەوە. پێشنیار دەکەین کە سەرکردایەتی سیاسی کورد هەوڵ بدات لە ڕێی بڕیاری ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك و دەڤەرەکانی تر هەوڵ بدات ئەم دەڤەرانە بگەڕێنێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

٣- کورد پێویستی بە دیالۆگی کراوە هەیە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ. بۆیە کورد دەبێ هەوڵ بدات دیالۆگی کوردی — عەرەبی، کوردی — تورکی، کوردی — فارسی گەڕی بدات. بەو ئاراستەیەی کە چارەسەری دۆزی کورد لە ڕێگەی دیالۆگ و دانوساندنەوە خزمەت بە هەموو لایەنێك دەکات. دەرفەتێکیش بۆ کورد دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی نەهێڵێ ئەو دەوڵەتانە لە دژی کورد یەك بگرن.

٤- دروستکردنی لۆبییەکی کوردی بەهێز و چالاك لە سەر ئاستی ئەمەریکا و ئەوروپا و ئەو دەوڵەتانەی کە لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا سەنگی خویان هەیە؛ بۆ ئەوەی بتوانن بەرژەوندییەکانی گەلی کورد بپارێزن.

٥- پێشنیاز دەکەین عێراق دابەش بکرێت بۆ سێ هەرێمی فیدراڵی، هەرێمی کوردستان و هەرێمی عەرەبی سوونە و هەرێمی عەرەبی شیعە. سنووری ئەم هەرێمانە لە سەر بنەمای نەتەوەیی و تایفی دیاری بکرێ. بەغداش وەك پایتەختی دەوڵەتی فیدراڵییەت بمینێ.

٦- پیادەکردنی دیموکراسییەتی تەوافقی لە پاڵ سیستەمی فیدراڵی دا؛ ئەم هەنگاوە، ڕۆڵێکی گرنگی دەگێڕێ لە هێنانە دی هاوسەنگی لە نێوان هەرێمەکاندا. ڕێ گری دەکات لەوەی نەتەوەیەك یاخود تایەفەیەك خۆی بە سەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێ.



٧- بە جینۆساید ناساندنی دۆزی ئەنفال لە ٢٤ تەمووزی ٢٠٠٧ لە لایەن دادگای عێراقەوە بایەخ و گرنگی یەکجار زۆری هەیە سەبارەت بە دۆزی کورد. لەبەر ئەمە پێویستە لە سەر حکوومەتی هەرێمی کوردستان بە پشتبەستن بەم بڕیارە، ئەم پرسە بە جیهانی بکرێ و کار بکریت بۆ ئەوەی سەر ئاستی نەتەوە یەکگرتووەکان و نێودەوڵەتی بە جینۆساید بناسرێ.

٨- لە سەر ئاستی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کورد هەوڵ بدات لە کەناڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندن ناودار و پڕ جەماوەری جیهان؛ بابەت و پرۆگرامی تایبەت لە سەر دۆزی کورد بوەشێنن. ئەمەش دەکرێ زیاتر ڕەوایی کێشەی کورد بە جیهان پیشان بدرێت. هەروەها پێویستە کورد هەوڵ بدات سەنتەرێکی باڵای ڕاگەیاندن و هۆشیاری کورد دابمەزرێنێت، کە پێك بێت لە چەندین دەزگای تایبەتی ڕاگەیاندن وەك کەناڵی ئاسمانی ڕۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ، دەزگای چاپ، و بڵاوکردنەوەی کوردی، ئینتەرنێت.

٩- هەلومەرجی ئێستای عێراق و هەرێمی و نێودەوڵەتی، وای دەخوازێ کورد هەوڵ بدات دەست پێشخەری بکات بۆ بەستنی کۆنفرانس لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی. هەوڵ بدات نوێنەری ڕێکخراوە جیهانییەکان و ئەندامانی وڵاتە زلهێزەکان تێیدا بەشدار بن بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتیانە بۆ دۆزی کورد لە سەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

١٠-بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ لایەنە دیموکرات خوازەکانی تورکیا. دامەزراندنی کەناڵی تەلەفیزیۆنی تورکی تا بتوانێ پەیامی ئاشتیخوازانەی کورد بە گەلی تورکیا بگەیەنێت.

١١-پشتگیری کردن لە بە ئەندام بوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا، چونکە بە ئەندام وەرگرتنی تورکیا، لەو یەکێتیەدا؛ تا ڕادەیەکی زۆر کوردەکانی تورکیا لە ژێر گوشاری نەتەوەپەرستەکانی تورکیا ڕزگار دەبێت. ڕێگە ئاسانتر دەبێ بە چارەسەری پرسی کورد. لە هەمانکاتیشدا سنوورەك دادەنرێت بۆ دەستتێوەردانی تورکیا لە هەرێمی کوردستان.

١٢-سەرکردایەتی سیاسی و حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێویستە هەموو تواناکانی خۆی بخاتەگەڕ بۆ بەهێزکردنی بنەمای ئابووری هەرێمی کوردستان و گەشەپێدان و بەرهەم هێنان و فراوان کردنی بواری بازرگانی کە خزمەت بە هەرێمی کوردستان دەکات.

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوە کوردی و بە کوردی کراوەکان:

#### أ) بەڵگەنامەکان:


١. ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان، **پرۆتۆکۆلەکان**، بەرگی یەکەم ، ١٩٩٢.

٢. ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستانی عێراق، **پرۆتۆکۆلەکان**، بەرگی پێنجەم ١٩٩٧.


#### ب) کتێبەکان:


٣. د.ئەلبیرت عیسی، **خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لەسەر بەعسی عێراق**، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، بە بێ ژمارەی چاپ، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٤. ئەمین قادر مینە، **ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێگۆچکەی بەعسیان، ترحیل، تەعریب، تەبعیس**، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی ١٩٩٩.

٥. ئورسولا مونخ و کرستین میرڤالد، **فیدراڵیزم و ئەزموونە جیاوازەکانی**، وەرگێڕان لە ئەڵمانییەوە، ئیسماعیل حەمە ئەمین، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٦. پیتر و. کابریت، **کۆتایی عێراق**، وەرگێڕ مامکاك، چاپی یەکەم، بەڵاوکراوەکانی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

٧. د. جاسم تۆفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد و یاسای نێودەوڵەتان، بەلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی،٢٠٠٢.

٨. د. جاسم تۆفیق خۆشناو، **دەخالەتی مرۆڤانە لە کوردستان**، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤.

٩. جەمال نەبەز، **کۆبەرهەم، زنجیرە و تارو توێژ لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندن**، ژمارە ( ١ ) سلێمانی، ٢٠٠٦.

١٠. جاناتان رندل، **بەم هەموو تاوانەوە لێبوردنی چی**، وەرگێڕان: سەلام دین ئاشتی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٦.

١١. جوهر نامق سالم، **کورد لە گەمەی دەقە یاساییەکاندا، وردبوونەوە لە دەستووری هەمیشەیی"العراق"**، چاپی یەکەم، بەڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر،٢٠٠٧.





١٢. جوهەر نامق سالم، **ئایا فیدراڵییەت وەك خیارەکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت ؟** چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولیر، ٢٠٠٥.

١٣. حسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم،، هەولێر، ٢٠٠١.

١٤. حسێن مەدەنی، **کوردستان و ستراتیژییەتی دەوڵەتان**، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی روشنبیری، هەولیر، ٢٠٠١.

١٥. خەلیل عەبدوڵڵا، **تاڵەبانی لە لوتکەی دەسەلاتی عێراقدا**،مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی-ن ك)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی،٢٠٠٦.

١٦. دیڤید ماکدۆیل، مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ کوردی، ابوبکر خۆشناو، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی دووەم،٢٠٠٥.

١٧. دیلمان محمد، **فیدراڵیزم و ئۆتۆنۆمی، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکار**، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری ( ی ن ك ) سلێمانی، ژمارە ٢، ئایاری ٢٠٠٢.

١٨. رۆتهۆف و ئەوانی دیکە، **هەڵبژاردنەکانی کوردستانی عێراق، ١٩/مایسی ١٩٩٢، ئەزموونێکی دیموکراسیانە**، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی، صفوة رشید صدقی، ئەمەستردام، ئابی ١٩٩٢.

١٩. سامی شۆڕش، **بزاڤە رزگاری خوازی کورد، ئیدریس بارزانی نموونەیەك**، وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی، د: رزگار، چاپخانەی زانا، دهۆك، ٢٠٠٥.

٢٠. سەیوان کاکە رەش، **بەراورد لە نێوان رژێمە فیدراڵییەکاندا**، مەکتەبی بیر و هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٢١. شۆڕش حاجی، **تعریبی کەرکوك، سیاسەتی تەعریب لە دوتوی هەشتا بەڵگەدا**، وەزارەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٢. گراهام فۆللەر، **ئاراستەی نوێی رۆژهەلاتیانەی تورکیا: لە گراهام فۆللەر و ئەوانی تر، جیۆپولیتیکی نوێ تورکیا، ئاسیای ناوەند، بەڵقان، کورد**، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداغی، چاپخانەی رۆن، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٢٣. د. گوینتەر دیشنەر، **کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدر لێکراو**، وەرگێر: حەمەکەریم عارف، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٩٩.

٢٤. عەتا قەرەداغی، **خەونی سەربەخۆیی لە واقعێکی ناجێگردا**، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٥. عومەر نوورەدینی، **سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد، کوردستانی عێراق وەك نموونە ( لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری سیاسییە )**، چاپخانەی: حاجی هاشم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٣.

٢٦. عومەر نورەدین، سەروەری دەوڵەت و پێوەندی بەدوزی کوردەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٧. غەفور مەخموری، **بەعەرەبکردنی کوردستان (بە عەرەبکردن و مەترسییەکانی — بەرەنگاربوونەوەی)**، چاپی یەکەم، چاپخانەی: دارا، هەولێر ٢٠٠٢.

٢٨. فرمان عبدالرحمن، **پاکتاوکردنی رەگەزی کورد لە کوردستانی عێراقدا لێکۆڵینەوەیەکی (جیوگرافی، سیاسی، مێژوویيە) لەسەر پرۆسیسەکانی بە عەرەبکردن و راگواستنی دانیشتووان**، لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٢٩. کۆمیسیۆنی بالاًی سەربخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراق، **راپۆرتێك بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران، سێ پرۆسەی هەڵبژاردنی مێژوویی لە ساڵێکدا**، وەرگێڕان: ساڵح ئەمین و ئەحمەد محمد ئیسماعیل، بەغدا، ئەیلولی ٢٠٠٦ .

٣٠. کرێس کۆچێرا، **بزوتنەوەی کورد و هیوای سەربەخۆی**، وەرگێڕان لە فارسییەوە، ئەکرەمی میهرداد، سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٣١. کرێس کۆچێرا، **کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا**، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، حەمە کەریم عارف، چاپخانەی شڤان، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٦.

٣٢. د. مارف عمر گوڵ، **جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتیدا**، چاپی سێیەم، لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) سلێمانی، ٢٠٠٦.

٣٣. د.مارف عومەر گول، **کێشەی کەسایەتی نێو نەتەوەیی گەلی کورد**، چاپی دووەم، لە بلاو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٣٤. محەممەد ئەمین زەکی بەگ،**خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان**، ئامادە کردن: رفیق ساڵح، بەرگی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٦.

٣٥. د. محمد نوردین، **تورکیا لەسەردەمی گۆڕاندا**، وەرگێڕان بو کوردی ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، دەزگی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٠.

٣٦. مراد حەکیم محمد، **ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسی راگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا**، لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٤.



٣٧. میدل ئیست ووچ / **جینۆساید لە عێراق، پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد**، وەرگێڕاوە: محمد حمد صالح توفیق، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٣٨. نادر ئینتسار، **ئیتنو نەتەوایەتی کوردی**، وەرگێڕان:، عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٤.

٣٩. ناسر حەفید و ئەوانی تر، **یاداشتنامەی شێخ محمودی حەفید**،چاپی یەکەم، چاپخانی شڤان، سلێمانی،٢٠٠٦.

٤٠. نەوشیروان **مصطفی** ئەمین، **حکوومەتی کوردستان ڕێبەندانی ( ١٣٢٤ سەرماوەری ١٣٢٥ ) کورد لە گەمەی سۆڤیەتیدا**،لە بلاو کراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٤١. واحد عەمر محی الدین، **دانوستاندنەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد و حکوومەتەکانی عێراق (١٩٢١ — ١٩٦١)، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، بە بێ ژمارەی چاپ، سلێمانی،٢٠٠٦.

**ج) نامەکانی زانکۆ:**

٤٢. ئاکۆ حەمە کەریم رەحیم، **ستراتیژی ولاًتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرنبەر رۆژهەلاًتی ناوەڕاست، لە دوای رووداوەکانی١١ی سێپتەبەرەوە(نموونەی عێراق)**، نامەیەکی ماستەری بلاونەکراوە،کولێژی یاسا و رامیاری، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ٢٠٠٨

٤٣. کامەران ئەحمەد محمد امین، **کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا (١٨٩٠ — ١٩٣٢)، توێژینەوەیەك لە مێژوی سیاسیی و ئابووری**، نامەی ماستەر بلاونەکراوەیە، کۆلیژی ئاداب — بەشی مێژوو، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩.

٤٤. هێرش عبداللە حمە کریم، **پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا. ١٩٩١ — ١٩٩٨**، نامەیەکی ماستەری بلاونەکراوە، کۆلێژی زانستە کۆمەلاًیەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٦ — ٢٠٠٧.

**د) وتار و باسەکان:**

**١. لە گۆڤارەکان:**

٤٥. د. ئازاد نەقشبەندی، **رێککەوتن نامەی سایکس بیکۆ و کورد**، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٧)، هەولێر، ئابی (١٩٩٨)، ل ل٤-٨.

٤٦. ئاسۆ کەریم، **مافی چارەی خۆنووسین، دەستوور و ریفراندۆم**، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە (٢ )، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ل ٦-٢٦.

٤٧. اندریە ریپتیل، **مافی دەستووری مێژوویی جوییبوونەوە**، وەرگێڕان: گوڤاری توێژینەوە، ژمارە (٧ )، هەولێر، حوزەیرانی ٢٠٠٧، ٢٠-٢٨.

٤٨. ئەحمەد عزیری، **فیدراڵیزم و سیستەمی فیدراڵی**، گوڤاری: نوڤین، ژمارە ( ١ ). گۆڤارێکی فیکری روناکبیرییە، مەکتەبی بیر و هۆشیاری ( ی.ن.ك ) دەری دەکات،سلێمانی، ساڵی یەکەم ئایاری ٢٠٠٤، ل ل٦٨-٦٩.

٤٩. ئەکرەم میهرداد، **رەوشی جیهانی و پرسی کورد**، گوڤاری توێژینەوە، ژمارە (٥)، هەولێر، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، ل ل ١٢٩-١٥٦.

٥٠. بریندر ئولیری، **فیدراڵییەتی فرە نەتەوەیی، فیدرەسی و دەسەڵاتی هاوبەش و کوردی عێراق**، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە ( ٣ )، ساڵی یەکەم، هەولێر، ئابی ٢٠٠٥، ل ل١١٧-١٣٨.

٥١. د. جاسم تۆفیق، **جینۆسایدی کورد، مەسەلەیەکی ناوخۆیی نییە**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ژمارە (٣) تشرینی یەکەم سلێمانی، ١٩٩٢، ل ل ٥-٢٠.

٥٢. خاتو داون برانکاتی، **ئایا فیدراڵی دەتوانێت جێگیری لە عێراق بە دی بهێنێت**، وەرگێڕان بارزان وەهاب، گۆڤاری نۆڤین، ژمارە ( ١ )، ) سلێمانی، ساڵی یەکەم، ئایاری ٢٠٠٤، ل ل ١٥٩-١٧٤.

٥٣. د. خلیل اسماعیل محمد، **گۆڕینی سنووری ئیداری پارێزگای کەرکوك**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ژمارە (١) ساڵی شەشەم، سلێمانی، شوباتی ١٩٩٨.

٥٤. رەمەزان داودی، **هەڵوێستی کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق**، سەنتەری برایەتی (گۆڤار ژمارە ٩ کانوونی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨، ل ل٣٧-٤٢.

٥٥. رێکەوت اسماعیل ابراهیم، **بۆچی ئەمەریکا لە بارودۆخی عێراق نیگەرانە**، گۆڤاری نۆڤین وەرزانەیەکی فیکری و روناکبیریە، کەکتەبی ( ی ن ك ) دەری دەکات، ژمارە (١٠)، سلێمانی، نیسانی ٢٠٠٧، ل ل١٥٠-١٦٢.

٥٦. زریان رۆژهەڵاتی، **سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان، (١٩٩١– ٢٠٠٦ )**، لە دۆسێی تورکیا (( گۆڤار)) سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیژی، ژمارە ٥، سلێمانی، ئاداری ٢٠٠٧، ل ل ٩-٣٤.



٥٧. زریان رۆژهەڵاتی، **رۆڵی فاکتەری وزە لە پەرەپێدانی، پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و هەرێمی کوردستاندا**، لەدوسیی تورکیا (گوڤار)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، سلێمانی ژمارە(٦)، ئابی ٢٠٠٧،ل ل ١٥-٣٦.

٥٨. سەبوور هەورامی، **پێکەوە لکاندنی عێراق و راستکردنەوەی هەڵەکان**، رێبازی نوێ، گۆڤارێکی فیکری، سیاسی، رووناکبیرییە، ژمارە (٤٠ )، مەکتەبی رێکخستنی ( ی.ن.ك )، دەری دەکات، حوزەیرانی ٢٠٠٦، ل ل ٦١-٦٩.

٥٩. **چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ ئیسماعیل بێشکچی**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی دۆسیی تورکیا، ژمارە (١)،سلیمانی، مایسی ٢٠٠٥، ل ل ٩١-١٢٩.

٦٠. **چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ ئیسماعیل بێشکچی**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (٢)، سلێمانی، سالی سیانزدەهەم، مایسی ٢٠٠٥، ل ل ١٧٠-٢٠٨.

٦١. فازل کەریم ئەحمەد، **چەمکی فیدرالیزم**، گۆڤاری نوڤین، ژمارە ١،، گۆڤارێکی فیکری روناکبیرییە، مەکتەبی بیر و هۆشیاری ( ی.ن.ك ) دەری دەکات، ژمارە ( ١ )، ساڵی یەکەم، سلێمانی، ئایاری ٢٠٠٤، ل ل٢٠٣-٢٠٧.

٦٢. فەرهاد عەونی، **ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دووبارە شۆڕشی ئەیلول هەڵبسەنگێنینەوە**، سەنتەری برایەتی، ژمارە( ١) هەولێر، ساڵی یەکەم، ئابی ١٩٩٧، ٢٤ل ل-٢٥.

٦٣. فیلیپس دیڤید، **دەسەڵات دابەش کردن لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا**، گۆڤاری توێژینەوە، ژمارە ( ٣ )، ساڵی یەکەم، هەولێر، ئابی ٢٠٠٥،ل ل١٣٩-١٨٢.

٦٤. د. کاظم حبیب، **مەینەتی کوردە فەیلییەکانی عێراق**، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٥) هەولێر، پاییزی ٢٠٠٢.

٦٥. د. کەمال مە زهەر ئەحمەد، **هەڵوێستی مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە مەسەلەی کورد لە عێراق**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٣)ـی ساڵی هەشتەم، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٠.

٦٦. د. مارف عومەر گوڵ، **بە جیهانی کردنی مەسەلەی کورد لە بەر رۆشنایی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا**، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ( ١٢ )، کانوونی دووەمی ١٩٩٥، ل ل ٧-٣٠.

٦٧. د.مارف عومەر گوڵ، **مەسەلەی کورد لە رێککەوتن نامە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە (٢)، ساڵی چواردەهەم، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٦ ل ل ٩٣-١٠٧.

٦٨. د.محمد هەماوەندی، **رەوایی راگەیاندنی فیدراڵیزم لە کوردستاندا**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، ژمارە (٢)، ساڵی یەکەم، سلێمانی تەمووز، ١٩٩٤،ل ل ١٠٥-١١٦.

٦٩. نەورەس رەشید، **کورد لە نێوان شارستانییەتی جەنگی سارد و شارستانییەتی جیهانگەرای دا**، گۆڤاری رۆشنبیری کوردستان، ژمارە ( ٦ )، هەولێر، تشرینی یەکەم،، ٢٠٠١، ل ل ٥-١٢.

٧٠. نشوان شکری عەبدوللا، **گیروگرفتی سنووری عێراق-تورکیا**، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی؛ ژمارە (٢)، ساڵی چواردەهەم، ئابی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ل٧ -٤٦.

**٢. لە رۆژنامە و هەفتەنامەکان:**

٧١. د. ئازاد عوسمان، **مادەی ١٤٢ و توانا هەڵکەوتییەکان بۆ هەموارکردنی دەستووری هەمیشەیی**، رۆژنامەی خەبات، ژمارە ( ٢٢٧٧ )، ٢٥/١٩/٢٠٠٦،ل ل٢-٢.

٧٢. ئەسرا چیتچی، **چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە ٦٢٢، ١٢/٢/٢٠٠٧، ل ل ٣٢ -٣٤.

٧٣. ئیلنۆر چەڤیگ، **کاتی ئەوە هاتووە تورکیا بەرامبەر کوردەکانی عێراق بە سیاسەتی خۆی دا بچێتەوە**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٤٠ ) هەولێر، ١٩/٦/٢٠٠٥، ل ل ٤٠-٤٠ .

٧٤. ئیلنۆر چەڤیگ، **ئایا تورکیا بە راستی تێدەگات عێراق بەرەو کوێ دەچێت**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ٥٦٠ هەولێر، ٢٧/١١/٢٠٠٥، ل ل ٤٠-٤٠.

٧٥. بریندیر ئولیری، **سەپاندنی دەستوورێکی سەنتراڵیزم ئەزموونی کوردستان ژێر پێ دەنێت**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٤٧٤ )، ٤/٣/٢٠٠٤، ل ل ١٥-١٦.

٧٦. د. توماس ئەمبروسی، **دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە(٦٢٦)، ١٢/٣/٢٠٠٧ ، ل ل١٣-١٥.

٧٧. پیتەرو. کالبریت، **کوردستان بە فیعلی سەربەخۆیە، یەکەم جارە لە مێژوودا، بەخت بە رووی کورد پێدەکەنێت**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٤٦٦ )، ٨/١/٢٠٠٤، ل ل ١٢-١٢.

٧٨. پۆلین باکەر، **دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە ( ٦٥٦ )، ٢٢ تشرینی یەکەم٢٠٠٧، ١٢-١٤.

٧٩. د. جامیس ستونەر، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە (٦٦١)، ٢٦/١١/٢٠٠٧ .

٨٠. د. جانسون بیرگن، **دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە(٦٢٧)، ١٨/٣/ ٢٠٠٧ ، ل ل٢١ -٢٣.





٨١. جەوهەر نامق سالم، **لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق و مافەکانی خەڵکی کوردستان**، بەشی یەکەم، رۆژنامەی خەبات، ژمارە ( ٢٣١٦ )، ٦/١١/٢٠٠٦ ، ل ل ٦-٦.

٨٢. د. جوان حقی، دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە(٦٤٠)، ٢٥/٦/ ٢٠٠٧، ل ل ٤٣ -٤٤.

٨٣. د. خالد سالح، **سەردانێکی شایستە و قۆناغێکی نوێ**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٦٠ )، ٢/١٠/.٢٠٠٥، ل ل ٧-٧.

٨٤. د. خالد صالح، **رێکەوتن**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ٥٧٠، ١٩ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ ، ل ل ٤١-٤١.

٨٥. د. خالد صالح، **هاوبەشی لە کوردستان**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە(٥٧١)،١٦کانونی دووەم ٢٠٠٦ ، ل ل ٤١-٤١.

٨٦. د.خلیل اسماعیل محمد، **رێکەوتننامەی ١١ ی ئادار و دیاری کردنی نیشتیمانێك بۆ نەتەوەی کورد لە عێراقدا**، خەبات، ژمارە( ٢٤٣٤ )، بەرواری ١١-٣-٢٠٠٧ ، ل ل ١١ -١١.

٨٧. .چەنگیز شاندار، **بۆ ئێمەی تورك دژی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانین**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٥٢ )، هەولێر١/٩/٢٠٠٥.

٨٨. چەنگیز کاتمان، **چاوپێکەوتنی تایبەت لە گەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە ٦٢٥، ٥/٣/ ٢٠٠٧ ، ل ل ٣٨-٤١.

٨٩. د. فواد حسێن، **چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە ٥٧٠، ١٩/ کانونی دووەمی ٢٠٠٦، ل ل ٧-١٠.

٩٠. د. قوسنەنتین دانیوس، **چاوپێکەوتنی تایبەت لە گەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە ( ٦٢٦ )، ١٢ ی ئاداری ٢٠٠٧ ، ل ل ١٦-١٧.

٩١. د. کارول ئولێری، **دیدارێکی تایبەت لەگەڵ هەفتەنامەی گوڵان**، ژمارە (٦١٨)، ١٥/١/٢٠٠٧ ، ل ل٢٣-٢٦.

٩٢. د. کرمانج گۆندی، **سیاسەتی نوێ ئەمەریکا بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سەفەری فەرمی سەرۆکی کوردستان بۆ سەرای کۆشکی سپی**، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٦١ )، ١٠/١١/٢٠٠٥،ل ل ١٩-٢٢.

٩٣. د. مایکل گەنتەر، **کوردستان دراوسێی نوێی تورکیا**، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی، مەنفی ئەنوەر شوانی، هەفتەنامەی گوڵان، ژمارە ( ٥٣٦ )، هەولێر،١٢/٥/٢٠٠٥ ل ل ٣٦-٣٩.

